دابەشکردن و بنەمادانان لەسەر (القول المفید)

# شەرحی کتێبی تەوحید

نوسینی

**هيثم بن محمد سرحان**

مامۆستا لە پەیمانگای حەرەمی مزگەوتی پێغەمبەری خوا – لە پێشدا – و

سەرپەرشتیاری ماڵپەڕی (التأصيل العلمي)

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحَمدَ لله نَحمَدُه و نستعينهُ ونَستغفرُه، ونَعوذُ بالله من شُرور أنفسِنا ومن سيِّئاتِ أعمالنا مَن يَهدِه الله فلا مُضلَّ له، ومَن يُضلل فلا هادِيَ له، وأشهَد أنْ لا إله إلا الله وحدَه لا شَريك له، وأشهَد أنَّ محمَّدا عبدُه ورسولُه (ﷺ)، أمَّا بعد :

## چەند بنەمایەك كە پێویستە لە پێش خوێندنەوەی ئەم كتێبە بزانرێت

١. پێویستە لەسەر قوتابی زانست و زانیاری دەقی كتێبەكە لەبەر بكات پێش خوێندن و دیراسەت كردنی.

(هەروەكو وتراوە : ((احفظ فكلُّ حافظٍ إمامٌ)) . واتە : لەبەربكە چونكە هەموو لەبەركەرێك (حافز)ێك پێشەوایە).

٢. زانینی هۆی كردنە بەڵگەی هەر ئایەتێك و هۆی هێنانەوەی لە بەشەكەدا .

٣. زانینی پەیوەندی هەر بەشێك لە بەشەكان بە كتێبی تەوحیدەوە و هۆكاری هێنانەوەی تیایدا، بۆ ئەوەی كتێبەكە هەموو پەیوەست بێت بە یەكەوە .

٤. تەنها پشت بە یەك راڤە دەبەستین، وە كۆڵەكەی راڤەكەش لای ئێمە كتێبی (القول المفید)ـە لە نوسینی شەیخ (ابن عثیمین) –رەحمەتی خوای لێ بێت–، جا ئەگەر ئەم شەرحەمان تەواو كرد ئەوا دەست بە شەرحێكی تر دەكەین (إن شاء الله) ئا بەم شێوەیە، بۆ ئەوەی زانیارییەكان تێكەڵ بە یەكتر نەبن .

## بۆ ئەم کتێبە دەخوێنین ؟

١. چـونکە زانـا لـە خـواترس و رەببانییـەکان ئامۆژگاریـان بـە خوێندنـەوەی کردووە.
٢. چونکە یەکێکە لە باشترین ئەو کتێبانەی لەم بابەتەدا نوسرابێت .
٣. چونکە نوسەرەکەی زۆر بە جوانی توانیویـەتی وەڵامـی گومـان و حوججـەی نەیارانی بداتەوە بە بەڵگەوە .
٤. چونکە خوای گەورە ئەم کتێبەی لـە سـەر زەویـدا خۆشەویسـت و وەرگـیراو کردووە .
٥. چونکە زانایان ئامۆژگارییان کردووە بە لەبەرکردن و تێگەیشتن لێی .
٦. دابەشکردن و ڕێزبەندی بابەتەکان بە جوانی دارێژراوە.
٧. زانایان بایەخیان داوە بە خوێندنەوەی و راڤەکردنێکی زۆری لەسەر کراوە .
٨. چونکە کتێبەکە پاڵپشت کراوە بە بەڵگەکان لە قورئان وسوننەتەوە .
٩. دەستەواژەکانی سووک و ئاسانن.
١٠. چونکە نوسـەرەکەی شـایەتی زانسـت و سـەلامەتی بیربـاوەڕی بـۆ دراوە لـە لایەن زانایانەوە.
١١. چـونکە کتێبەکـە بایـەخێکی زۆری بـە تەوحیـدی پەرسـتن داوە چـونکە خەڵـەلێکی زۆر لـەو بابەتـەدا هەیـە، لـە گـەڵ باسـکردنی تەوحیـدی پەروەردگارێتی و تەوحیدی ناو و صیفاتەکان .
١٢. چونکە نوسەر لەم کتێبەدا لە سەر ڕێگای پێشینە چاکەکان ڕۆیشتووە، بۆیە هـیچ قسـەیەکی خـۆی بـاس نـەکردووە، هـەر وەکـو ئیمـامی بوخـاری – رەحمەتی خوای لێ بێت– کە لە (صحيح)ەکەیدا کردوویەتی.

## پوختەی بەشەکانی کتێبی تەوحید ( ٦٧ بەشە ).

پێش دەست کردن بە خوێندنەوەی هەر کتێبێك پێویستە پێشەکی و پێرستەکەی بخوێندرێتەوە، بۆ زانینی ناوەرۆکی کتێبەکە و ڕێگا و شێوازی نوسینەکە و بتوانرێت بە شێوەیەکی گشتی تەماشای کتێبەکە بکرێت، وە دەتوانین ئەم کتێبە دابەش بکەینە (دە) بەشەوە :

## یەکەم : پێشەکی ( پێنج بەشە )

**١/ بەشی واجیب بوونی تەوحید**

(نوسەر خۆی ناونیشانی بۆ ئەم بەشە دانەناوە)

ئەم بەشەی باسکردووە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کەوا تەوحید یەکەم و پێویسترین پێویستییەکانە، چونکە بانگەوازی پێغەمبەران بووە .

**٢/ بەشی : فەزڵی تەوحید و کە هۆکاری سڕینەوەی تاوانەکانە .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە لەبەر هاندان و ڕوونکردنەوەی ئەوەی کەوا باسکردنی فەزڵی شتێك مانای ئەوە نییە ئەو شتە واجیب نییە، چونکە هەندێ کەس هەن خەڵکی دوور دەکەنەوە لە خوێندنەوەی تەوحید و بڵاوکردنەوەی .

**٣/ بەشی : هەر کەسێك تەوحیدی جێبەجێ کرد، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە .**

ئەم باسەی هێناوەتەوە تاوەکو تەوحید پاك و پاڵفتە بکاتەوە لە شیرك و بیدعە و سەرپێچی، بۆیە وا دەگونجێ ئەم بەشە لە پاش بەشی واجیب بوونی تەوحید و فەزڵەکەی باس بکات .

**٤/ بەشی ترسان لە شیرك**

ئەم باسەی هێناوەتەوە چونکە ئەو کەسەی دەیەوێت تەوحید جێبەجێ بکات ئەوا پێویستە ترسی شیرکی لە سەر خۆی و جگە لە خۆی هەبێت، چونکە ئەو گومانی وایە کە تەوحیدی جێبەجێ کردووە کەچی بە جێی نەهێناوە، وە هەموو بەشەکان لە پاش ئەم بەشە بەشێکن لە بەجێهێنانی تەوحید، بۆ نمونە بەشی ترسان لە شیرك لە جێ بە جێکردنی تەوحیدە.

**٥/ بەشی بانگەواز بۆ شایەتیدانی (لا إله إلا الله)**

**ئەم بەشەی هێناوەتەوە – والله اعلم– لەبەر دوو هۆ :**

١/ چونکە ئەو کەسەی تەوحید جێ بە جێ دەکات، ئەوا دەبێ بانگەوازی بۆ بکات، وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) و شوێنکەوتوانی.

٢/ بۆ وەڵامی ئەو کەسانەی کە دەڵێن : یەکەم شت بانگەوازی بۆ دەکرێت نوێژە.

**دووەم : تەفسیری تەوحید ( ٩ بەشە )**

**٦/ بەشی : تەفسیری تەوحید و شایەتیدانی (لا إله إلا الله)**

لەپاش ئەوەی باسی واجیب بوونی تەوحیدی بۆ کردین و تامەزرۆی بووین و باسی واجیب بوونی جێ بە جێ کردنی و ترسان لە دژەکەی و بانگەواز کردن بۆی بۆ کردین، وا دەگونجی باسی حەقیقەتی تەوحیدمان بۆ بکات، لە سەرەتای ئەم بەشەوە تاوەکو کۆتایی کتێبەکە ئەو باسەیە .

**٧/ بەشی : لەبەرکردنی ئەڵقە و دەزوو و نمونەی ئەوانە بۆ نەهێشتنی بەڵا یان دوورخستنەوەی جۆرێکە لە شیرك .**

ئەمە تەفسیری تەوحیدە بە ناسینەوەی دژەکەی.

**٨/ بەشی : ئەو بەڵگانەی لە سەر روقیە و تەمیمە هاتوون .**

ئەم باسەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی روقیەو تەمیمە شیرکییەکان کە لە گەڵ تەوحیددا جیاوازن .

**٩/ بەشی : ئەوانەی تەبەڕوك بە دار و بەرد و نمونەی ئەوانەوە دەکەن .**

ئەم باسەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی تەبەڕوکی قەدەغەکراو کە لە گەڵ تەوحیددا جیاوازە .

**١٠/ بەشی : ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی سەربڕینی ئاژەڵ بۆ جگە لە خوا .**

دەیەوێ تەفسیری ئەو سەربڕینە بکات کە لەبەر خۆشەویستی و بە مەزن زانین بۆ جگە لە خوا ئەنجام دەدرێت، ئەوەش جیاوازە لە گەڵ تەوحیددا و هەڵیدەوەشێنێتەوە .

**١١/ بەشی : لە جێگایەکدا ئاژەڵ بۆ خوا سەرنابڕێت بۆ جگە لە خوا سەربڕینی تێدا ئەنجام درابێت .**

دەیەوێت ئەوە روون بکاتەوە کە هەندێ لە نەفامەکان ئەنجامی دەدەن لە خۆچواندن و بەشداری کردنی موشریکەکان لە جەژن و جێگای پەرستنەکانیاندا، ئەمەش لە گەڵ تەوحیددا جیاوازە .

**١٢/ بەشی: نزرکردن بۆ جگە لە خوا لە شیرکە .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی ئەو نزرەی قەدەغەکراوەو لە گەڵ تەوحیددا جیاوازە .

**١٣/ بەشی : داواکردنی داڵدەدان لە جگە لە خوا بەشێکە لە شیرك .**

دەیەوێت تەفسیری داواکردنی داڵدەدان لە جگە لە خوا بکات (الاستعاذة)، لە شتێکدا کەوا هیچ کەسێك توانای لەسەر نییە تەنها خوا نەبێت ئەمەش لە گەڵ تەوحیددا جیاوازە.

**١٤/ بەشی : هاوارکردن و داواکردن لە جگە لە خوا جۆرێکە لە شیرك .**

دەیەوێت تەفسیری کردارە شیرکییەکان بکات لە پەناگرتن و داواکردن لە جگە لە خوا، لە شتێکدا کەوا هیچ کەسێك توانای لەسەر نییە تەنها خوا نەبێت، ئەمەش لە گەڵ تەوحیددا جیاواز و ناکۆکە .

## سێیەم : پوچەڵبوونی پەرستنی جگە لە خوای گەورە ( ٤ بەشە )

**١٥/ بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :** ﴿ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ نەفی کردنی هەر پەرستنێك بۆ جگە لە خوا ئەنجام دەدرێت، جا ئەگەر پێغەمبەر بێت یان بت یان جگە لەوانە.

**١٦ / بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :** ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ﴾ .

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بە مەبەستی پووچەڵبوونی پەرستنی ئەوانەی فریشتە بەڕێزەکان دەپەرستن .

**١٧ / بەشی شەفاعەت: ئەم بەشەی هێناوەتەوە بە مەبەستی پووچەڵکردنەوەی ئەوەی بێباوەڕان خۆیانیان پێوە پەیوەست کردووە بە داواکردنی شەفاعەت لە خواکانیان .**

**١٨/ بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :** ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴿٥٦﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بە مەبەستی پووچەڵکردنەوەی هیدایەتی تەوفیق بۆ جگە لە خوا.

## چوارەم : هۆکارەکانی کوفری نەوەی ئادەم ( ٤ بەشە )

لە پاش ئەوەی تەفسیری تەوحیدی کرد و پەرستنی بۆ جگە لە خوای پووچەڵکردەوە وا دەگونجێت باسی ئەو هۆکارانە بکات کە مرۆڤ پێی دەچێتە نێو کوفرەوە تاوەکو خۆی لێ دوور بکاتەوە .

**١٩/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون کەوا هۆکاری کوفری نەوەی ئادەم و وازهێنانیان لە دینەکەیان بریتییە لە زیادەڕەوی لە پیاوچاکاندا، ئەویش ترسناکترین هۆکارە بە هۆیەوە نەوەی ئادەم تووشی کوفر بوون، ئەوەش یەکەم جۆری شیرکە لەسەر زەویدا ڕوویداوە.**

**٢٠/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی بە گەورە زانینی تاوانی ئەو کەسەی خوای گەورە دەپەرستێ لای گۆڕی پیاوچاکێك، ئەی چۆنە ئەگەر خودی پیاوچاکەکە بپەرستێت ؟**

لە هۆکارەکانی کەوتنە ناو شیرکەوە ئەوەیە کە پەیکەر و وێنە و گۆڕستانەکان بکرێنە مزگەوت و جێ نوێژگە.

**٢١/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون کەوا زیادەڕەوی لە گۆڕی پیاوچاکاندا بەرەو ئەوە دەبیات بکرێنە بت و لە جگە لە خوا بپەرسترێن .**

لە هۆکارەکانی کوفر زیادەڕەوییە لە گۆڕی پیاوچاکاندا .

**٢٢/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی پاراستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ تەوحید و داخستنی هەموو ڕێگایەك خاوەنەکەی بەرەو شیرك ببات .**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو ئەو ڕێگایانەی داخستووە کە خاوەنەکەی بەرەو شیرك دەبات لە بیروباوەڕ و کردارەکان، لە پاشاندا باسی داخستنی دەرگای ئەو گفتارانە دەکەین کە خاوەنەکەی بەرەو شیرك دەبات لە لایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ) .

## پێنجەم : هەڵوەشاندنەوەی بەڵگەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن : شیرك لەم ئوممەتەدا یان لە دورگەی عەرەبدا روو نادات ( یەك بەشە ) .

٢٣ / بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون کەوا هەندێ لەم ئوممەتە بت دەپەرستن .

## شەشەم : کردارە شەیتانییەکان ( ٧ بەشە )

**٢٤/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی سیحر و جادوو هاتوون.**

چونکە سیحر هەرگیز نایەتەدی ئیللا لە ڕێگای کوفرکردن بە خوای گەورە نەبێت، ئەمەش گەورەترین درەگایە بۆ بانگەوازکردنی خەڵکی بۆ کوفر .

**٢٥/ بەشی ڕوونکردنەوەی هەندێك لە جۆرەکانی سیحر (جادوو) .**

ئەم باسەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی فێرمان بکات کەوا سیحر چەندین جۆرە، بۆیە پێویستە لە هەموو جۆرەکانی دوور بکەوینەوە .

**٢٦/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی کاهینەکان و نمونەی ئەوانە هاتوون.**

ئەم باسەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی حاڵی ئەوان روون بکاتەوە بۆمان و هەروەها حوکم و شێوازەکانی چوون بۆ لایان.

**٢٧/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی بەتاڵ کردنەوەی سیحر (نوشره) هاتوون .**

ئەم باسەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی گومانەکان نەهێڵێ، ئەویش بە باسکردنی ئەوەی دروستە و ئەوەی دروست نییە .

**٢٨/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی شوومی و ڕەشبینی (التطيُّر) هاتوون**

ئەم باسەی هێناوەتەوە بۆ نەفیکردنی ئەو باوەڕەی سەردەمی نەفامی لەسەری بوون دەربارەی ڕەشبینی .

**٢٩/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی ئەستێرەناسی (التنجيم) هاتوون**

ئەم باسەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی زانستی کاریگەری (التأثير) پووچەڵ بکاتەوە.

**٣٠/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی باوەڕبوون بەوەی کە ئەستێرەکان هۆکاری باران بن هاتوون**

ئەم باسەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی پەیوەست بوون بە هۆکارەکانی شیرکەوە پووچەڵ بکاتەوە .

## حەوتەم : کردارەکانی دڵ ( ٩ بەشە )

**٣١/ بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :**

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا ﴿١٦٥﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ نەفیکردنی تەوحید لەو کەسەی کەوا دروستکراوێکی بە ئەندازەی خوا یان زیاتر خۆش بوێت .

**٣٢ / بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :**

﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ ﴿١٧٥﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ نەفیکردنی تەوحید لەو کەسەی لە دروستکراوێك دەترسێت بە ئەندازەی خوا یان زیاتر.

**٣٣ / بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :**

﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ نەفیکردنی تەوحید لەو کەسەی پشت بە جگە لە خوا دەبەستێت.

### ٣٤/ بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :

﴿ أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ ﴿٩٩﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی کەسی یەکتاپەرست لە کاتی ڕۆیشتنی بۆ لای خوای گەورە ترس و ئومێد لە خۆیدا کۆ بکاتەوە .

### ٣٥/ بەشی : هەر لە باوەڕبوون بە خوای گەورە ئارامگرتنە لە سەر قەدەرەکانی خوای گەورە .

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی باسی حاڵی کەسی یەکتاپەرست بکات لە کاتی بەلا و موصیبەتدا .

### ٣٦/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی ڕووپاماییی هاتوون .

ئەم بەشەی هێناوەتەوە لەبەر گەورەیی ترسناکی ڕووپاماییی لەسەر کەسی یەکتاپەرست، وە دەبێت لە هەموو شتێك زیاتر لێی بترسین کەوا توشی پیاوچاکان بێت .

### ٣٧/ بەشی : یەکێك لە جۆرەکانی شیرك ئەوەیە مرۆڤ لە کردارەکانیدا مەبەستی دونیا بێت (شیرکی بچووك).

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کەوا هەر کەسێك دونیاویست بێت بە ئەنجامدانی کردەوەکانی دوارۆژ، ئەوا دەکەوێتە ناو شیرکەوە، وە بەوەدا دیارە کەوا تووڕە دەبێت و ڕازی دەبێت لەبەر دونیا .

### ٣٨/ بەشی ئەوەی هەرکەسێ گوێڕایەڵی زانایان و ئەمیرەکان بوو لە بە حەرام زانینی ئەوەی خوای گەورە حەڵاڵی کردووە و حەڵاڵ کردنی ئەوەی خوای گەورە حەرامی کردووە، ئەوا ئەوانی بە خوا داناوە ( شیرك لە گوێڕایەڵیدا).

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کەوا داوەری کردن بۆ لای جگە لە خوای گەورە تەوحید پووچەڵ دەکاتەوە.

٣٩ / بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت : ﴿ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ ﴿٦٠﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ یارمەتی دانی کەسی یەکتاپەرست لەسەر تێگەیشتن لە مانای کوفرکردن بە تاغوت و باسی ئیمانی کەسی راستگۆ و درۆزن .

## هەشتەم : تەوحیدی ناو و صیفاتەکان ( یەك بەشە )

٤٠/ بەشێك : هەرکەسێ نکۆڵی شتێك بکات لە ناو و صیفاتەکان

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی نەفی تەوحید لەو کەسانەی نکۆڵی شتێك لە ناو و صیفاتەکان بکات

## نۆیەم : ئەو قسەو گفتارە شیرکییانەی نەهیان لێکراوە ( ٢٦ بەشە )

٤١/ بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت : ﴿ يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا ﴿٨٣﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی ئەوەی پێویستە لەسەر کەسی یەکتاپەرست بەرانبەر بە نیعمەتەکان ئەنجامی بدات.

٤٢/ بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت : ﴿ فَلَا تَجْعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی حاڵی کەسی یەکتاپەرست لە کاتی سوێند خواردن بە خوا نەك بە جگە لە ئەو، وە جیاوازی نێوان پیتی (واو) و (ثم).

**٤٣/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون کەوا کەسێك قایل نەبوو بە سوێند خواردن بە خوای گەورە .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی باسی مەزنی خوای گەورە لە دڵی کەسی یەکتاپەرستدا لە کاتی سوێند خواردن پێی .

**٤٤/ بەشی وتنی : ئەوەی خوا و تۆ ویستتان لەسەر بوو .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی کەسی یەکتاپەرست ئاگادار بکاتەوە لە شەریك بریاردان لە مەشیئەتدا .

**٤٥/ بەشی هەرکەسێ جوێن بە رۆژگار (زەمانە) بدات ئەوا ئازاری خوای گەورەی داوە.**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی کەسی یەکتاپەرست ئاگادار بکاتەوە لەوەی جوێن بە شتێك بدات، ئەو کات جوێنی بەو کەسە داوە کە فەرمانی پێکردووە و رەخساندویەتی .

**٤٦/ بەشی ناونان بە قازی قازییەکان و هاوشێوەی ئەوانە .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی کەسی یەکتاپەرست ئاگادار بکاتەوە لە تەعەدا کردن لە لایەنی پەروەردگارێتیەوە.

**٤٧/ بەشی رێزگرتن لە ناوەکانی خوای گەورە و گۆڕینی ناوەکان لەو پێناوەدا .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی حاڵی کەسی یەکتاپەرست روون بکاتەوە لە بە ئەدەب بوون لە گەڵ خوای گەورە و ناو و صیفاتەکانی و دینەکەی و پێغەمبەرانی .

**٤٨/ بەشی ئەوەی هەرکەسێ گاڵتە بکات بە شتێك ناوی خوای تێدا بێت یان بە قورئان یان بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی نەفی ئەصڵ و بنەمای تەوحید لە کەسی گاڵتەجاردا، وە چۆنیەتی مامەڵە کردن لە گەڵیدا، وە واجیب بوونی پاراستنی زمان .

**٤٩/ بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :** ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِى ﴿٥٠﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی ئەوەی پێویستە کەسی یەکتاپەرست لە کاتی بوون و نەبوونی نیعمەتەکاندا بیکات.

**٥٠ / بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :** ﴿ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ﴿١٩٠﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی حاڵی کەسی یەکتاپەرست لە کاتی نەمانی نیعمەتەکان، وە حەرامبوونی هەموو ناوێك کە (عبد) ی پێوە بێت بۆ جگە لە خوا .

**٥١/ بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :** ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ﴿١٨٠﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ وریاکردنەوەی کەسی یەکتاپەرست لە ئیلحاد کردن (نکۆڵی کردن) لە ناو و صیفاتەکانی خوادا .

**٥٢/ بەشی : ناگوترێت : سڵاو لە خوای گەورە .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ وریاکردنەوەی کەسی یەکتاپەرست لەو گفتارانەی کە بێ ئەدەبی تێدا بە دی دەکرێت بەرانبەر بە خوای گەورە .

**٥٣/ بەشی وتنی : خودایە لێم خۆشبە ئەگەر ویستت لەسەرە (إن شاء الله).**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ وریاکردنەوەی کەسی یەکتاپەرست لە (استثناء) کردن لە کاتی دوعادا، وە هەست کردن بە توانا و دەسەڵاتی خوای گەورە .

**٥٤/ بەشی : ناڵێت : بەندەکەم و کەنیزەکەکەم .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ وریاکردنەوەی کەسی یەکتاپەرست لەسەر جوان بەکارهێنانی گفتار و وشەکان .

**٥٥/ بەشی : ئەو کەسەی بە ناوی خواوە داوا بکات نابێت رەد بکرێتەوە .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ وریاکردنەوەی کەسی یەکتاپەرست کەوا ئەگەر لەبەر خوا داوای شتێکی لێکرا وەڵامی بداتەوە لەبەر بە گەورە زانینی خوای گەورە .

**٥٦/ بەشی : بە رووی (روخساری) خوای پەروەردگار تەنها داوای بەهەشت دەکرێت نەك شتی تر**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە روونکردنەوەی حاڵی کەسی یەکتاپەرست لە بە گەورە زانینی خوادا، وە بە ئەدەب بوونێکی تەواو لە گەڵ خوادا .

**٥٧/ بەشی ئەوەی دەربارەی (ئەگەر – لو ) هاتووە**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی ئەدەبی کەسی یەکتاپەرست لەبەر کارهێنانی وشەی جوان و رێکدا، وە رووبەروو نەبێتەوە لە گەڵ شەرع و قەدەردا.

**٥٨/ بەشی نەهیکردن لە جوێندان بە (با)**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ رێنمویی کردنی کەسی یەکتاپەرست بۆ قسەیەکی باش و سوود بەخش، ئەگەر شتێکی بینی پێی ناخۆش بوو .

**٥٩/ بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :** ﴿ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ﴿١٥٤﴾ ﴾

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ وریاکردنەوەی کەسی یەکتاپەرست لە گومان خراپ بردن بە خوای گەورە هەروەکو گومانی نەفامی.

**٦٠/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی ئەو کەسانەی ئینکاری لە قەدەر دەکەن .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی حاڵی ئیمانی کەسی یەکتاپەرست بە قەزا و قەدەر .

**٦١/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی وێنەگران هاتوون .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ وریاکردنەوەی کەسی یەکتاپەرست لە مەترسی تەعەدا کردن لە لایەنی پەروەردگارێتی .

**٦٢/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی زۆر سوێند خواردن هاتوون.**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی کەسی یەکتاپەرست ئامۆژگاری بکات بە پاراستنی سوێندەکانی، وە بە مەزن زانینی خوای گەورە لە کاتی مامەڵە کردن لە گەڵ خەڵکیدا .

**٦٣/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی زیممەتی خوا.**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی کەسی یەکتاپەرست زیممەتی خوا و زیممەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە مەزن بزانێت لە کاتی فەرحانی و تەنگانەدا .

**٦٤/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی سوێند خواردن بە خوای گەورە بە ئەنجامدانی شتێك**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی کەسی یەکتاپەرست ئاگادار بکاتەوە لە تەعەداکردن لە لایەنی پەروەردگارێتی بە داخستنی دەرگای رەحمەتی خوای گەورە لە بەندەکانی .

**٦٥/ بەشی نابێت خوا بکرێتە شەفاعەتکار لای دروستکراوەکانی**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی کەسی یەکتاپەرست ئاگادار بکاتەوە لەوەی پلەی دروستکراو بەرزتر بکاتەوە لە پلەی خوای گەورە .

**٦٦/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون لە پاراستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ پاراستنی تەوحید و داخستنی رێگاکانی شیرك .**

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی کەسی یەکتاپەرست ئاگادار بکاتەوە لە دوور کەوتنەوە لەو وشە و گفتانەی سەردەکێشی بۆ شیرك .

**دەیەم : کۆتایی ( یەك بەشە )**

**٦٧/ بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت:** ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ ۝٩١﴾



ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی روونی بکاتەوە بۆ کەسی یەکتاپەرست کەوا موشریکەکان ئەوانەی خوایان بە تاك دانەناوە ئەوا رێزیان لە خوای گەورە نەگرتووە بە رێزێك شایستەی زاتی پیرۆزی ئەو بێت، بۆیە –ئەی کەسی یەکتاپەرست– وریای رێگاکەیان بە.

## یەکەم : پێشەکی ( ٥ بەشە ) بەشی تەوحید

### بۆ پێشەکی بۆ ئەم بەشە دانەناوە ؟

١/ لە هەندێ لە نوسخەکاندا نییە، وە لە هەندێ نوسخەدا (بسم الله) و (الحمد لله) و (صەلاواتدان) هاتووە.

٢/ نوسەر بە ناونیشانەکە کیفایەتی کردووە، چونکە ئەوە ناونیشانی بابەتی کتێبەکەیە کە ئەویش تەوحیدە.

٣/ وەکو شوێنکەوتنێکی ئیمامی بوخاری چونکە ئەو پێشەکی بۆ کتێبەکەی دانەناوە، وە دەیەوێ خەڵکی پەیوەست بکاتە قورئان و سوننەتەوە .

٤/ پێنج بەشەکەی سەرەتا لە جێی پێشەکییە .

### پێناسەی تەوحید

**لە زمانەوانیدا :** لە وشەی (وحَّد) وە هاتووە، چاوگی وشەی (وحَّد يوحِّد)ە، واتە : شتەکەی کرد بە یەك دانە .

**لە شەرعدا :** بە تاکدانانی خوای گەورە بەوەی کە تایبەتە بە خۆیەوە لە پەروەردگارێتی و خوداوەندێتی و ناو و صیفاتەکان .

**سێ بەشەکەی پەکتاپەرستی**

**تەوحیدی پەروەردگارێتی (الربوبية) :**
بە تاکدانانی خوای گەورە لە دروستکردن وموڵك و **بەڕێوەبردندا** **یان :** بە تاکدانانی خوای گەورە بە کردەوەکانی .

**تەوحیدی خوداوەندێتی (الألوهية) (پەرستن) :**
بە تاکدانانی خوای گەورە لە پەرستندا یان : بە کرداری بەندەکان .

**تەوحیدی ناو و صیفاتەکان (الأسماء والصفات) :**
بە تاکدانانی خوای گەورە بەو ناوانەی کە ناوی خۆی ناوەو وەصفی خۆی کردووە لە کیتابەکەیدا یان لە سەر زاری پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، ئەویش بە سەلماندنی ئەوەی خۆی بۆ خۆی سەلماندویەتی و نەفی کردنی ئەوەی خۆی نەفی کردووە لە خۆی، بە بێ هیچ لادانێك (تحریف) یێك وهیچ لەکارخستنێك (تعطیل) و چۆنیەتییەك (تکییف) و لێکچواندنێك (تمثیل)یێك .

کردەوەکان وەرناگیرێن ئیللا بە تەوحیدەوە نەبێت، ئێمە بۆ تەوحید دروست کراوین و بەهەشت هیچ کەسێکی تێ ناچێت ئیللا کەسی یەکتاپەرست نەبێت، ئەوەش بانگەوازی پێغەمبەرانە، وە جێ بە جێکردنی ئەو کارە رێگرە لە کەوتنە ناو شیرکەوە، هەر ئەویش هۆکارە بۆ زۆربوونی چاکە و حەسەنات .

**پەرستن بۆ دوو مانا بە کار دەهێنرێت :**

**بە نیسبەت بکەرەوە:** بە مانای زەلیلی نواندن بۆ خوای گەورە، بە ئەنجامدانی ئەوەی فەرمانی پێکردووە و دوورکەوتنەوە لەوەی نەهی لێکردووە لەبەر خۆشەویستی و بە مەزنزانین .

**بە نیسبەت کارەکەوە :** ماناکەی ئەوەیە هەروەکو (شیخ الاسلام ابن تیمیة) فەرموویەتی: (ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەوەی خوای گەورە خۆشی دەوێت و پێی رازییە لە کردەوەو گفتارەکان، ئاشکرا و پەنهانەکان ) .

**( ١ ) بەشی واجیب بوونی تەوحید**

نوسەر بۆ ئەم بەشە ناونیشانی دانەناوە بۆ ئەوەی خەڵکی بە کتێب و سوننەتەوە پەیوەست بکات، وە ئەو بەڵگانەش باسی کردووە بەڵگەیە لەسەر واجیب بوونی تەوحید، وە دوتوانین ناوی لێ بنێین : بەشی واجیب بوونی تەوحید .

**بەڵگەی یەکەم :**

ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾

(لِيَعْبُدُونِ ) : وە مانای یعبدون : یوحّدون، بە تەنها بمپەرستن، یان زەلیلی بنوێنن بەرانبەر بە من بە ئەنجامدانی فەرمانەکان و وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان، ( هەموو (عبادة) تێك لە قورئاندا مانای تەوحیدە) . ئەمەش قسەی (ابن عباس) ە –ڕەزای خوای لێ بێت.

مانای ئایەتەکە : من جنۆکە و مرۆڤم بۆ هیچ مەبەستێ دروست نەکردووە تەنها بۆ خوا پەرستی نەبێت .

## بەڵگەی دووەم :

ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ۝٣٦ ﴾

- ئەم ئایەتە سێ شێوازی دووپاتکردنەوەی تیادا بەکار هێنراوە : سوێند خواردنە تەقدیر کراوەکە، وە پیتی (لام)، وە (قد).
- ئایەتەکە بەڵگەی کۆدەنگی پێغەمبەرانی تێدایە لەسەر بانگەواز بۆ تەوحید، وە خوای گەورە ئەوانی تەنها لەو پێناوەدا رەوانە کردووە .

## ئوممەت لە قورئاندا بۆ چوار مانا بە کارهێنراوە:

| | |
|---|---|
| ١. تاقم و گرووپ : | وەکو ئەوەی لەو ئایەتەی پێشوودا هاتووە . |
| ٢. پێشەوا ( ئیمام ): | ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا ﴾ |
| ٣. میللەت : | ﴿ بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ ﴾ |
| ٤. زەمەن و کات (سەردەم) : | ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ ﴾ |

- (وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ) : واتە : لێی دوور بکەونەوە بەوەی خۆتان لە لایەك بن و ئەویش لە لایەکی تر .
- وە کۆکەرەوەترین پێناسە دەربارەی (الطاغوت) هاتبێت ئەوەیە کە (ابن القیم) فەرموویەتی : (تاغوت : هەرچی شتێك بەندە لە سنووری خۆی پێی دەرچێت لە پەرستراو (معبود) وشوێنکەوتەکراو (چاولێکراو) —متبوع— و گوێڕایەڵکراو (مطاع) ) مەبەستی ئەوەیە خۆی پێی رازی بێت .

١. جا شوێنکەوتەکراو (چاولێکراو) : وەکو کاهینەکان و جادووبازەکان و زانایانی خراپەکاری .
٢. وە پەرستراو : وەکو بتەکان .
٣. وە گوێڕایەڵکراو : وەکو ئەو دەسەڵاتدارانەی کە لە گوێڕایەڵی خوا دەرچوون.

- وە دەلالەتی ئایەتەکە لە سەر تەوحید ئەوەیە کەوا بتەکان بەشێکن لە تاغوتەکان، کە لە جگە لە خوا دەپەرسترێن .
- **تەوحید جێبەجێ نابێت ئیللا بە دوو روکن نەبێت ئەوانیش نەفیکردن و سەلماندنە :**

وە تەنها نەفیکردن یەکتاپەرستی تەواو نییە، چونکە ئەوە لەکارخستنێکی تەواوە، وە تەنها سەلماندن تەوحیدی تەواو نییە، چونکە هیچ ڕێگری نییە لە هاوبەشدانان، دەڵێین: (زيد قائم) دەلالەت دەکات لەسەر سەلماندنی هەستان بۆ (زید)، بەڵام دەلالەت ناکات لە سەر ئەوەی تەنها خۆی هەستاوە (ڕەنگە کەسی تریش هەستابێت)، وە (لم يقم أحد) ئەمە نەفیکردنێکی تەواوە، بەڵام (لم يقم إلا زيد) ئەمە دەلالەت دەکات لەسەر ئەوەی تەنها (زید) هەستاوە، چونکە نەفیکردن و سەلماندنی تێدایە .

**وە حیکمەت لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران :**



**بەڵگەی سێیەم :**

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ إِمَّا يَبۡلُغَنَّ عِندَكَ ٱلۡكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوۡ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفّٖ وَلَا تَنۡهَرۡهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوۡلٗا كَرِيمٗا ٢٣ ﴾

(أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ) : ئەمە ئەو تەوحیدەیە کە باسمان کرد چونکە نەفی و سەلماندن لە خۆ دەگرێت .

**قەزای خوای گەورە دابەش دەبێت دوو بەشەوە :**

**قەزایەکی شەرعی :**

تەنها لەوەدا دەبێت کە خوای گەورە پێی خۆشە.

رەنگە روو بدات و رەنگە روو نەدات، خوای گەورە دەفەرموێت : (وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ)

جا مانای (قضى) لێرەدا ئەوەیە: وەکو شەرع دایرێژاوە وەصێتی پێ کردووە .

**قەزایەکی کەونی :**

لەوەدا دەبێت کە خوای گەورە پێی خۆشە و ئەوەی پێی ناخۆشە .

دەبێت روو بدات، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَقَضَيۡنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ لَتُفۡسِدُنَّ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٤ ﴾

فەساد (خراپەکاری) : خوای گەورە لە شەرعدا داینەرێژاوە و پێی خۆش نییە .

## خوای گەورە چۆن قەزای شتێك دەكات و پێی خۆش نییە ؟

شتێك خۆشەویست بێت لای جگە لە خۆی ڕەنگە لە خودی خۆیدا نەویستراو بێت،بەڵام خۆشەویست دەبێت لەبەر ئەو حیكمەت و بەرژەوەندیەی تێیدایە، جا ئەو كاتە لە ڕوویەكەوە خۆشەویست دەبێت و لە ڕوویەكی ترەوە نەویستراو دەبێت .

بۆ نمونە : فەساد و خراپەكاری لە لایەن بەنی ئیسرائیلەوە لە خودی خۆیدا نەویستراوە لای خوای گەورە، چونكە خوای گەورە خراپەكاری و خراپەكارانی خۆش ناوێت، بەڵام لەبەر چەند حیكمەتێك تێیدایە ئەوا لە ڕوویەكی ترەوە خۆشەویست دەبێت لای خوای گەورە، هەر لەوانە گرانی و وشكەساڵی و نەخۆشی و هەژاری .

## ئەوەی خۆشەویستە دابەش دەبێتە دوو بەشەوە :

**خۆشەویستێك بە هۆی خودی خۆیەوە :**

كە ئەویش خوای گەورەیە .

**خۆشەویستێك بە هۆی جگە لە خۆیەوە :**

وەكو دەواو چارەسەر خۆشەویستە چونكە شیفا و چارەسەری تێدایە .

**بەندایەتی دابەش دەبێتە سێ بەشەوە :**

**بەندایەتییەکی گشتی :**
(وە پێی دەڵێن :
**بەندایەتی (زاڵبوون) )**
**ئەمەش بەندایەتی**
پەروەردگارێتییە، ئەمەش بۆ هەموو دروستکراوەکانە، خوای گەورە دەفەرموێت:
﴿ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ٩٣ ﴾
واتە : بەراستی هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەویدایە سەرجەم هەموو بە بەندێتی و خولامەتی دێنە لای پەروەردگاری بەخشەرو و ملکەچی دەبن) . وە بێباوەڕانیش دەگرێتەوە .

**بەندایەتییەکی تایبەت :**
(بەندایەتی گوێڕایەڵی گشتییە) خوای گەورە دەفەرموێت :
﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا ٦٣ ﴾ واتە : بەندە راستەکانی خوای بە بەزەیی ئەوانەن کە زۆر بەسەلاریی و نەرمیی و لەسەرخۆو بێ دەعیەو فیز بەسەر زەوییدا دەڕۆنە رێوە) .
ئەمەش گشتییە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کەوا خوای گەورە دەپەرستن بە پێی شەرعەکەی .

**بەندایەتییەکی تایبەتی تایبەت :**
ئەمەش بەندایەتی پێغەمبەرانە، ئەمەش تەواوترین پەرستنە، خوای گەورە دەفەرموێت :
﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ ١ ﴾ چونکە هیچ کەسێك هاوشانی ئەو پێغەمبەرانە نابێت لە خوا پەرستیدا .

## بەڵگەی چوارەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ ﴿٣٦﴾ ﴾ ئایەتەکە .

(شَيۡـٔٗاۖ) : (نکرة) یە لە سیاقی نەهیدا هاتووە، کەواتە هەموو شتێك دەگرێتەوە، نە پێغەمبەرێك و نە فریشتەیەك و نە وەلی یەك، بەڵکو نە هیچ کارێك لە کاروباری دونیا، بۆیە دونیا مەکەرە هاوبەش لە گەڵ خوادا.

## بەڵگەی پێنجەم و شەشەم

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ ﴿١٥١﴾ ﴾

ئیبن مەسعود – ڕەزای خوای لێ بێت – دەفەرموێت : ((هەرکەسێ دەیەوێت تەماشای وەصیەتەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکات کە مۆرەکەی لە سەریەتی، ئەوا با ئەو ئایەتەی خوای گەورە بخوێنێتەوە کە دەفەرموێت : ﴿قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ ﴾ تاوەکو ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ ﴿١٥٣﴾ ﴾ ) ئایەتەکە .

سیرات دەدرێتە پاڵ :

١. خوای گەورە، چونکە کەسەکان دەگەیەنێتە لای ئەو، هەروەها چونکە خۆی دایرێژاوە بۆ بەندەکانی ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي ﴾ .

٢. ئەوانەی ئەو ڕێگایەیان گرتووەتەبەر، چونکە ئەوان گرتویانەتە بەر و تەنها ڕێگای ڕزگاربوونە و جگە لەو ڕێگایە جیاوازی و دووبەرەکییە ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾.

٣.

## ئەم ئایەتانە ( دە ) وەصیێت لە خۆ دەگرێت .

### ئایەتی یەکەم ( پێنج وەصیێت ) :

١. یەکتاپەرستی خوای گەورە .
٢. چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا .
٣. منداڵەکانمان نەکوژین .
٤. نزیکی خراپەکاری نەکەوینەوە.
٥. هیچ نەفسێك نەکوژین کە خوای گەورە کوشتنی حەرام کردووە ئیللا بە حەق نەبێت.

### ئایەتی دووەم ( چوار وەصیێت ) :

٦. نزیك سەروەت و سامانی هەتیو نەکەوینەوە ( ئەویش ئەو کەسەیە کە باوکی مردووە و هێشتا باڵغ نەبووە) ئیللا بە شێوەیەکی چاك و ڕەوا نەبێت .
٧. ئەگەر قسەیەکمان وت دەبێت دادگەرانە بێت .
٨. پێوانە و کێشانەمان با دادگەرانە بێت .
٩. بەرانبەر بە پەیمانەکانی خوا بە وەفا بین .

### ئایەتی سێیەم ( یەك وەصیێت ) :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَأَنَّ هَـٰذَا صِرَاطِي ﴾ لە فەرموودەیەکدا هاتووە(أنَّ رسول الله (ﷺ) خطَّ خطاً مستقيماً، فقال: (هذا سبيل الله) ثم خط خطوطاً عن يمينه وعن شماله، فقال (هذه سبل، على كل سبيل منها شيطان يدعو إليه" ثم قرأ الآية ). واتە : پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەتێکی ڕاستی بۆ کێشاین، فەرمووی : (ئەمە ڕێگا ڕاستەکەی خوایە)، ئەمجار چەند خەتێکی لای ڕاست و چەپییەوە کێشا و فەرمووی: (ئەمە ڕێچکەکانە و لە سەر هەر ڕێگایەك شەیتانێك هەیە و بانگەوازی بۆ دەکات، ئەمجار ئایەتەکەی خوێندەوە ).

## هەندێ سوودی گرنگ

**ئەو نەفسانەی خوای گەورە کوشتنی حەرام کردووە چوار دانەن :**

١. موسڵمان .

٢. زیمی ( ئەو کەسەیە کە لە وڵاتی موسڵماناندا نیشتەجێیە ).

٣. موعاهید ( لە نێوان ئێمە و ئەواندا پەیماننامە هەیە).

٤. موستەئمین ( ئەو کەسەیە کە ئەمان و دڵنیایی پێ دەدەین).

﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾ ریزق و رۆزی دایك و باوکی پێش خستووە چونکە دایك و باوکەکەش تووشی هەژاری دەبن، بەڵام لە سورەتی (ئیسرادا) دەفەرموێت :

﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ﴾ ریزق و رۆزی مندالآنی پێش خستووە بە سەر ریزق و رۆزی دایك و باوکدا چونکە دایك و باوك دەوڵەمەندن و دەچن منداڵەکانیان دەکوژن تاوەکو تووشی هەژاری نەیەن .

**﴿ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾ ئەوەی لە شەرعدا سەلمێنراوە :**

١. نەفسێك بەرانبەر بە نەفسێك.

٢. کەسێك ژنی هێنابێت (یان شووی کردبێت) و زینا بکات .

٣. ئەو کەسەی واز لە دینەکەی دەهێنێ و لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا دەبێتەوە .

**ئەو پێگەیشتنەی کەوا ئیتر تەکلیفی لەسەر دەبێت :**

١. پازدە ساڵ تەواو بکات .

٢. یان مووی دامێنی پەیدا بێت .

٣. یان دابەزینی (ئاو) .

وە بۆ ئافرەتان کەوتنە سووڕی مانگانەوە .

**وەصێت :** بە مانای پەیمان دێت، وە پەیمانیش نابێتە وەصێت ئیللا مەگەر لە کارێکی گرنگدا بێت .

**بۆ ئیبن مەسعود فەرموویەتی : ئەم ئایەتە وەصیێتەکەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، کەچی ئەو وەصیێتی پێ نەکردووە؟**

١. چونکە ئەوە وصیێتی خوای گەورەیە، ﴿ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ ﴾ وە پێغەمبەری خواش(ﷺ) لە ئەوەوە دینەکەی گەیاندووە .

٢. چونکە وا دەبینێ ئەم ئایەتانە هەموو دینی لە خۆ گرتووە، جا ئەوانەش چەند ئایەتێکی مەزنن .

**بەڵگەی حەوتەم :**

لە (معاذ بن جبل)ەوە هاتووە، دەفەرموێت : (كُنْتُ رِدْيفَ النَّبِيِّ (ﷺ)عَلَى حِمارٍ، فَقَالَ لِي: يَا مُعاذُ أَتَدْرِي ما حَقُّ اللهِ عَلَى العِبادِ؟ وَما حَقُّ الْعِبادِ عَلَى اللهِ ؟ )) قُلْتُ : اللهُ وَرَسُولُهُ (ﷺ) أَعْلَمُ، قَالَ: حَقُّ اللهِ عَلَى الْعِبادِ : أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَحَقُّ الْعِبادِ عَلَى اللهِ : أَنْ لا يُعَذِّبَ مَنْ لا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا )) فَقُلْتُ : يا رَسُولَ اللهِ (ﷺ): أَفَلا أُبَشِّرُ النَّاسَ ؟ قَالَ: لا تُبَشِّرْهُمْ فَيَتَّكِلُوا)) بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە.

واتە : لە پشتی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لەسەر گوێدرێژێك سواربوو بووم، پێی گوتم : ئەی (معاذ) ئایە دەزانی حەقی خوا لەسەر بەندەکان چییە؟ وە حەقی بەندەکان لەسەر خوا چییە ؟ وتم : خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) باشتر دەزانن، فەرمووی : حەقی خوای گەورە لەسەر بەندەکان ئەوەیە کە بە تەنها بیپەرستن و شەریکی بۆ بریار نەدەن، وە حەقی بەندەکان لەسەر خوا ئەوەیە : عەزابی ئەو کەسانە نەدات کە شەریکی بۆ بریار نادەن) وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایە موژدە بە خەڵکی بدەم ؟ فەرمووی : نەخێر موژدەیان پێ مەدە، چونکە سارد دەبنەوە).

- (أَتَدْرِي) : ئەم پرسیارە بۆ هاندان و تەشویقە، بۆ ئەوەی زیاتر دڵی لای بێت، ئەمەش لە شێوازی جوان پەروەردەکردنە .
- (حَقُّ الْعِبادِ عَلَى اللهِ) : بەندەکان هیچیان واجیب نەکردووە لەسەر خوا، بەڵکو خوای گەورە خۆی واجیبی کردووە لەسەر خۆی ئەوەش فەزڵێکە لە خۆیەوە .
- (أُبَشِّرُ) : موژدەدان : بریتییە لە هەواڵدانێك بەوەی بەرانبەری دڵی پێ خۆش بێت، وە ڕەنگە بۆ هەواڵێکی ناخۆش بە کار بهێنرێت .
- (لا تُبَشِّرْهُمْ) : واتە : هەواڵیان پێ مەدە .
- لە فەرموودەکەدا بەڵگەی فەزڵی تەوحیدی تێدایە، وە ئەو تەوحیدەش ڕێگرە لە عەزابی خوای گەورە .
- هەروەها بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەوا خوای گەورە عەزابی کەسێك نادات کەوا شەریکی بۆ خوای گەورە بڕیار نەدابێت، وە خوای گەورە لە سەرپێچییەکان خۆش دەوێت بە جێبەجێکردنی تەوحید، وە نەهی کرد لەوەی هەواڵیان پێ بدات، بۆ ئەوەی پشت بەم موژدەیە نەبەستن بە بێ ئەوەی ناوەڕۆکەکەی جێ بەجێ بکەن، چونکە جێبەجێکردنی تەوحید دوور کەوتنەوە لە سەرپێچیەکان لە خۆ دەگرێت، چونکە سەرپێچیەکان لە حەز و ئارەزووەوە سەرچاوە دەگرن، ئەمەش جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرك .

## چەند مەسەلەیەکی تێدایە :

(ئەم مەسەلانە بەشێك نین لە کتێبی تەوحید، نوسەر دایناوە وەکو راڤەیەك بۆ کتێبەکەی، ئەویش باشترین کەسە راڤەی بکات، چونکە ئەو زاناترە لە مەبەستەکەی، بۆیە پێویستە بایەخی پێ بدرێت ).

**یەکەم :** حیکمەت لە دروستکردنی مرۆڤ و جنۆکە : تەوحیدە نەك خواردن و هاوسەرگیری.

**دووەم :** پەرستن برتییە لە تەوحید، چونکە دژایەتی و ناکۆکی لەوەدایە ( واتە لە نێوان پێغەمبەری خوا(ﷺ) و قورەیشدا، جا هەر پەرستنێك لەسەر یەکتاپەرستی بنیات نەنرابێت ئەوا پوچەڵە).

**سێیەم :** هەرکەسێ لە خۆیدا جێ بەجێی نەکات ئەوا خوای گەورەی نەپرستووە، ئەمەش مانای ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت : ﴿ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴾.

**چوارەم :** حیکمەت لە ناردنی پێغەمبەران (پەرستنی خوای تاك و تەنها و دوور کەوتنەوە لە پەرستنی تاغوتە).

**پێنجەم :** پەیامەکە هەموو ئوممەتێکی گرتووتەوە (واتە هەموو تاقم و گروپێك) .

**شەشەم :** دینی پێغەمبەران یەکە ( ئەصڵ و بنەمای دین یەکە، بەڵام شەریعەتی کرداری ئەوا جیاوازە بە جیاوازی ئوممەتەکان و کاتەکان و شوێنەکان ) .

**حەوتەم :** مەسەلە گەورەکە ئەوەیە کەوا خواپەرستی جێ بە جێ نابێت و ڕوونادات ئیللا بە کوفرکردن بە تاغوت نەبێت، ئەمەش مانای ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت : ﴿ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ ﴾ ئایەتەکە ( وە بە یەکێك لە تاوانە گەورەکانی ژماردووە چونکە زۆرێك لە خەڵکی نایزانن، وە هەرکەسێك کارێك لەو کارانەی کرد ئەوا دروست نییە وشەی شیرك و کوفر و لەعنەتی بە ڕەهایی پێ بڵێین، چونکە حوکمدان بەسەر ئەو جۆرە شتانەدا هۆکار و ڕێگری هەیە) .

**هەشتەم :** تاغوت گشتییە، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە لە جگە لە خوا دەپەرسترێت .

**نۆیەم :** مەزنی و گەورەیی ئەو سێ ئایەتە موحکەمەی لە سورەتی (الأنعام) هاتووە لای سەلەف، کە (دە) مەسەلەی لە خۆ گرتووە یەکەمیان نەهی کردنە لە شیرك .

**دەیەم :** ئایەتە موحکەمەکانی سورەتی (الإسراء) کە هەژدە مەسەلەی لە خۆ گرتووە، بەو ئایەتە دەستی پێکرد کە دەفەرموێت : ﴿ لَّا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقۡعُدَ مَذۡمُومًا مَّخۡذُولًا ﴿٢٢﴾ ﴾ وە بە ئایەتی : ﴿ ...وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدۡحُورًا ﴿٣٩﴾ ﴾ کۆتایی پێ هێناوە، وە خوای گەورە ئاگاداری کردینەوە لە گەورەیی و مەزنی ئەم مەسەلانە لەو ئایەتەدا : ﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ ...﴿٣٩﴾ ﴾ .

**یازدەیەم :** ئایەتەکەی سورەتی (النساء) کە پێی دەڵێن ئایەتی : (دە مافەکە) خوای گەورە بە ئایەتی : ﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ ﴿٣٦﴾ ﴾ دەستی پێکردووە (چونکە گەورەترین ماف مافی خوای گەورەیە).

**دوازدەیەم :** ئاگاداربوون لە وەصیەتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتی مردنیدا (بەڵام لە راستیدا وەصیەتی پێی نەکردووە، بەڵکو ئاماژەی کردووە بەوەی ئەگەر ئێمە دەستمان بە قورئان و سوننەتەوە گرت ئەوا گومڕا نابین).

**سیازدەیەم :** زانینی حەقی خوای گەورە بە سەرمانەوە (بەوەی تەنها ئەو بپەرستیت و شەریکی بۆ بریار نەدەیت) .

**چواردەیەم :** زانینی حەقی بەندەکان بەسەر خواوە ئەگەر مافەکەیان دا (حەقێکە لە فەزڵی خۆیەوە پێی بەخشیوین )

**پازدەیەم :** ئەم مەسەلەیە زۆربەی هاوەڵان نایزانن ( (معاذ) ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە لە کاتی سەرەمەرگدا بۆ ئەوەی نەبێتە یەکێك لەوانەی زانست دەشارنەوە لە کاتێکدا زۆربەی هاوەڵان کۆچی دواییان کردبوو، لەوە دەترسا خەڵکی لە خواپەرستی سارد ببنەوەو پشت بەو فەرموودەیە ببەستن، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیویست بە رەهایی بیشارێتەوە چونکە ئەگەر ئەوەی بویستایە ئەوا بە (معاذ) و جگە لەوی نەدەگوت ).

**شازدەیەم:** دروستە زانست بشاردرێتەوە لە بەر بەرژەوەندی (ئەمەش بە رەهایی نییە) .

**حەڤدەیەم :** موژدەدان بە کەسی موسڵمان بە شتێك دڵی پێ خۆش بێت موستەحەببە ( ئەمەش لە باشترین سوود بە دەستهاتووەکانە) .

**هەژدەیەم :** ترسان لە پشت بەستن لەسەر فراوانی رەحمەتی خوای گەورە(الاتكال) ( هەروەها بێ ئومێدی).

**نۆزدەیەم :** وتنی دەستەواژەی : ( خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) باشتر دەزانن) بۆ ئەو کەسەی پرسیاری لێ دەکرێت و نایزانێت (ئەمە لە ژیانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)دەگوترێت و لە مەسەلە شەرعییەکان کە دەیزانێت) .

**بیستەم :** دروستی تایبەتکردنی هەندێ کەس بە زانست و شاردنەوەی لە هەندێکی تر.

**بیست و یەکەم :** بێ فیزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەوەی سواری گوێدرێژێك بووە و کەسێکیش لە پشتییەوە سوار بووە .

**بیست و دووەم :** دروستە کەسێك لە پشتی کەسێکی ترەوە سوار بێت لە سەر وڵاخێك (بە مەرجێك ئازار و نارەحەتی پێ نەگەیەنێت) .

**بیست و سێیەم :** گەورەیی و مەزنی ئەم مەسەلەیە .

**بیست و چوارەم :** فەزڵی (معاذ بن جبل) .

## ٢/ بەشی : فەزڵی تەوحید و هەر ئەویش هۆکاری سڕینەوەی تاوانەکانە

نوسەر ئەم بەشەی دارشتووە بۆ هاندان و تەشویق، بە جیاواز لە گەڵ ئەوەی شەیتان دەیخاتە دڵەکانەوە، وە لە کاتی سەلماندنی فەزڵی هەر شتێکدا ئەوە بەڵگە نییە کەوا ئەو شتە واجیب نییە، بەڵکو فەزڵەکەی لە دەرئەنجام و شوێنەوارەکەیەتی وەکو نوێژی جەماعەت .

### بەڵگەی یەکەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾

(وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ) : تێکەڵیان نەکردووە .

(بِظُلۡمٍ) : (الظلم) ستەم، لێرەدا بەرانبەر بە ئیمانە، کە ئەویش بریتییە لە شیرك .

(مُّهۡتَدُونَ) : ١/ لە دونیادا : بۆ شەرعەکەی خوای گەورە بە زانست و کردار، ٢/ لە دوارۆژدا : بۆ بەهەشت .

لە فەزڵەکانی تەوحید جێگیربوونی ئەمن و ئاسایشە لە دونیا و دوارۆژدا .

## بەڵگەی دووەم :

لە (عبادة بن الصامت)ەوە ریوایەت كراوەو دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((من شهد أن لا اله الا الله، وحده لا شريك له، وأن مُحَّداً (ﷺ) عبده و رسوله، وأن عيسى عبدالله ورسوله، وكلمته ألقاها الى مريم، وروح منه، والجنة حق، والنار حق، أدخله الله الجنة على ما كان من العمل ) (بوخاری و موسلیم ریوایەتیان كردووە). واتە : هەركەسێ شایەتی بدات كەوا هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، تەنهایە و هاوڵی نییە، و (محمد) (ﷺ) بەندە و نێردراوی ئەوەو (عیسا) بەندەو نێردراوی ئەوە، وشەیەكی پیرۆزی ئەو هەڵی داوە بۆ مریەم و بەخشییە ئەو و رۆحێكە لە لایەن خوداوە دروستكراوە، بەهەشت حەقەو دۆزەخ حەقە، ئەوا خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە ئەگەر لەسەر هەر كارێك بێت ).

## بەڵگەی سێیەم :

لە هەردوو كتێبی (صحیح)دا هاتووە لە فەرموودەی (عتبان) ەوە : ((فإنَّ اللّه حرَّمَ على النارِ من قال : لا إله الا الله، يَبتغي بذلك وَجه الله) واتە : خوای گەورە ئاگری حەرام كردووە لە سەر ئەو كەسەی بڵێت : (لا الـه الا الله )، مەبەستی لەو قسەدا تەنها خوای گەورە بێت)).

- (شهد) : شایەتیدان، دانپێدانان بە زمان و باوەڕبوون بە دڵ و بە راستخستنەوەی بە ئەندامەكان .
- (أن لا اله الا الله) : هیچ پەرستراوێك نییە –لە هەر روویەكەوە بێت– شایستەی پەرستن بێت تەنها خوا نەبێت .
- (وحده) : دووپاتكردنەوەیە، بە مەبەستی سەلماندن، (لا شريك له) دوپاتكردنەوەیەكە مەبەستی نەفیكردنە لە هەموو شتێكدا تایبەتە بە خۆی.

- ( وأن مُحَمَّداً(ﷺ)) : (بن عبدالله بن عبدالمطلب القرشي الهاشمي ) دوایین پێغەمبەرانە .
- (عبده) : واتە : ١/ هیچ هاوبەشییەکی لە گەڵ خوادا نییە . ٢/ لە هەموو دروستکراوەکان خواپەرسترە .
- (ورسوله) : واتە : نێردراوە بەوەی وەحی بۆ کراوە، بە ناوی خوای گەورەوە درۆی نەکردووە، وە جێ بە جێ کردنی ئەم شایەتییە پوچەڵ دەبێتەوە بە :

١. ئەنجامدانی سەرپێچییەکان .

٢. داهێنان لە دیندا بە شتێك لە دینەکەدا نەبێت .

سەرپێچییەکان بە مانای گشتی دەکرێت بە شیرك بیژمێرین، وە بە مانای تایبەتی دابەش دەبێتە ئەم بەشانەوە :

**١/شیرکی گەورە . ٢/ شیرکی بچووك . ٣/ تاوانی گەورە . ٤/ تاوانی بچووك**

- (عیسی عبدالله) : ئەمە وەلامێکە بۆ گاورەکان، (ورسوله) ئەمە وەلامێکە بۆ جوولەکەکان، ئێمە باوەڕمان بە پەیامەکەی هەیە وە ناچار نین بە شوێن کەوتنی ئەگەر شەریعەتەکەی لە گەڵ شەریعەتەکەی ئێمەدا ناکۆك و جیاواز بوو، وە شەریعەتەکانی پێش ئێمە چەند حاڵەتێکی هەیە :

١. لە گەڵ شەریعەتەکەی ئێمەدا جیاواز بێت، ئەوا ئێمە کار بە شەریعەتەکەی خۆمان دەکەین .

٢. لە گەڵ شەریعەتەکەی ئێمەدا کۆك بێت و جیاواز نەبێت، ئەوا ئێمە شوێنی شەریعەتەکەی خۆمان دەکەوین .

٣. شەریعەتەکەی ئێمە بێ دەنگ بووە دەربارەی، ئەوا شەرعە بۆ ئێمە .

- خەڵکی دەربارەی عیسا بوونەتە سێ بەشەوە، دوولا و ناوەندێك :

١. (جفاة) (کورت ڕەوەکان) : وەکو جولەکە، بە درۆیان خستەوە و تانەیان لە خۆی و دایکی دا و نکۆڵیان لە پێغەمبەرایەتی ئەو کردو حوکمیان بە کوشتنی دا .

٢. (غلاة) (زیادە رەوەکان) : وەکو گاورەکان، وتیان : ئەو کوڕی خوایەو سێیەم خوایە لە سیٚ خواکەو ئەویان بە خوا دانا .

٣. (الوسط) (نێوەند) : دەڵێن : شایەتی دەدەین کەوا ئەو بەندەی خوا و نێردراوی ئەوە، دایکیشی یەکێکە لە (صدیقەکان)، ئەویش دامێنی خۆی پاراست و عازەب بووە، وە نمونەی (عیسا) وەکو نمونەی ئادەمە، خوای گەورە لە گڵ دروستی کردووە و پێی فەرموو: ببە، ئەویش بوو .

- (کلمته) : چونکە ئەو بە وشەیەك دروست بوو، وە عیسا خودی خۆی وشەی خوا نییە، چونکە کەلام صیفەتی خوایە .
- (روح منه) : دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی خوا، وە داویەتییە پاڵ خۆی لەبەر رێز و تەشریف .
- (أدخله الله الجنة) : چوونە بەهەشت دوو بەشە :

١. چوونە ژوورەوەیەکی تەواو کە بە هیچ سزایەك پێش ناخرێت بۆ کەسێك کارەکەی تەواو بێت .

٢. چوونە ژوورەوەیەکی نوقصان بە سزا پێش دەخرێت بۆ کەسێك کارەکەی کەمو کورتی تێدا بووە .

- (قال : لا إله الا الله ) بە مەرجیٚ ئیخلاص و دڵسۆز بێت بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە : (یبتغي بذلك وجه الله)
- **لەم فەرموودەدا وەڵامی دوو گرووپ و تاقمی تێدایە :**

١. گرووپی (المرجئة) ئەوانەی کە دەڵێن : تەنها وتنی (لا اله الا الله) بەسە، بە بیٚ ئیخلاص و کردار.

٢. گرووپی (الخوارج) ئەوانەی کە دەڵێن : ئەوەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدات کافرە و تا هەتایە لە ئاگردایە .




## بەڵگەی چوارەم :

٤/ لە (أبو سعيد الخدری) یەوە هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی : (قال موسى : يا رب علمني شيئا أذكرك وأدعوك به، قال: قل يا موسى : لا إله إلا الله، قال: كل عبادك يقولون هذا ! قال : يا موسى لو أن السموات السبع وعامرهن –غيري– والأرضين السبع في كفة و(لا إله إلا الله) في كفة، مالت بهن لا إله إلا الله ) (رواه ابن حبان والحاكم وصححه) واتە : پەروەردگارا... شتێکم فێر بکە یادی تۆی پێ بکەم و بەو شتە لە تۆ داوا بکەم، فەرمووی : ئەی موسا بڵێ : (لا الە الا اللّٰه ) فەرمووی : پەروەردگارا ... هەموو بەندەکانت ئەوە دەڵێن، فەرمووی : ئەی موسا .. ئەگەر هەر حەوت ئاسمانەکە و ئەوانەی ئاوەدانیان کردووەتەوە لەجگە لە منلو و هەر حەوت زەوییەکە لە تای تەرازوو بن و (لا الە الا اللّٰه) لە تایەکی تر بێت ئەوا (لا الە الا اللّٰه) قورس دەبێت بە سەریاندا ) .

## بەڵگەی پێنجەم :

٥/ و(الترمذي) ریوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە و بە (حسن)ی زانیوە، دەڵێت : گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (قال الله تعالى : يا ابن آدم، إنك لو أتيتني بقراب الأرض خطايا، ثم لقيتني لا تشرك بي شيئا، لأتيتك بقرابها مغفرة )) واتە : خوای گەورە دەفەرموێت : ئەی نەوەی ئادەم ! ئەگەر بە ئەندازەی هەموو زەوی بە تاوانەوە پێم بگەیت و کاتێ بە من گەیشتی هاوەڵت بۆ من بڕیار نەدابوو، ئەوا بە ئەندازەی هەموو زەوی بە لێ خۆش بوونەوەوە پێت دەگەم )).

(لا اله الا الله) : ئەم رستەیە زیکرێکە دوعا لە خۆ دەگرێت، چونکە ئەو کەسەی زیکرەکە دەکات رازی بوونی خوای دەوێت، (هەر ئەو وشەیە کلیلی بەهەشتە) بەڵام ئەگەر هەر کەسێك کلیلەکەی هێناو کەچی کلیلەکە ددانی نەبوو ئەوا بۆی ناکرێتەوە، وە مەرجەکانیشی ددانەکانیەتی .

(بقرابها مغفرة) : چاکەی تەوحید زۆر گەورە و مەزنە، تاوانە گەورەکان دەسڕێتەوە ئەگەر بە خوای گەورە گەیشت و شەریکی بۆی بڕیار نەدابوو، وە (مغفرة) بریتییە لە داپۆشینی تاوانەکان و لێخۆش بوون لە خاوەنەکەی بەوەی سزای لەسەر نەدات .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** فراوانی فەزڵی خوای گەورە .

**دووەم :** زۆری پاداشتی تەوحید لای خوای گەورە .

**سێیەم :** لە گەڵ ئەوەشدا تاوانەکان دەسڕێتەوە .

**چوارەم :** تەفسیری ئەو ئایەتەی لە سورەتی (الأنعام) دا هەیە ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾ ﴾.

**پێنجەم :** زۆر بە جوانی وردبەرەوە لەو پێنج شتەی لە فەرموودەکەی (عبادة)دا هاتووە.

**شەشەم :** ئەگەر کۆ بکەیتەوە لە نێوان ئەم فەرموودەیەو فەرموودەکەی (عتبان) و ئەوانەی پاش ئەو هاتوون ئەوا مانای (لا الە الا اللە ) ت بۆ روون دەبێتەوە و هەڵەی لە خۆبایی و مەغرورەکانت بۆ روون دەبێتەوە (چونکە دەبێت مەبەستی تەنها خوای گەورە بێت، وە ئەگەر وابێت ئەوا پێویستە وا لە کەسەکە بکات کاری چاك ئەنجام بدات ) .

**حەوتەم :** ئاگاداربوونی ئەو مەرجەی لە فەرموودەکەی (عتبان)دا هاتووە .(کە ئەویش ئیخلاصەو تەنها وتن بەس نییە) .

**هەشتەم :** پێغەمبەرانیش پێویستیان بە ئاگادار کردنەوە هەیە لەسەر فەزڵی (لا الە الا اللە) (کەوابوو جگە لەوان لە پێشترە)

**نۆیەم :** ئاگادار کردنەوە لەوەی کە ئەو وشەیە لە هەموو دروستکراوەکان سەنگینترە، لە گەڵ ئەوەشدا زۆرێك لە خەڵکی دەیڵێن و تەرازووەکەیان سووکە (جا بەڵاکە لە خاوەنەکەیەتی نەك لە وشەکە، لەبەر نەبوونی یەکێك لە مەرجەکان و بوونی رێگرییەك).

**دەیەم :** فەرموودەکە دەقێکەو هاتووە کەوا زەوییەکانیش حەوتن وەکو ئاسمانەکان (وەکو یەکن لە ژمارەدا).

**یازدەیـــەم :** ئاوەدانکـەرەوەیان هەیـە (واتـە ئاسمانـەکان، ئاوەدانکـەرەوەکانی فریشتەکانن).

**دوازدەیـەم :** سـەلماندنی صـیفاتەکان، بـە جیـاواز لـە گـەڵ گـرووی ئەشـعەری و (المعطلة) چونکە سەلماندنی صیفەتی روخساری (وجە) تێدایە .

**سیازدەیەم :** ئەگەر تۆ فەرموودەکەی ئەنەست زانـی، ئـەوا بـاش دەزانـی کـەوا ئـەو دەستەواژەی لە فەرموودەکەی (عتبان)دا هاتووە : (فإنَّ اللّٰهَ حرَّمَ على النارِ من قال: لا إله الا الله، يَبتغي بذلكَ وَجه اللّٰه) کەوا وازهێنان لە شیرك تەنها بە زمان نییە .

**چوارەدەیەم :** وردبەرەوە لەوەی کەوا (عیسا و محمد) (ﷺ) هەردوو بەندەی خـوا و پێغەمبەری ئەون .

**پازدەیەم :** زانینی تایبەتمەندی عیسا کەوا ئەو وشەی خوایە (بـە وشـەیەك دروسـت کراوە) ( بە بێ باوك دروستکراوە) .

**شازدەیەم :** زانینی ئەوەی کەوا ئەو رۆحێکە لە لایەن خواوە (یەکێکە لـەو رۆحانـەی خوای گەورە دروستی کردووە) .

**حەڤدەیەم :** زانینی فەزڵی باوەڕبوون بە بەهەشـت و دۆزەخ (ئـەوەش یەکێکـە لـەو هۆکارانەی خاوەنەکەی دەخاتە بەهەشتەوە).

**هەژدەیەم :** زانینی مانای ئەو فەرموودە : (على ما كان من العمل) .

**نۆزدەیەم :** زانینی ئەوەی کە تەرازووەکە دوو تای هەیە .

**بیستەم :** زانینی باسی –روخسار– (وجە) ( کە ئەویش صیفەتێکە لە صـیفاتەکانی خوا).

## ٣/ بەشی : هەرکەسێ تەوحید جێ بە جێ بکات ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە .

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی ئەو تەوحیدە بە جێ بگەیەنین کە واجیبە لە سەرمان و تامەزرۆی بووین، وە جێ بە جێ دەبێت بە پاککردنەوەی و پاڵفتە کردنی لە شیرك و بیدعە و سەرپێچی، ئەویش بە زانست و باوەڕبوون و ملکەچبوون دەبێت.

وە جێ بە جێ کردنی تەوحید لای نوسەر بە خوێندنەوەی بەشەکە بە وردی دەبێت وە بە شێوەیەکی گشتی دێتە دی بە :

١. چاولێکردنی پێغەمبەری خوا ئیبراهیم (ﷺ) .
٢. شوێنکەوتنی گەورە پیاوچاکان و ئەولیاکان (هاوەڵان).
٣. مانەوە لەسەر تەوحید هەرچەندە بە تەنها بویت .
٤. پشت بەستن بە خوا و وازهێنان لە روقیە و داخکردن و شوومی و رەشبینی (التطیر).

### بەڵگەی یەکەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ .. ﴾ .

لەم ئایەتەدا ستایشی گەورەمان ئیبراهیمی(ﷺ) تێدایە، بۆیە پێویستە لەسەرمان خۆشمان بوێت و شوێنی بکەوین، ئێمەش هێندە ستایش دەکرێین بە ئەندازەی شوێنکەوتنمان بە ئەو پێغەمبەرەوە(ﷺ)، چونکە ئەو تەوحیدی جێ بە جێ کرد بە شەش شت کە لە ئایەتەکەدا باسکراوە :

١. (أُمَّةً) : پێشەوایە و چاوی لێدەکرێت، لە کار و کردەوەو جیهادەکەیدا، لە گەڵ پشت بەستنی بە خوای گەورە.

٢. (قَانِتًا) : هەموو کات گوێڕایەڵ بوو، وە بەردەوام بوو لەو گوێڕایەڵییە لە هەموو حاڵەتێکدا، ئەو کەسێکی گوێڕایەڵ و دامەزراوەو بەردەوام بوو.

٣. (لِلَّهِ) : بەڵگەیە لەسەر ئیخلاص .

٤. (حَنِيفًا) : رووی کردبووە خواو پشتی کردبوو لە شیرك، دوور کەوتبووەوە لە هەموو ئەوەی لە گەڵ گوێڕایەڵیدا جیاواز بوو.

٥. (وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ) : بەری بوون لە شیرك و ئەهلەکەی (بە دڵ و زمان و ئەندامەکان).

٦. ( شَاكِرًا لِّأَنۡعُمِهِ ) : چونکە نیعمەتەکان تاقیکردنەوەن و پێویستیان بە سوپاسگوزارییە .

**چەند سوودێك :**

١. باوکی ئیبراهیم (ئازەر) لە سەر کوفر مردووە، بەڵگەش لە سەر ئەوە ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت : ﴿ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُ ﴾.

٢. باوك و دایکی (نوح) ئیماندار بوون، بەڵگەش لە سەر ئەوە ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت : ( رَّبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ) .

٣. ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت : سێ شت ئەصڵ و بنەمای نییە : غەزاکان و داستانەکان و تەفسیر، جا زۆر جار ئەوانە باس دەکرێن بە بێ سەنەد، جا هیچ کەسێك دەربارەی ئوممەتەکانی پێشوو هیچ شتێك نازانێت ئیللا لە ڕێگای وەحی یەوە نەبێت کە ئەویش کەلامی خوای گەورە و سوننەتی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) .

## بەڵگەی دووەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ ۝٥٩ ﴾

(لَا يُشۡرِكُونَ) مەبەستی شیرك بە مانا گشتییەکەیەتی، چونکە تەوحید جێ بە جێ نابێت ئیللا بە دوور کەوتنەوە لە شیرك بە مانا گشتییەکەی نەبێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە سەرپێچی ئەنجام نادەن، چونکە هەموو بەنی ئادەمێك هەڵە دەکات، وە مەعصوم نییە، وە ئەگەر سەرپێچیان کرد ئەوا تەوبە دەکەن و بەردەوام نابن لەسەری .

## بەڵگەی سێیەم :

له (حصين بن عبدالرحمن)ەوە هاتووە دەفەرموێت : (كُنْتُ عِنْدَ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فَقَالَ: أَيّكُمْ رَأَى الْكَوْكَبَ الّذِي انْقَضّ الْبَارِحَةَ؟ فقُلْتُ: أَنَا. ثُمّ قُلْتُ: أَمَا إِنّي لَمْ أَكُنْ فِي صَلاَةٍ. وَلَكِنّي لُدِغْتُ. قَالَ: فَمَا صَنَعْتَ؟ قُلْتُ: ارتَقَيْتُ. قَالَ: فَمَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قُلْتُ: حَدِيثٌ حَدّثَنَاهُ الشّعْبِيّ. قَالَ: وَمَا حَدّثَكُمْ ؟ قُلْتُ: حَدّثَنَا عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ الحُصَيْبِ، أَنّهُ قَالَ: لاَ رُقْيَةَ إِلاّ مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ). قَالَ: قَدْ أَحْسَنَ مَنِ انْتَهَى إِلَى مَا سَمِعَ. وَلَكِنْ حَدّثَنَا ابْنُ عَبّاسٍ عَنِ النّبِيّ (ﷺ) أنه قَالَ: "عُرِضَتْ عَلَيّ الأُمَمُ. فَرَأَيْتُ النّبِيّ وَمَعَهُ الرّهطُ. وَالنّبِيّ وَمَعَهُ الرّجُلُ وَالرّجُلاَنِ. وَالنّبِيّ وَلَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ. إِذْ رُفِعَ لِي سَوَادٌ عَظِيمٌ. فَظَنَنْتُ أَنّهُمْ أُمّتِي. فَقِيلَ لِي: هَذَا مُوسَى وَقَوْمُهُ. فَنَظَرْتُ. فَإِذَا سَوَادٌ عَظِيمٌ. فَقِيلَ لِي: هَذِهِ أُمّتُكَ. وَمَعَهُمْ سَبْعُونَ أَلْفاً يَدْخُلُونَ الْجَنّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ وَلاَ عَذَابٍ.) ثُمّ نَهَضَ فَدَخَلَ مَنْزِلَهُ. فَخَاضَ النّاسُ فِي أُولَئِكَ. فَقَالَ بَعْضُهُمْ: فَلَعَلّهُمُ الّذِينَ صَحِبُوا رَسُولَ اللّهِ(ﷺ). وَقَالَ بَعْضُهُمْ: فَلَعَلّهُمُ الّذِينَ وُلِدُوا فِي الإِسْلاَمِ فَلَمْ يُشْرِكُوا بِاللّهِ شيئاً. وَذَكَرُوا أَشْيَاءَ، فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللّهِ (ﷺ)، فَأَخْبَرُوهُ. فَقَالَ: "هُمُ الّذِينَ لاَ يَسْتَرْقُونَ. ولا يكتوون، وَلاَ يَتَطَيّرُونَ. وَعَلَى رَبّهِمْ يَتَوَكّلُونَ" فَقَامَ عُكّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ. فَقَالَ: يا رسول الله (ﷺ) ادْعُ اللّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَقَالَ (ﷺ): "أَنْتَ مِنْهُمْ" ثُمّ قَامَ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: ادْعُ اللّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَقَالَ (ﷺ) : "سَبَقَكَ بِهَا عُكّاشَةُ".)

واتە :لای (سعید بن جبیر) بووم، فەرمووی : کێ لە ئێوە ئەو ئەستێرەی بینی کە دوێنێ شەو کشا (ئاوابوو) ؟ گوتم : من بینیم، ئەمجار گوتم : بەڵام من بۆ شەونوێژ هەڵنەستابووم، بەڵکو پێوەدرابووم، فەرمووی : ئەی چیت کرد ؟ گوتم : روقیەم کرد، فەرمووی : چی شتێك وای لێکردی ئەو کارە بکەیت ؟ گوتم : فەرموودەیەك کە (الشعبي) بۆی گێڕاینەوە، فەرمووی : چی بۆ گێڕانەوە ؟ گوتم : لە (بريدة بن الحصيب)ەوە بۆی گێڕاینەوە، کەوا فەرموویەتی : (هیچ چارەسەرێك بۆ حەسودی یان پێوەدان سوودبەخشتر نییە وەکو روقیە) فەرمووی : ئەو کەسەی کە هەواڵەکەی پێ گەیشتووە شتێکی باشی کردووە، بەڵام (ابن عباس) بۆی گێڕاینەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کەوا فەرموویەتی : (ئوممەتەکان خرانە بەرچاوم، پێغەمبەرم دەبینی کۆمەڵە کەسێکی کەمی لە گەڵدایە، وە پێغەمبەرم دەبینی تەنها پیاوێك یان دوو پیاوی لە گەڵدایە، وە پێغەمبەرم دەبینی کەسی لە گەڵدا نییە، ئینجا خەڵکێکی زۆرم پیشاندرا، گومانم کرد کە ئوممەتەکەی من بن، پێم وترا : ئەمە موسا و قەومەکەیەتی، ئەمجار تەماشام کرد، کۆمەڵێکی مەزنم بینی، فەرمویان : ئەوە ئوممەتەکەتە، حەفتا هەزار کەسیان لە گەڵدایە بە بێ لێپرسینەوە و بە بێ سزا دەچنە بەهەشتەوە ).

ئەمجار هەستاو چووە ماڵەکەی خۆیەوە، جا خەڵکی دەستیان کرد بە باس کردنی ئەوانە (ئەو حەفتا هەزارە) هەندێکیان وتیان : رەنگە ئەو کەسانە بن کە هاورێتی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) کردبێت، وە هەندێکیان فەرموویان : رەنگە ئەو کەسانە بن کە بە موسڵمانێتی لە دایك بوونە و هیچ شەریکیان بۆ خوا بریار نەدابێت، وە باسی چەند شتێکی تریان کرد، ئەمجار پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرچوو، باسەکەیان بۆ گێڕایەوە، فەرمووی : ئەوانە ئەو کەسانەن کە داوای روقیەکردن لە کەس ناکەن و خۆیان داخ ناکەن (بە هۆی نەخۆشییەوە) وە شومی و رەشبین ناکەن (نە بە هۆی باڵندەوە نە بۆ هۆی شتی ترەوە) و پشت و پەنا تەنها بە خوا دەبەستن ) . ئەو کاتە (عكاشة بن محصن) هەستا و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خوا داوا بکە من یەکێك بم لەوانە . فەرمووی : تۆ لەوانیت، ئەمجار پیاوێکی تر هەستا و فەرمووی : داوا لە خوا بکە منیش یەکێك بم لەوانە، فەرمووی : عکاشە پێشت کەوت )) .

- (انْقَضّ) : کەوتە خوارەوە ( ئاوابوو) .
- (ارْتُقِيْتُ) : داوای روقیەم کرد .
- (عَيْنٍ) تەماشاکردنی کەسێکی حەسوود (چاوپیس) .
- (فَمَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ) : بەڵگەی دروستی داواکردنی حوججە یان بەڵگەی تێدایە، بەڵام بە ئەدەبەوە .
- (لا رُقْيَةَ إلَّا مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ) : واتە : هیچ چارەسەرێك و دەوایەك نییە بە سوودتر بێت بۆ حەسوودی و پێوەدانی گیاندارە ژەهراوییەکان وەکو روقیەی شەرعی بە مەرجەکانییەوە، لە گەڵ جێگر بوونی روقیە بۆ جگە لەوانە .
- (حُمَةٍ) : بریتییە لە پێوەدانی هەموو ژەهردارێك، بەڵام (الحمَّة) بریتییە لەبەرزبوونی پلەی گەرمی لەش .
- (الرَّهط) : لە سێ کەسەوە تاوەکو نۆ کەس .
- (لا يسترقون) داوا لە هیچ کەسێك ناکەن کەوا بەسەریاندا بخوێنێت، لەبەر ئەم هۆیانە :

١. لەبەر بەهێزی پشت بەستنیان لەسەر خوای گەورە .
٢. بوونی عیززەتی نەفسیان لەوەی بەرانبەر بە جگە لە خوا خۆیان زەلیل بکەن.
٣. چونکە پەیوەست بوونی تێدایە بۆ جگە لە خوا .

- ریوایەتی : (لا يَرقون) هەڵەیە، هەروەکو شيخ الاسلام –رەحمەتی خوای لێ بێت– فەرموویەتی، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی روقیەی دەکرد، وە جبریل و دایکە عائیشە روقیەیان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردووە و هاوەڵان روقیەیان دەکرد .

- جۆرەکانی خەڵکی لە داواکردنی روقیەدا :

١. داوا بکات روقیەی بۆ بکرێت، ئەمەش کەمالی لە دەست دەردەچێت ( لە حەفتا هەزارەکە نابێت).

٢. رێگر نییە ئەگەر کەسێك روقیەی بۆ بکات، ئەمە کەمالی لە دەست دەرنەچووە، چونکە خۆی داوای روقیەی نەکردووە .

٣. رێگر بێت لەوەی کەسێك روقیەی بۆ بکات، ئەمەش لە گەڵ سوننەتدا جیاوازە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) رێگر نەبوو لە دایکە عائیشە کاتێ روقیەی بۆ کرد .

- ( ولا يكتوون) داوا ناکەن لە هیچ کەسێك داخیان بکات (بە مەبەستی چارەسەر) .

- ( ولا يَتَطيَّرُون) : (التطيُّر) بریتییە لە شوومی و رەشبینی بە بینینی شتێك یان بیستنی شتێك یان شتێکی زانراو لە شوێن و کات، وە حوکمی ئەو کارە شیرکی بچووکە .

- جگە لەم سێ حاڵەتە هیچ شتێك رێگر نییە لەوەی بە بێ لێپرسینەوە و سزا بچێتە بەهەشتەوە، لەبەر بوونی ئەو دەقانەی هاتوون بە فەرمان کردن بە چارەسەر و ستایش کردنی هەندێ دەواو دەرمان وەکو هەنگوێن و رەشکە .



## مەسەلەكان :

**یەكەم :** زانینی پلەكانی خەڵكی لە تەوحیددا .

**دووەم :** مانای جیٚ بە جیٚ كردنی چییە ؟ ( پاككردن و پاڵفتە كردنی لە شیرك و بیدعە و سەرپیٚچی ) .

**سێیەم :** ستایشكردنی ئیبراهیم لە لایەن خوای گەورەوە بەوەی ئەو یەكێك نەبووە لە موشریكەكان .

**چوارەم :** ستایشكردنی گەورە پیاوچاكان و ئەولیاكان بە سەلامەت بوونیان لە شیرك .

**پێنجەم :** وازهێنان لە روقیە و داخكردن لە بە جێهێنانی تەوحیدە (داواكردنی روقیە و داخكردن).

**شەشەم :** كۆكەرەوەی ئەو ئاكارانە برتییە لە پشت بەستن ( چونكە وازی لێهێناوە لەبەر هێزی پشتبەستن).

**حەوتەم :** قووڵی زانست و تێگەیشتنی هاوەڵان بەوەی زانیویانە كەوا ئەو پلەیان دەست ناكەوێت ئیللا بە كردارێكی دڵسۆزانە نەبێت .

**هەشتەم :** سووربوونیان لەسەر خەیر و چاكە ( چونكە دەیانەوێت بگەنە ئەنجامێك بۆ ئەوەی پێی هەستن).

**نۆیەم :** فەزڵی ئەم ئوممەتە بە چەندێتی (ژمارە) و چۆنییەتی (كردار) .

**دەیەم :** فەزڵی هاوەڵانی (شوێنكەوتوانی) موسا .

**یازدەیەم :** نمایش كردن و پیشاندانی ئوممەتەكان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) (١/ دڵنەوایی كردنە بۆی ٢/ روونكردنەوەی فەزڵ و رێز و شەرەفی ئەوە) .

**دوازدەیەم :** هەموو ئوممەتێك بە تەنها لە گەڵ پێغەمبەرەكەی خۆیدا حەشر دەكرێت .

**سیازدەیەم :** كەمی ئەوانەی وەڵامی پێغەمبەرانیان داوەتەوە .

**چواردەیەم :** هەركەسێ هیچ كەس وەڵامی نەدابێتەوە بە تەنها دێت .

**پازدەیەم :** بەرهەمی ئەم زانستە، ئەویش : ١/ مەغروور نەبوونە بە زۆری (نەوەك لەگەڵیاندا بە هەلاكەتدا بچین) ٢/ بێ نیاز نەبێت لە كەمەكەیدا·چونكە رەنگە كەمەكە باشتر بێت لە زۆرەكە) .

**شازدەیەم :** رێگەدراوە بە روقیەی شەرعی بە هۆی چاو و پێوەدان و جگە لەوانە .

**حەڤدەیەم :** قوولێ زانستی سەلەف، بە بەڵگەی ئەوەی كە دەفەرموێت : (قَدْ أَحْسَنَ مَنِ انْتَهَى إِلَى مَا سَمِعَ. وَلَكِنْ كذا وكذا)، جا ئەوەی زانیوە كەوا فەرموودەی یەكەم جیاواز نییە لە گەڵ دووەمدا .

**هەژدەیەم :** دووری سەلەف لە ستایشكردنی مرۆڤێك بە شتێك تیایدا نەبێت .

**نۆزدەیەم :** مەبەست لە : (أَنْتَ مِنْهُم) نیشانەیەكە لە نیشانەكانی پێغەمبەرایەتی .

**بیستەم :** فەزڵی عوكاشە ( بەوەی یەكێكە لەوانەی دەچنە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە و عەزاب).

**بیست و یەكەم :** بە كارهێنانی (المعاريض)، ١/ یان لەبەر ئەوەی كەسێكی دووڕوو بووە . ٢/ یان لەوە ترسا ئەو دەرگایە بكرێتەوە و كەسێك داوای ئەو پلەیە بكات كە شایەنی نەبێت).

**بیست و دووەم :** رەوشت جوانی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

## ٤/ بەشی ترسان لە شیرك :

**نوسەر بۆ ئەم بەشەی هێناوەتەوە لە پاش جێ بە جێ کردنی تەوحید ؟**

١/ چونکە هەموو بەشێك لە پاش جێ بەجێ کردنی تەوحید بریتییە لە جێ بە جێ کردنی تەوحید، جا لە جێ بە جێ کردنی تەوحید ترسانە لە شیرك، وە لە جێ بە جێ کردنی تەوحید بانگەوازە بۆی و ئا بەم شێوەیە تا کۆتایی کتێبەکە .

٢/ چونکە مرۆڤ وا دەزانێ کە تەوحیدی جێ بە جێ کردووە کەچی جێ بە جێی نەکردووە، بۆیە با لە خۆی دەرنەچێت و مەغرور نەبێت .

### بەڵگەی یەکەم و دووەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ ﴾

خوای گەورە لەسەر زاری ئیبراهیم دەفەرموێت : ﴿ وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ﴾

## چۆن لە شیرك بترسین ؟

| بەفێربوونی تەوحید و کارکردن پێی و بانگەوازکردن بۆی و ئارامگرتن لەسەری . | خوێندنەوە و دیراسەت کردنی شیرك و زانینی هۆکار و پاڵنەرەکانی، ئەویش بە دوور کەوتنەوە دەبێت لێی . | پارانەوە و پشت بەستن بە خوا . | بەریبوون لە شیرك و ئەهلەکەی و دوور کەوتنەوە لێیان، بۆ ئەوەی نەبێتە یەکێك لەوان . |
| --- | --- | --- | --- |

شیرك تاوانێکە خوای گەورە هەرگیز لێی خۆش نابێت، ئەگەر کەسەکە لەسەر شیرك مرد، چونکە ئەوە تاوانێکە بەرانبەر بە حەقی تایبەتی خوای گەورە ئەنجام دەدرێت کە ئەویش تەوحیدە، جا هەرکەسێ بمرێت لەسەر شیرکی گەورە ئەوا بە هەتا هەتایی لە ئاگردا دەمێنێتەوە، وە ئەگەر لەسەر شیرکی بچووك بمرێت ئەوا بە ئەندازەی شیرکەکەی سزا دەدرێت و ئەمجار دەخرێتە بەهەشتەوە، وە بە هەتا هەتایی لە ئاگردا نامێنێتەوە چونکە ئەهلی ئیمانە .

(وَٱجۡنُبۡنِی) : من بخەرەوە لایەك و بت پەرستان بخەرە لایەکی ترەوە، تاوەکو لێی دوور بکەوێتەوە .

(ٱلْأَصْنَامَ) : (الصنم) بت : بریتییە لە هەموو ئەوەی لە جگە لە خوا دەپەرسترێت لە سەر شێوەی مرۆڤ یان جگە لە مرۆڤ دروست دەکرێت، بەلاّم (الوثن) بریتییە لە هەموو ئەوەی لە جگە لە خوا دەپەرسترێت جا ئەگەر لە سەر هەر شێوەیەك بێت، کەواتە (الوثن) لە (صنم) گشتگیرترە .

ئیبراهیم لە خۆی دەترسێت نەوەك تووشی شیرك بێت، کە خۆشەویست و خەلیلی خوای گەورەیە و پێشەوای یەکتاپەرستانە، ئەی ئاخۆ دەبێ بۆ ئێمە چۆن بێت ؟ بۆیە هەرگیز لە شیرك تەئمین مەبە، چونکە هیچ کەسێك تەئمین نییە لە دووڕوویی ئیللا کەسی دووڕوو نەبێت .

## بەڵگەی سێیەم و چوارەم و پێنجەم :

٣/ لە فەرموودەیەکدا هاتووە:(أخوف ما أخاف عليكم : الشرك الأصغر، فسُئل عنه؟ فقال : الرياء) واتە : ئەو شتەی لە هەموو شتێك زیاتر لێی دەترسم تووشتان ببێت شیرکی بچووکە، پرسیاری لێکرا کە ئەوە چییە؟ فەرمووی : ریایە)

٤/ وە لە (ابن مسعود) ەوە هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەوا فەرموویەتی : (من مات وهو يدعو لله نداً، دخل النار) (رواه البخاري) واتە : هەرکەسێ بمرێت لە کاتێکدا هاوەڵی بۆ خوا بڕیاردابێت ئەوا دەچێتە ئاگرەوە) .

٥/ وە لە (مسلم)دا هاتووە لە (جابر)ەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ لَقِيَ اللهَ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَقِيَهُ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا دَخَلَ النَّارَ) واتە : هەرکەسێ بگاتە خوای گەورە لە کاتێکدا پێی دەگات هیچ شەریکێکی بۆ بڕیار نەدابێت ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە، وە هەرکەسێ بگاتە خوای گەورە لە کاتێکدا پێی دەگات شەریکی بۆ بڕیار دابێت ئەوا دەچێتە ئاگرەوە) .

(الرياء) : ئەویش بریتییە لەوەی خوای گەورە دەپەرستێت بۆ ئەوەی خەڵکی ببینێ یان ناوبانگی ببیسن و مەدحی بکەن لەسەر ئەوەی کەسێکی خواپەرستە، وە مەبەستی ئەوە نییە خواپەرستییەکەی بۆ خەڵکی بێت، چونکە ئەگەر وابوو ئەوا شیرکی گەوریە، وە ئەگەر مەبەستی لە خواپەرستییەکەی ئەوە بوو خەڵکی چاوی لێ بکەن ئەوا لە بەشی ریا نییە، بەڵکو ئەمە بەشێکە لە بانگەواز بۆ دینی خوا، وە چارەسەری رووپامایی (ریا) بە بەمانەی خوارەوە دەبێت :

١. دیراسەت و خوێندنەوەی تەوحید، چونکە بە خوێندنەوەی تەوحید خوای گەورە بە مەزن دەزانێت و لە پێناوی دینی خواداد گوێ بە هیچ کەسێك نادات.
٢. دوعا و پاڕانەوە.
٣. سووربوون لەسەر ئەوەی کردارەکان نهێنی بێت لە نێوان بەندە و خواکەیدا .
٤. وازنەهێنان لە کردار بە بیانووی ئەوەی نەوەك بکەوێتە ناو ریاوە .
٥. زۆر ئەنجامدانی کرداری چاك کە دوارۆژ دەخاتە یادی بەندە، وەکو سەردانی گۆڕستان بە پێی مەرجەکانی .

**بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ترسی لەسەر ئوممەتەکەی بووە تووشی رووپامایی (ریا) بێت زیاتر لە مەسیحی دەججال ؟**

چونکە فیتنەی مەسیحی دەججال دیار و ئاشکرایە، بەڵام فیتنەی ریا شاراوەیە.

چونکە فیتنەی مەسیحی دەججال لە کاتێکی دیاریکراودا دەبێت (کۆتا سەردەمدا) بەڵام ریا لە هەموو کاتێکدا دەبێت.


بەشەکانی روو پامایی (ریا)
لە ئەصڵ و بەنەمای پەرستنەکەدا بێت : واتا هەڵنەستاوە بە ئەنجامی ئەو پەرستنە ئیللا لەبەر رووپامایی (ریا)، جا ئەو پەرستنە پووچەڵە .
لە ناکاودا رووبدات : لە ئەصڵ و بنەمادا بۆ خوا ئەنجام دراوە بەلام ریاکە لە ناکاودا رووەدەدات :
لەپاش لێبوونەوە لە پەرستنەکە : هیچ کاریگەری لەسەر نابێت ئیللا مەگەر دوژمنایەتی تێدا بێت، وەکو منەت کردن و ئازاردان لەپاش صەدەقەکردن .
ئەگەر ریاکەی پاڵنا : ئەمە زیانی نییە چونکە ئەوەی پێویستە ئەنجامی داوە و پەرستنەکەی تەواوە .
ئەگەر لە گەڵ ریاکەدا شۆر بویەوە بەردەوام بوو : ئەوا وردەکاری تێدایە :
ئەگەر پەرستنەکە سەرەتاکەی پەیوەندی بە کۆتاییەکەیەوە بوو وەکو نوێژ : ئەوا ئەو پەرستنە هەمووی پووچەڵە .
ئەگەر پەرستنەکە سەرەتاکەی بچرابوو لەگەڵ کۆتاییەکەیەوە وەکو زەکات : جا ئەو بەشەی کە ریای تێدایە ئەوا پوچەڵە و ئەو بەشەی ریای تێدا نییە ئەوا دروست و تەواوە.

- (نِدًّا) : (النِّدُّ) : واته : هاوشێوه و لێکچوو و هاوتا .
- (دخل النار) : ئەمە سزای ئەو کەسانەیە هاوشێوه بۆ خوا دادەنێن .
- (شَيْئًا) : هەمووی شتێك دەگرێتەوە، هەر شیرکێك بێت، هەرچەندە بەرێزترین کەس بکاتە شەریك بۆ خوای گەورە ئەوا دەچێتە ئاگرەوە .
- ((وَمَنْ لَقِيَهُ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا دَخَلَ النَّارَ)) : ئەگەر شیرکەکە شیرکی بچووك بوو ئەوا بە تاهەتایی لە ئاگردا نامێنێتەوە وە ئەگەر شیرکەکە شیرکی گەورە بوو ئەوا بە تاهەتایی لە ئاگردا دەمێنێتەوە .
- شیرك بابەتێکی زۆر گرانە و ئاسان نییە، بەڵام خوای گەورە بە رەحمەتی خۆی ئیخلاص ئاسان دەکات لای بەندەکان، بەوەی کە هەردەم خوای گەورە لە پێش چاوی بێت، مەبەستی لە ئەنجامدانی کارەکەی تەنها خوای گەورە بێت نەك مەدح و پیاهەڵدانی خەڵکی یان زەمی ئەوان یان ستایشیان، چونکە خەڵکی هیچ سوودی پیّ ناگەیەنن .
- هەروەها گرنگە ئەوەیە کە مرۆڤ هەرگیز دڵخۆش نەبێت بەوەی خەڵکی قسە وەردەگرن چونکە ئەوە قسەی ئەوە، بەڵام بەوە دڵخۆش بێت کەخەڵکی قسەکانی وەردەگرن ئەگەر حەق بوون، نەك لەبەر ئەوە قسەی ئەوە، هەروەها بە پێچەوانەوە، جا ئیخلاص زۆر گرانە، ئیللا مەگەر مرۆڤ بە راستی رووی لە خوا بوو، لەسەر راستە رێگاکە بوو، ئەوا خوای گەورە یارمەتی لەسەر دەدات و سووك و ئاسانی دەکات لەسەری .

**دوعا دابەش دەبێتە دوو بەشەوە :**

**دوعای پەرستن :**

وەکو ئەوەی کەسێك نوێژ دەکات و حەج دەکات و رۆژوو دەگرێت بۆ جگە لە خوا ئەوە کەسێکی کافرە بە کوفری گەورە .

**دوعای داواکردن :**

ئەمەش دابەش دەبێتە دوو بەشەوە :

**ئەوەی هیچ کەسێك توانای لەسەری نییە تەنها خوا نەبێت :**

بۆیە ئەنجامدانی بۆ جگە لە خوا شیرکی گەورەیە، وەکو ئەوەی کەسێك داوای منداڵ بکات یان داوای باران بارین بکات لە جگە لە خوای گەورە .

**ئەوەی کە دروستکراوەکان توانایان لەسەر هەیە :**

ئەم جۆرە دوعایە دروستە بە چوار مەرج : ئەو کەسەی داوای لێ دەکرێت زیندوو بێت، ئامادە بێت، توانای هەبێت، وە هۆکاریش بێت.

## جیاوازی لە نێوان شیركی گەورەو بچووك :

### شیركی گەورە :

١. خاوەنەكەی لە ئیسلام دەردەكات.
٢. هەموو كردەوەكان پووچەڵ دەكاتەوە .
٣. خاوەنەكەی بۆ هەتا هەتایی لە ئاگردا دەهێڵێتەوە .
٤. خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەكات لە لایەن دەسەڵاتدارەوە .
٥. ئەگەر هاتوو بەڵگەیەك هەبوو كەوا گەورەیە (الاكبر) .
٦. ئەگەر باوەڕی وابوو كەوا جگە لە خوا بەڕێوەبردنێك و تەصەروفێكی شاراوەی هەیە لە گەردووندا بە دەستهێنانی قازانج و دوورخستنەوەی زیانەكانی بە دەستە .

### شیركی بچووك :

١. خاوەنەكەی لە ئیسلام دەرناكات .
٢. كردەوەی تایبەت پووچەڵ دەكاتەوە .
٣. خاوەنەكەی بۆ هەتا هەتایی لە ئاگردا ناهێڵێتەوە .
٤. خوێن و ماڵی حەڵاڵ نابێت .
٥. ئەگەر هاتوو لە شەرعدا بەڵگەیەك هەبوو كە بچووكە (الاصغر) .
٦. باوەڕی وابێت ئەوەی خوای گەورە نەیكردووەتە هۆكار ئەم بە هۆكاری بزانێت .
٧. هەر شتێك وەسیلەیەك بێت بۆ شیركی گەورە ئەوا شیركی بچووكە .

هەموو ئەوەی لە دەقە شەرعییەكاندا بە (شرك) یان (كفر) ناویان هاتووە و بە (ال)ی تەعریف تەعریف نەكرابوون ئەصڵ ئەوەیە كە بچووكن.

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** ترسان لە شیرك

**دووەم :** رووپامایی (ریا) بەشێکە لە شیرك .

**سێیەم :** ئەوەش (واتە : ریا) لە جۆری شیرکی بچووکە (رووپامایيەکی کەم) .

**چوارەم :** لە هەموو شتێك زیاتر لێی دەترسێت تووشی پیاوچاکان بێت ( چونکە رەنگە بچێتە دڵی مرۆڤەوە بە بێ ئەوەی هەستی پێ بکات لەبەر شاراوەیی و نەفسیش ئاگای لێیەتی، چونکە زۆرێك لە نەفسەکان پێیان خۆشە مەدح بکرێن بەوەی خاوەنەکەی خواپەرستی دەکات ).

**پێنجەم :** نزیکی بەهەشت و دۆزەخ .

**شەشەم :** کۆکردنەوە لە نێوان نزیکی هەردووکیاندا لە یەك فەرمووددەدا .

**حەوتەم :** ئەگەر هەرکەسێك گەیشتە خواکەی خۆی شەریکی بۆ بڕیار دابێت ئەوا دەچێتە ئاگرەوە هەرچەندە خواپەرستترین کەس بێت ( ئەگەر شیرکی گەورە بێت ناچێتە بەهەشتەوە، وە ئەگەر بچووك بێت، ئەوا بە ئەندازەی تاوانەکی سزا دەدرێت و ئەمجار دەچێتە بەهەشتەوە ).

**هەشتەم :** مەسەلە گەورەکە ئەوەیە کە ئیبراهیم داوای کردووە بۆ خۆی و نەوەکەی کە لە بت پەرستی بپارێزرێن .

**نۆیەم :** ئیعتبارەکە بە پێی زۆرینەیە : بە بەڵگەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت :

﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾.

**دەیەم :** تەفسیری (لا إله إلا الله) تێدایە هەروەکو چۆن بوخاری باسی کردووە .

**یازدەیەم :** فەزڵی ئەو کەسەی لە شیرك پارێزراو دەبێت (دەچێتە بەهەشتەوە).

## ٥/ بەشی بانگەواز بۆ شایەتیدانی ( لا اله الا الله ) .
## بۆ نوسەر ئەم بەشەی هێناوەتەوە ؟

١. کاتێ باسی تەوحیدی مرۆڤی کرد بۆ خۆی، باسی بانگەوازی جگە لە خۆی کرد بۆ ئەو تەوحیدە، چونکە ئیمانی کەسەکە تەواو نابێت ئیللا ئەگەر بانگەوازی بۆ کرد، بۆیە پێویستە لە گەڵ تەوحیددا بانگەواز هەبێت بۆ تەوحید، ئەگەر نا ئەوا تەوحیدەکەی نوقصان دەبێت .

٢. وەڵامی ئەو کەسانەی تێدایە کە دەڵێن پێویستە یەکەم شتێك دەستی پێ بکرێت نوێژە نەك تەوحید .

### بەڵگەی یەکەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ ﴾ .

- (سَبِيلِيٓ) : ڕێگاکەم، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شەرعدا هێناویەتی وەکو پەرستن و بانگەواز بۆ لای خوا .
- (إِلَى ٱللَّهِ) : بانگخوازان دابەش دەبنە دوو بەشەوە :
- ١/ بانگخوازێك بۆ لای خوا ٢/ بانگخوازێك بۆ لای جگە لە خوا .
- (عَلَىٰ بَصِيرَةٍ) : ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە :
- **١/ زانستی شەرعی ٢ / زانیاری دەربارەی حاڵی ئەو کەسەی بانگی دەکات**
- **٣/ حیکمەت .**
- مەرجەکانی بانگەواز بۆ لای خوا :

١– تەنها بۆ خوای گەورە بێت (ئیخلاص) . ٢– لەسەر زانستی شەرعی بنیات نرابێت .
٣– حیکمەت و دانایی تێدا بێت . ٤– حاڵی ئەو کەسانە بزانێت کەوا بانگیان دەکات .
٥– ئارامگرتن .

## بەڵگەی دووەم :

لە (ابن عباس)ەوە هاتووە، دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ (معاذ)ی بۆ یەمەن ڕەوانە کرد پێی فەرموو : (إنَّك تَأْتِي قَوْمًا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، فليكن أول ما تدعوهم إليه شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ (وفي رواية : الى أن يوحدوا الله)، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ ؛ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ ؛ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ ) (رواه البخاري ومسلم) واتە: تۆ دەچیت بۆ لای قەومێك لە ئەهلی کیتاب، با یەکەم شتێك بانگی ئەوانی بۆ دەکەیت : شایەتیدان بێت بەوەی کە هیچ خودایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت (وە لەریوایەتێکدا هاتووە : بۆ ئەوەی خوا بە تاك و تەنها بپەرستن)، جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵت بوون لەوەدا ئەوا ئاگاداریان بکەرەوە کە خوای گەورە پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون لە هەر شەو و ڕۆژێکدا، جا ئەگەر ئەوان لەوەدا گوێڕایەڵت بوون، ئەوا ئاگاداریان بکەرەوە کە خوای گەورە زەکاتی لەسەر فەرز کردوون، لە دەوڵەمەندەکانیان وەربگیرێت و بدرێتەوە بە هەژارەکانیان، جا ئەگەر ئەوان لەوەدا گوێڕایەڵت بوون، ئەوا ئاگادار بە و خۆت بپارێزە لە سامانە چاك و جوانەکەیان، وە خۆت بپارێزە لە نزا و دوعای ستەملێکراو، چونکە لە نێوان ئەو و خوای گەورەدا هیچ پەردەیەك نییە ).

## هەندێ لە سوود بە دەست هاتووەکانی فەرموودەکە :

١. دروستی رەوانەکردنی بانگخوازان بۆ لای خوا و فێرکردنیان .
٢. پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەك کەسی رەوانە کرد، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر وەرگرتنی خەبەری یەك کەس (الآحاد) هەرچەند لە بواری عەقیدەدا بێت .
٣. مەرجی چەند رۆژێکی دیاری کراوی دانەناوە بۆ بانگەواز، بەڵکو بە پێی پێویست لە ناویاندا دەمێنێتەوە.
٤. چۆنییەتی بانگەوازی نەیارانی تێدایە، وە سووکترین رێگا بۆ بانگکردنیان بریتییە لە تەوحید، نەك مشتومڕ و چەلەحانێ (مناظرة).
٥. تەنها بانگەواز بۆ ئیسلام بەس نییە، بەڵکو هەواڵیان پێ دەدات بەوەی پێویستە لەسەریان تاوەکو پێی قایلبن و دەستی پێوە بگرن،بەڵام بە پێی ئەو رێزبەندییەی لە فەرموودەکەی رەوانەکردنی (معاذ) دا هاتووە .

## بەڵگەی سێیەم :

لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتووە لە (سهل بن سعد)ەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە رۆژی خەیبەردا فەرموویەتی : «لأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ غداً رجلاً يُحبُّ اللهَ وَرَسولَهُ(ﷺ)، ويُحِبُّهُ اللهُ وَرَسُولُهُ (ﷺ)، يَفْتَحُ الله عَلَى يَدَيهِ »، فَبَاتَ النَّاسُ يَدُوكُونَ لَيْلَتَهُمْ أَيُّهُمْ يُعْطَاهَا . فَلَمَّا أصْبَحوا غَدَوْا عَلَى رسولِ الله (ﷺ)، كُلُّهُمْ يَرْجُو أنْ يُعْطَاهَا. فَقَالَ(ﷺ) : « أينَ عَلِيُّ بنُ أَبِي طالب ؟ » فقيلَ : هُوَ يَشْتَكي عَيْنَيهِ، فَأَرْسَلُوا إلَيْه فَأُتِيَ بِهِ، فَبَصَقَ فِي عَيْنَيْهِ وَدَعَا لَهُ، فَبَرأَ حَتَّى كأنْ لَمْ يكُن بِهِ وَجَعٌ، فأعْطاهُ الرَّايَةَ . فقَالَ (ﷺ): « انْفُذْ عَلَى رِسْلِكَ حَتَّى تَنْزِلَ بسَاحَتهِمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإسْلاَمِ، وَأخْبِرْهُمْ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ مِنْ حَقِّ اللهِ تَعالَى فِيهِ، فَوَالله لأَنْ يَهْدِيَ اللهُ بِكَ رَجُلاً وَاحِداً خَيرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَم » واتە : ((سبەینێ ئاڵاکە دەدەمە دەستی کەسێکەوە کە خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) خۆشی بوێت و ئەویش خوا و پێغەمبەری (ﷺ) خۆش بوێت،

خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو، فەتحی خەیبەر دەکات)) ئەو شەوە خەڵکی سەرقاڵی ئەوە بوون کە ئاخۆ بدرێتە کامیان، کاتی رۆژ بوویەوە رۆیشتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هەموویان ئومێدی ئەوەیان بوو بە ئەو بدرێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (( کوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب؟) فەرموویان : ئەو تووشی چاوئێشە بووە، ناردیان بە شوێنیدا و هێنایان، ئەویش تفی کردە هەردوو چاوی و دوعای بۆ کرد، بۆیە یەکسەر چاك بوویەوە هەروەکو ئەوەی هیچ ئازاریکی نەبوبێت لە پێشدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاڵاکەی پێدا و فەرمووی : لەسەر خۆت بەرەو پێش بڕۆ تا دادەبزێتە گۆڕەپانی ئەوان، ئەمجار بانگیان بکە بۆ ئیسلام، وە هەواڵیان پێ بدە ئەوەی پێویستە لەسەریان لە حەقی خوای گەورە، سوێند بە خوا ئەگەر تەنها یەك کەس بە هۆی تۆوە هیدایەت بدرێت ئەوا باشترە لە بە دەستهێنانی چەندین وشتری سوور) .

یدوکون : سەرقاڵی بوون و قسەیان لەسەر دەکرد .

- سەلماندنی صیفەتی خۆشەویستی بۆ خوا، وە خوای گەورە خۆشیانی دەوێت و خۆیشی خۆشەویستە، بەڵام خۆشەویستیەکە وەکو ئەو خۆشەویستییە نییە .
- سەلماندنی فەزڵی تایبەت مەرج نییە فەزڵی گشتی بگرێتەوە، وەکو ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی (أبو عبیدە) فەرموویەتی کەوا ئەو : (أَمِينُ هَذِهِ الأُمَّةِ) واتە : دەستپاك و ئەمینی ئەم ئوممەتەیە) ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ئەو باشترین هاوەڵانە، هەروەها (معاذ)یش.
- (حُمْرِ النَّعَم) : واتە : وشتری سوور، بۆیە ناوی ئەوەی هێناوە چونکە لای عەرەب شتێکی نایاب بووەو حەزیان لێ کردووە.

**کارە نائاساییەکان چوار دانەن :**

مەبەست لێی ئەوەی جیاواز بێت لەوەی خەڵکی لەسەری راهاتوون، وەکو ئەوەی بە ئاسماندا بفرێت یان بە سەر ئاودا رێ بکات :

**١/ ئایـــەت :** ئەمـە بـۆ پێغەمبــەران و نێـــردراوان دەبێـــت، وە ناگوترێـــت (معجـزة)، چـونکە ئـەوە لـە قورئـان و سوننەتدا هاتووە، وە (المعجـزة) رەنگە هەندێ خەڵکی نەتوانن بیکەن و جگە لە پێغەمبەرانیش بیکەن، وە هـیچ کەسـێك بـۆی نییـە بانگەشـەی ئـەوە بکـات کـە ئایــەتی هەیــە لــە پــاش وەفــاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

**٢/ کەرامەت :** لە سەر دەستی ئـەولیای خوای گەورە روو دەدات، ئەوانیش ئـەو کەسـانەن کـە ئیمـان و تـەقوایان لـە خۆیانــدا کۆکردووەتــەوە، وە نمونــەی کەرامــەت ئــەوەی بــە ســەر هــاوەڵانی ئەشکەوتدا هات (أصحاب الكهف) .

**٣/ مــوعجیزە یــان فیتنــە :** لــە ســەر دەســتی ئــەولیای شــەیتان روو دەدات، پێی دەزانی بە پێی حاڵی کەسـەکە، نـە ئیمـانی هەیـە و نـە تـەقوا، وە نمونـەی مـوعجیزە ئــەوەی لــە ســەر دەســتی دەججال روو دەدات .

**٤/ شەرمەزاری ( الفضيحة ) :** هەرکەسێ بە نـاوی خـواوە درۆ بکـات، ئـەوا خـوای گـەورە لـە دونیـادا شـەرمەزاری دەکـات پێش قیامـەت، وە نمونـەی شـەرمەزاری ئەوەی بە سەر (مسيلمة الكذاب)دا هـات، فووی کردە چاوی کەسێکی نەخۆشـەوە کەچی چاوەکانی کوێر بوو .

## مەسەلەکان

**یەکەم :** بانگەواز بۆ لای خوا ڕێگای ئەو کەسانەیە شوێنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتوون (ڕێگای پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان).

**دووەم :** ئاگادارکردنەوە لەسەر ئیخلاص، چونکە زۆرێك هەن کاتێ بانگی خەڵکی دەکەن بۆ حەق، ئەو کات بانگی خەڵکی دەکەن بۆ لای خۆیان .

**سێیەم :** چاوڕوونی یەکێکە لە فەرزەکان ( بانگەواز فەرزە، جا زانیاری دەربارەی ئەویش فەرزە) .

**چوارەم :** لە بەڵگەکانی جوانی تەوحید پاك ڕاگرتنی خوای گەورەی تێدایە لە جوێندان .

**پێنجەم :** لە ناشرینی و نابوتی شیرك ئەوەیە کە جوێندانی خوای گەورەی تێدایە ( کەسی یەکخواپەرست خوای گەورە پاك ڕادەگرێت لە کەموکوڕی) .

**شەشەم :** ئەویش لە گرنگترینیانە دوور خستنەوەی کەسی موسڵمان لە موشریکەکان، بۆ ئەوەی نەبێتە یەکێك لەوان هەرچەندە شیرکیش ئەنجام نەدات (چونکە ئەگەر لە ناویاندا مایەوە، هەرچەندە شیرك ئەنجام نەدات بەڵام بە ڕواڵەت لە گەڵیاندایە).

**حەوتەم :** تەوحید یەکەم واجیبە لە واجیباتەکان .

**هەشتەم :** پێش هەموو شتێك دەست بە تەوحید دەکرێت، تەنانەت پێش نوێژیش .

**نۆیەم :** مانای : (أَنْ يُوَحِّدُوا اللهَ) مانای شایەتیدانی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ) یە .

**دەیەم :** ڕەنگە کەسێك لە ئەهلی کیتاب بێت کەچی شارەزای کیتابەکەی خۆی نەبێت، وە ڕەنگە شارەزای بێت بەڵام کاری پێ نەکات .

**یازدەیەم :** ورریاکردنەوە لەسەر فێرکردن بە شێوەی قۆناغ قۆناغ (تدريج) .

**دوازدەیەم :** دەست پێکردن بە گرنگترین ئەمجار گرنگترین ( یەکەم تەوحید، ئەمجار نوێژ، ئەمجار زەکات) .

**سیازدەیەم :** ئەوانەی زەکاتیان پیٚ دەشێت (هەشت کۆمەڵەکە).

**چواردەیەم :** روونکردنەوەو ئاشکراکردنی گومانەکان لە لایەن کەسی زاناوە بۆ کەسی فێرخواز (بە فێرکردن و لادان و نەهێشتنی نەفامی لەسەری) .

**پازدەیەم :** نەهیکردن لە بردنی سامانە جوان و چاکەکان.

**شازدەیەم :** خۆپارێزی لە دوعای کەسی ستەملێکراو .

**حەڤدەیەم :** هەواڵی پێداوین کە دوعا داناپۆشرێت ( رەد ناکرێتەوە) ( ترسان و هاندانی پێکەوە گرێداوە).

**هەژدەیەم :** لە بەڵگەکانی تەوحید ئەوەیە بە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گەورە پیاوچاکان و ئەولیاکاندا هات لە نارەحەتی و مەشەقەت و برسێتی و نەخۆشی ( لە چیرۆکی خەیبەرەوە وەردەگیرێت).

**نۆزدەیەم :** ئەوە فەرموودەیە : (لأعطين الراية) نیشانەیەکە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی .

**بیستەم :** هەروەها تفکردنی بە چاوەکانی نیشانەیەکە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی .

**بیست و یەکەم :** فەزڵی عەلی ( ئەمەش لە چاکەکانی ئەمیری ئیماندارانە) .

**بیست و دووەم :** فەزڵی هاوەڵان، لەوەدا دیارە ئەو شەوە هەموو سەرقاڵ بوون بەوەی : ئایە لەسەر دەستی کامیان موژدەی فەتحیان پیٚ دەدرێت .

**بیست و سێیەم :** باوەڕهێنان بە قەزا و قەدەر بەبەڵگەی ئەوەی کە کەسێك دەستی کەوت و هەوڵی بۆ نەدابوو وە نەیدا بە کەسانێك کە هەوڵیان بۆ دابوو .

**بیست و چوارەم :** بەڵگەی بوونی ئەدەب لە فەرموودەکەدا هەیە : (على رِسلِكَ) (فەرمانی پێکردن بە لەسەرخۆیی و پەلەنەکردن).

**بیست و پێنجەم :** بانگەوا بۆ ئیسلام پێش کوشتار .

**بیست و شەشەم :** ئەوا کارێکی شەرعییە تەنانەت بۆ ئەوانەی پێش ئەوە بانگ کرابێتن و کوشتاریانش لە گەڵدا کرابێت .

**بیست و حەوتەم :** بانگەواز بە حیکمەت دەبێت بە بەڵگەی ئـەو فەرموودەیـە : (أَخْبِرْهُمْ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ) (چونکە رەنگە ئیسلام جیّ بە جیّ بکات و رەنگە جیّ بـە جێـی نـەکات، بۆیە پێویستە پەیمانی لیّ وەربگیرێت تاوەکو نەگەڕێتەوە بۆ کوفر).

**بیست و هەشتەم :** زانینی حەقی خوای گەورە لە ئیسلامدا .

**بیست و نۆیەم :** پاداشتی ئـەو کەسـەی تـەنها یـەك پیـاو لەسـەر دەسـتی هیدایـەت دەدرێت . (باشترە لە هەموو ئەوانەی بە چاك و باش دادەنرێن لە دونیادا) .

**سییەم :** سوێند خواردن لە سەر فەتوا ( نابێت سوێندی لەسەر بخورێت ئیللا ئەگـەر هاتوو سوود و بەرژەوەندی تێدا بوو).

## تاقیکردنەوە لە بەشی یەکەم ( ٥ بەشە )

**پرسیاری یەکەم :** ناوی یەکەم پێنج بەش بنووسە لە کتێبی تەوحید و موناسەبەتی هەر بەشێك بە کتێبەکەوە :

| بەش | ناونیشانی بەشەکە | هۆی هێنانەوەی بەشەکە لە لایەن نوسەرەوە |
| --- | --- | --- |
| یەکەم | | |
| دووەم | | |
| سێیەم | | |
| چوارەم | | |
| پێنجەم | | |

**پرسیاری دووەم :** ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەرەوە :

١/ کتێبی تەوحید دەخوێنین لەبەر چەند هۆیەك لەوانە :

١/........................... ٢/.........................

٣/.......................... ٤/...................... ٥/ ...........................

٢/ نوسەر پێشەکی بۆ کتێبەکەی دانەناوە چونکە : ١/............................

٢/................................... ٣/.....................,......................

٣/ دەکرێت کتێبی تەوحید دابەش بکەینە چەند بەشێکەوە :

١/............................................. ٢/.............................

٣/......................... ٤/...................... ٥/..............................

٦/......................... ٧/....................... ٨/...........................

٩/......................... ١٠/.......................

٤/ وەڵامی ئەو کەسانە دەدەینەوە کە دەڵێن کتێبی تەوحید تەنها تەوحیدی خوداوەندێتی (الألوهية) ی تێدایە، بە بەشی: ...........................................

وە بەشی : ..............................................................................

٥/ پەرستن دابەش دەبێت بە :

١/ پەرستنی : ................. ئەویش بە مانای .................

بەڵگەش لەسەری ..................................................

٢/ پەرستنی : ................. ئەویش بە مانای .................

بەڵگەش لەسەری ..................................................

٣/ پەرستنی : ................. ئەویش بە مانای .................

بەڵگەش لەسەری ..................................................

٦/ ئەو نەفسەی کە خوای گەورە کوشتنی حەرام کردووە چوار دانەن :

١/.................. ٢/.................. ٣/................ ٤/..............

٧/ ئیبن مەسعود ئایەتەکەی ناوناوە وەصیێتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چونکە:........

٨/ ئوممەت لە قورئاندا واتە :............یان..........یان .......... یان ............

٩/ بەجیێ هێنانی تەوحید واتە : ........... لە..........و ..........و .......... دەبێت.

١٠/ ئەم ئوممەتە زۆرترین ئوممەتە لە رووی :.................. و ....................

١١/ سەلماندنی فەزڵی تایبەت مانای سەلماندنی فەزڵی ............................نییە.

١٢/ (لا رقية إلا من عين ) واتە : ..............................................

١٣/ نەهیکراوە لە روقیە و داخکردن کەچی رۆیشتن بۆ لای پزیشك –بۆ نمونە– نەهی لێ نەکراوە چونکە : .........................................................

١٤/ ﴿ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ ﴾ واتە : ................................

﴿ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ ﴾ واتە :............................................

١٥/ ﴿ وَكَلِمَتُهُۥ ﴾ واتە :................﴿ وَرُوحٞ مِّنۡهُ ﴾ واتە : ..............

١٦/ ئەوەی خوای گەورە داویەتییە پاڵ خۆی :

١/دانە پاڵی................ ئەویش لە جۆر و باسی دانەپاڵی ......................

٢/ دانە پاڵی................ ئەویش لە جۆر و باسی دانەپاڵی ......................

١٧/ فەرمووی : (عوکاشە پێشت کەوت ) تاوەکو .............. یان ..................

١٨ / ﴿ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ ﴾ واتە : ............... ﴿ بِظُلۡمٍ ﴾ واتە : ......................

١٩/ لە شیرك دەترسین بە ١/ ............................ ٢/...........................

٣/.................................... ٤/....................................

٢٠/ (يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ الله) واتــە :............................ ئەمــەش ســەلماندی صیفەتی ............................. تێدایە .

٢١/ مەرجەکانی بانگەواز :

١/ .............................. ٢/........................................

٣/..................................٤/........................٥/...................

٢٢/کارە نائاساییەکان:

١/ .......................بۆ ...............و ................. دەبێت .

٢/ .........................بۆ.............................. دەبێت .

٣/ ..........................بۆ ................................دەبێت .

٢٣/نوسەر فەرموویەتی : (وازهێنان لە روقیە و داخکردن لە جێ بە جێکردنی تەوحیدە) کەچی باسی رەشبینی بە شتەکانەوە (التطيُّر) ی نەکردووە، چونکە رەشبینی بە شتەکانەوە (التطيُّر) ...............................

**پرسیاری سێیەم :** ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە بەشەکانی روپامایی (ریا) پڕ بکەرەوە :

لە ئەصڵ و بنەمای پەرستندا : واتە : ..................................

لە ناکاودا : واتە :.............................................

......................................ئەمە زیانی نییە و پەرستنەکەش تەواوە .

...................................... ئەمە وردەکاری تێدایە .

........................................حوکمەکەی...........................

........................................حوکمەکەی ..........................

لە پاش لێبوونەوە لە پەرستنەکە : ............................................

**پرسیار چوارەم :** نیشانەی (×) لە بۆشایی گونجاودا دابنێ یان دەستەواژەکە تەواو بکە :

١. نوسەری کتێبی تەوحید : ابن عثيمين محمد بن عبدالوهاب التميمي .

٢. ئامۆژگاری زانایان : لەبەرکردنی دەقەکە پێش خوێندنەوەی هیچ سوودێك لە لەبەرکردنیدا نییە گرنگ تێگەیشتنە

٣. ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ ﴾ سوودی ئەوەی لێ دەبینرێت کەوا قوتابی واز لە زانستێك ناهێنێت تاوەکو بە تەواوی لێی تێنەگات :

**راستە هەڵەیە**

٤. زانایان بە دواداچوونیان کردووە بۆ کتێبی تەوحید کەچی هیچ فەرموودەیەکی (منکر)یان تێدا نەبینیوە:

**راستە هەڵەیە**

٥. زانایان هەرچەندە زانستیان فراوان بێت ئەوا عیصمەتیان بۆ ناسەلمێنین : راستە هەڵەیە.

٦. لە نوسینەکانی (محمد بن عبدالوهاب) :

كشف الشبهات مسائل الجاهلية مختصر السيرة أصول الإيمان

هەموو ئەوانەی باسکرا .

٧. بەشەکانی کتێبی تەوحید : ٦٧ بەشە ٧٦ بەشە ١٠ بەشە

٨. ئەگەر کتێبێکت دەستکەوت ئەوا یەکسەر مەیخەرە نێو کتێبخانەکەتەوە تاوەکو بە سەر بابەتەکانیدا تێدەپەڕیت یان خوێندنەوەی پێشەکییەکەی و ناوەڕۆکەکەی و چەند بابەتێکی : **راستە هەڵەیە**

٩. دەکرێ کتێبی تەوحید دابەش بکرێتە : ١١ بەشەوە ٩ بەشەوە ١٠ بەشەوە

١٠. سوودبەخشترین کتێب ئەو کتێبانەیە کە دارێژراوە لە سەر ڕێگاو شێوازی بەڵگە هێنانەوە، وە تێگەیشتن لە هۆکارەکان و ئەحکامەکان و چوونە نێو نهێنی مەسەلەکان وەکو کتێبی تەوحید : **راستە هەڵەیە**

١١. زانست بریتییە لە کۆکرنەوە و جیاکردنەوە و بەدواداچوون و دابەشکردن :

**راستە هەڵەیە**

١٢. پێویستە ئەو پێناسانەی کراون لە لایەن زانایان و دابەشکردنیان و جیاوازییەکانیان زەبت بکرێن : **راستە** **هەڵەیە**

١٣. بەشی یەکەم لە کتێبی تەوحید بریتییە لە :

پێشەکی تەفسیری تەوحید واجیب بوونی تەوحید

١٤. نوسەر –رەحمەتی خوای لێ بێت – چاوی لە بوخاری کردووە لە پێشەکی و کۆتاییدا : **راستە** **هەڵەیە**

١٥. بۆ بەشی یەکەم نوسەر هیچ ناونیشانێکی دانەناوە، دەتوانین ناوی لێ بنێین : پێشەکی : **راستە** **هەڵەیە**

١٦. بەشی یەکەم لە کتێبەکە چەند بەش لە خۆ دەگرێت ؟ ٥ بەش ٦ بەش ٧ بەش

١٧. تەوحید دابەش دەبێتە : پەروەردگارێتی و خوداوەندێتی و ناو و صیفاتەکان

ناسین و سەلماندن و ئیرادە و مەبەست

هەموو ئەوانەی باسکرا هیچ جیاوازی نییە

١٨. هەرکەسێ باوەڕ بە یەکێ لە جۆرەکانی تەوحید بکات بە بێ ئەوانی تر ئەوا کەسێکی (مُوَحِّد)نییە : **راستە** **هەڵەیە**

١٩. دابەش کردنی تەوحید بۆ ئەو بەشانە یەکێکە لە بیدعەکان لەبەر نەبوونی بەڵگە :

**راستە** **هەڵەیە**

٢٠. پەیوەندی تەوحید بە ئیمانەوە ئەوەیە کەوا ئیمان گشتییە و تەوحید بەشێکە لەو :

**راستە** **هەڵەیە**

٢١. شایەتیدانی (لا إله إلا الله) چەند روکنی هەیە ؟

دوو روکن هەشت روکن حەوت روکن

٢٢. بە تاکدانانی خوای گەورە لە بەڕێوەبردنی گەردوون و باران بارین بریتییە لە تەوحید: خوداوەندێتی پەروەردگارێتی ناو و صیفاتەکان

٢٣. ئەوەی نەفی ئەصڵ و بنەمای تەوحید دەکات :

شیرکی گەورە شیرکی بچووک بیدعەکان

٢٤. واجیبترین واجیباتەکان بریتییە لە چاکەکردنی لە گەڵ دایك و باوکدا :

**ڕاستە** **هەڵەیە**

٢٥. مەزنترین حەرامکراوەکان زینا و کوشتنی ئەو نەفسەی خوای گەورە حەرامی کردووە: **ڕاستە** **هەڵەیە**

٢٦. پەرستن بۆ چەند مانا بە کار دەهێنرێت ؟ دوو شت تەنها یەك شت

٢٧. پەرستن بریتییە لە: ( ناوێکی کۆکراوەیە بۆ هەموو ئەوەی ... ) ئەمە قسەی کێیە؟:

ابن القیم ابن تیمیة

٢٨. قسەی راست و دروست ئەوەی بڵێین: ( بە بێ... ) :

چۆنییەتی و لێکچواندن چۆنییەتی و شوبهاندن هیچ جیاوازی نییە

٢٩. هەموو ئایەتێك لە قورئاندا تەوحید لە خۆ دەگرێت : ڕاستە هەڵەیە .

٣٠. مەبەست لە دروستکردنی جنۆکە و مرۆڤەکان هەروەکو مەبەستی دروستکردنی ئاژەڵەکانە : **ڕاستە** **هەڵەیە**

٣١. ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ کێشەکە زۆر جار لە چیدا روو دەدات : تێگەیشتن کارکردن

٣٢. جنۆکە تەکلیفیان لێ کراوە : بە ئیمان بە ئیمان و شەریعەتەکان

٣٣. ئوممەت بۆ چی مانایەك بە کار دێت؟

پێشەوا میللەت سەردەم تاقم هەموو ئەوانەی باسکرا

٣٤. ﴿ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا ﴾

لە سەردەمی ( ئادەمەوە نووحەوە) تاکو سەردەمی ( عیسا محمد)

وە حیکمەت لە رەوانەکردنی پێغەمبەران : ( ئیقامەتو لحوججە بەزەیی و رەحمەت ڕوونکردنەوەی ڕێگایە بۆ لای خوای گەورە هەموو ئەوانەی باسکرا).

٣٥. بتەکان یەکێکن لەو تاغوتانەی کە لە جگە لە خوا دەپەرسترێن :

**ڕاستە** **هەڵەیە**

٣٦.شوێنکەوتەکراو لە تاغوتەکان وەکو ئەو دەسەڵاتدارانەی لە گوێڕایەڵی خوا دەرچوون: راستە هەڵەیە

٣٧.هەرکەسێ جگە لە خوا بپەرسترێت و خۆی رازی نەبێت ئەوا: تاغوتە تاغوت نییە

٣٨.ئایەتی دووەم لە کتێبی تەوحید بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەموو پێغەمبەران کۆدەنگن لەسەر بانگەواز بۆ تەوحید :

راستە هەڵەیە

٣٩.مەبەستی نوسەر : (ئایەت یان ئایەتەکان ) واتە : (ئایەت یان ئایەتەکان تەواو بکە):

راستە هەڵەیە .

٤٠. قەزا و حوکم و ئیرادە و دابەش دەبێتە شەرعی و گەردوونی (کەونی) :

راستە هەڵەیە

٤١. هەر لە جۆری قەزا ( گەردوونی شەرعی) ئەوەیە کە لای خوای گەورە خۆشەویستە لە رووبەکەوە و مەکروهە لە روویەکی ترەوە .

٤٢. ﴿ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾

قەزایەکی : شەرعی یە گەردوونی یە

٤٣.هەموو گیانداران تەسبیحاتی خوای گەورە دەکەن تەنها مارمێلك نەبێت :

راستە هەڵەیە

٤٤. پەرستن دابەش دەبێتە (دوو بەشەوە سێ بەشەوە)، وە تەسبیحات کردنی باڵندەکان پەرستنی (زاڵبوونە گوێڕایەڵییە).

٤٥. موشریکەکان پشکێکیان دەست دەکەوێت لە خواپەرستیەکەیاندا :

راستە هەڵەیە

٤٦.پەرستن بە هیچ شتێك نابێت تەنها بە زمان و ئەندامەکان دەبێت :

راستە هەڵەیە

٤٧. ﴿ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِۦ شَيْـًٔا ﴾ هەموو شتێك دەگرێتەوە : نە هیچ پێغەمبەرێك ونەهیچ فریشتەیەك و نە هیچ وەلییەك بەڵکو هیچ کارێك لە کاروباری دونیا : **راستە** **هەڵەیە**

٤٨. موژدەدان بریتییە لە هەواڵدان بەوەی خاوەنەکەی دڵخۆش دەکات، نەك ئەو هەواڵانەی زەرەر دەگەیەنێت : **راستە** **هەڵەیە**

٤٩. ئەو نەفسەی خوای گەورە حەرامی کردووە نەفسی پارێزراوەکەیە کە ئەویش نەفسی:

موسڵمان زیممی موعاهید موستەئمین هەموو ئەوانەی باسکرا

٥٠. ئایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەصێتی کردووە ؟ **بەڵێ** **نەخیر**

٥١. ئەو قسەیەی ئیبن مەسعود کە دەفەرموێت : ئەمە وەصێتەکەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، چونکە :

هەموو دین دەگرێتەوە وەصێتی خوایە هەموو ئەوەی باسکرا

٥٢. حەقی بەندەکان لەسەر خوا پێی دەگوترێت : حەقی واجیب حەقی فەزڵ

٥٣. (خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) زاناترە) دەگوترێت لە کاتی :

لە ژیانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە هەموو کاتێکدا

٥٤. پێغەمبەری خوا (ﷺ)نەهی کرد (معاذ) موژدە بە خەڵکی بدات نەوەك : (پێشبڕکێ بکەن پشت بکەنەوە و واز لە عیبادەت بهێنن هەموو ئەوانەی باسکرا ) وە (معاذ) موخالەفەی ئەو نەهییەی کرد ؟ (بەڵێ نەخێر) چونکە شاردنەوەی زانست بە هەموو شێوەیەك حەرامە : **راستە** **هەڵەیە**

٥٥. ئایە ئەم حوکمە تایبەتە بە (معاذ)ەوە ؟ **بەڵێ** **نەخێر**

٥٦. لە سەلماندنی فەزڵی هەر شتێکدا بەڵگەیە کەوا واجیب نەبێت : **راستە** **هەڵەیە** .

٥٧. ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ لە گەڵ کام بەشدا بە تەواوەتی دەگونجێت ؟ ٢ ٥ ٤

٥٨.ئەوەی خوای گەورە داویەتییە پاڵ خۆی دابەش دەبێتە :

دوو بەشەوە سێ بەشەوە

٥٩. مەزنترین ستەم ستەمی مرۆڤە لە جگە لە خۆی بیکات لە نەفسیدا یان لە سامانیدا یان لە ناموسیدا : **راستە** **هەڵەیە**

٦٠. دەرئەنجامی ئەو کەسەی دەگاتە خواکەی خۆی لە کاتێکدا سوورە لە سەر تاوانەکان جگە لە شیرك : سزای دەدات دەکەوێتە ژێر ویستی خوای گەورەوە

٦١. (لا إله الا الله) زیکرە و دوعا نییە : **راستە** **هەڵەیە**

٦٢.خەڵکانێك هەن دەڵێن : (لا إله الا الله) بەلام لای خوای گەورە هیچ سەنگێکیان نییە:

**راستە** **هەڵەیە**

٦٣.شایەتیدانی (محمداً عبده ورسوله) چی پووچەڵ دەکاتەوە ؟

ئەنجامدانی سەرپێچی داهێنانی بیدعە هەموو ئەوانەی باسکرا.

٦٤.دەستەواژەی : (عیسی عبدالله) وەلامی جولەکەیە و (ورسوله) وەلامی گاورەکانە :

**راستە** **هەڵەیە**

٦٥.﴿ وَرُوحٌ مِّنْهُ ۖ ﴾ ئەمە دانەپالی : زاتەکانە صیفەتەکانە

٦٦. خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە :

خستنێکی تەواو و کامل خستنێکی کەموکورت هەموو ئەوەی باسکرا

٦٧. جیٚ بە جێکردنی تەوحید بریتییە لە پاڵفتەکردنی لە :

شیرك بیدعە سەرپێچی هەموو ئەوی باسکرا

٦٨. ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً ﴿١٢٠﴾ ﴾ واتە :

پێشەنگ پێشەوا مامۆستای خەیر و چاکە هەموو ئەوانەی باسکرا

٦٩.دروست نییە روقیەی بکرێت بۆ نەخۆشی هەستپێکراو و مەعنەوی ئیللا چاو و پێوەدان نەبێت : **راستە** **هەڵەیە**

٧٠. لە فەرموودەی : (لا يسترقون) ئیمامی موسلیم ئەم دەستەواژەی بۆ زیاد کردووە (ولا يرقون) جا ئەم زیادەیە : (صحيح)ە (ضعيف)ە

٧١. شیرکی گەورە خوێن و ماڵی خاوەنەکەی حەڵاڵ دەکات ئیللا مەگەر کەسەکە زیممی بێت یان موعاهید بێت : **راستە** **هەڵەیە**

٧٢.جیاوازی نێوان (الراقي) و (المسترقي) ئەوەیە کەوا کەسی (المسترقي) داواکارە و داوای بەخشین دەکات و روو دەکاتە جگە خوای گەورە بە دڵی، بەڵام کەسی (الراقي) ئەوا کەسێکی چاکەکارە : **راستە** **هەڵەیە**

٧٣.هاوتاکردنی جگە لە خوا لە گەڵ خوادا لە شتێکدا کە لە تایبەتمەندییەکانی خوایە ئەوا شیرکی : گەورەیە بچووکە

٧٤.ئەو شتەی تاشراوبێت لە سەر شێوەی وێنەیەك پێی دەڵێن :

صنم وثن هەموو ئەوەی باسکرا

٧٥. (كرائم الأموال) واتە : باشترینەکانی ناوەراستەکانی کەمترینەکانی.

٧٦. بەزانست و کردار بەندە خۆی کامل دەکات و بەبانگەوازو ئارامگرتن جگە لەخۆی کامل دەکات: **راستە** **هەڵەیە**

٧٧. پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێندە لە ریا دەترسا تووشی ئوممەتەکەی ببێت زیاتر لە هاتنی دەججال، چونکە ئەوە شیرکی بچووکە : **راستە** **هەڵەیە**

٧٨. بەندە ئەگەر راستگۆ بێت لە باوەڕەکەیدا، ئەوا پێویستە بانگەوازی بۆ بکات : **راستە** **هەڵەیە** .

٧٩. (البصيرة) بریتییە لە : زانستی شەرعی حیکمەت زانینی حاڵی ئەو کەسەی بانگی دەکات هەموو ئەوەی باسکرا

٨٠. مەرجەکانی بانگەواز چەندن ؟ پێنج چوار سێ

٨١.جیاوازی لە نێوان شیرکی گەورە و شیرکی بچووك بنووسە :

...............................................................................................................

...............................................................................................................

...............................................................................................................

...............................................................................................................

...............................................................................................................

...............................................................................................................

...............................................................................................................

...............................................................................................................

...............................................................................................................

...............................................................................................................

**پرسیاری پێنجەم :** بۆشاییەکانی خوارەوە بەم وشانە پڕ بکەرەوە :

((الحُمة ، الألوهية ، العبادة ، الخوارج ، الطاغوت ، الرياء ، التطيُّر ، الندُّ ، الصنم ، التوحيد ، العبادة ، الوثن ، الربوبية ، حُمر النَّعَم ، حنيفاً))

١. ..........................زەلیلی نواندن بۆ خوا بە ئەنجامدانی فەرمانەکانی ودوورکەوتنەوە لە نەهییەکانی لەبەر خۆشەویستی و بە مەزن زانین .

٢. ............................وشتری سوور , ناوی هێناوە چونکە لای عەرەب شتێکی زۆر باشەو حەزی لێ دکەن.

٣. ............................رەشبینی بە بینینی شتێك یان بیستنی شتێك یان شتێکی زانراو لە شوێن و کات .

٤. ..................................بریتییە لە هاوشێوە و لێکچوو و هاوتا.

٥. ................ئەوەی دەپرسترێت لە سەر شێوەی مرۆڤ یان جگە لە مرۆڤ .

٦. .............ئەوەی لە جگە لە خوا دەپەرسترێت لە سەر هەر شێوەیەك بێت.

٧. ........................هەرچی شتێك بەندە لە سنووری خۆی پێی دەرچێت لە پەرستراو وشوێنکەوتەکراو گوێڕایەڵکراو .

٨. ........................خوای گەورە دەپەرستێت بۆ ئەوەی خەڵکی بیبینێ یان ناوبانگی ببیسن و مەدحی بکەن .

٩. ........................بە تاکدانانی خوای گەورە لە دروستکردن ومولْك و بەڕێوەبردندا.

١٠. ........................بە تاکدانانی خوای گەورە لە پەرستندا . یان بە کرداری بەندەکان.

١١. ........................ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەوەی خوای گەورە خۆشی دەوێت و پێی رازییە لە کردەوە و گفتارەکان .

١٢. ........................ئەوانەن کە دەڵێن : ئەوەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدات کافرە و تا هەتایە لە ئاگردایە .

١٣. ........................بە تاکدانانی خوا بەوەی تایبەتە بە خۆیەوە لە پەروەردگارێتی و خوداوەندێتی و ناو و صیفاتەکان

١٤. ........................روو دەکاتە خواو پشت لە شیرك دەکات , دوور دەکەوێتەوە لە هەموو ئەوەی جیاوازە لە گەڵیدا

١٥. ........................بریتییە لە پێوەدانی هەموو ژەهردارێك.

## دووەم : تەفسیری تەوحید ( ٩ بەشە )

### ٦/ بەشی تەفسیری تەوحید و شایەتیدانی ( لا اله الا الله ).

لە پاش باسکردنی تەوحید، وەکو ئەوەی نەفسەکان تامەزرۆی ئەوە بن کە ئاخۆ ئەو تەوحیدە چییە کە ئەم بەشانەی بۆ داناوە؟ (واجیب بوونی تەوحید و فەزڵی و باسی جێبەجێکردنی و ترس لە دژەکەی و بانگەوازکردن بۆی) ئێستا بەم بەشە وەڵامی دەداتەوە، ئەویش روونکردنەوەی تەوحیدە تاوەکو کۆتایی کتێبەکە .

### بەڵگەی یەکەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ ﴿٥٧﴾ ﴾ الآية.

(يَدۡعُونَ) : ئەوانەی کە داوایان لێ دەکرێت، خۆیان هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی خۆیان لە خوای گەورە نزیك بکەنەوە، کامیان دەتوانێت زیاتر خۆ نزیك بکاتەوە، ئایە ئێوە چۆن داوایان لێ دەکەن لە کاتێکدا خۆیان پێویستیان هەیەو هەژارن (شیرك لە دوعادا).

### بەڵگەی دووەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي ﴿٢٧﴾ ﴾ الآية

- ﴿إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي﴾ : لە نێوان نەفیکردن و سەلماندا کۆی کردووەتەوە، وە نەیفەرموو (إلا الله) لەبەر دوو سوود :

١/ بۆ روونکردنەوەی هۆکاری بە تاکدانانی خوا لە پەرستندا، چونکە ئەو کەسەی تەنهایە لە دروستکردندا پێویستە بە تەنها دابنرێت لە پەرستندا.

٢/ بۆ روونکردنەوەی پووچەڵی پەرستنی بتەکان، چونکە ئەوانە ئێوەیان درووست نەکردووە تاوەکو بیانپەرستن.

- تەوحید جیٚ بە جیٚ نابێت بە پەرستنی خوای گەورە لە گەڵ جگە لە خۆیدا، بەڵکو پێویستە ئیخلاص هەبێت بۆ خوای تاك و تەنها، وە لە هەندیٚ لە وڵاتانی ئیسلامی کەسانێك هەن نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و رووژوو دەگرن و حەج دەکەن، کەچی لە گەڵ ئەوەشدا سوژدە بۆ گۆڕەکان دەبەن .

**بەڵگەی سێیەم و چوارەم :**

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴿٣١﴾ ﴾ الآية.

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ ﴿١٦٥﴾ ﴾ الآية.

- (أَحۡبَارَهُمۡ) : زاناکانیان، هەروەها بە زاناش دەگوترێت (بحر) دەریا لەبەر زۆری زانستەکەی .
- (وَرُهۡبَٰنَهُمۡ) : خواپەرستەکانیان .
- (أَرۡبَابٗا) : گوێڕایەڵی زاناکان بوون لەسەرپێچی خوای گەورەدا، وە قەشەکانیان پەرست ( شیرکی گوێڕایەڵی).
- (يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ ) : واتە : ئەو هاوشێوەکانیان خۆش دەوێت بە ئەندازەی خۆشەویستی خوای گەورە .

## بەشەکانی خۆشەویستی :

**خۆشەویستی لە گەڵ خوادا :** (شیرکی گەورەیە)، لە گەڵ خۆشەویستی خوادا یەك ناگرێتەوە، وەکو خۆشویستنی جگە لە خوا بە ئەندازەی خوا یان زیاتر .

**خۆشەویستی بۆ خوا یان لەبەر خوا :** ئەمە (واجیبە) : (أوثقُ عُرى الإيمان الحبُّ في الله ....).

**خۆشەویستی ئاسایی :** (دروستە) بە مەرجێ پێش خۆشەویستی خوای نەخات، وەکو خۆشویستنی منداڵ و خێزان .

هەروەها خۆشەویستی لەبەر خوا دابەش دەبێتە :

خۆشەویستی کار و خۆشەویستی بکەر و خۆشەویستی کات وخۆشەویستی شوێن .

## بەڵگەی پێنجەم :

لە کتێبی (صحیح) دا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەوا فەرموویەتی : (مَنْ قالَ : لاَ إله إلاَّ الله وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ الله حَرُمَ مَالُهُ وَدَمُهُ وَحِسَابُهُ عَلَى الله عَزَّوَجَلّ) واتە : هەرکەسێ بڵێت : (لا اله الا الله) و بێباوەڕبوو بەوەی لە جگە لە خوا دەپەرسترێت، ئەوا ماڵ و خوێن و حەرام دەبێت و لێپرسینەوەی لای خوایە ).

وە راڤەی ئەم ناونیشانە : بەشەکانی پاش ئەوە.

- (وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ) : پێویستە کوفر بکەیت بە پەرستنی ئەوەی لە جگە لە خوا دەپەرسترێت، بەڵکو بێباوەڕ بێت بە هەموو کوفرێك، جا هەرکەسێ شایەتمان بهێنێ و وا ببینێ گاورەکان و جولەکەکانی ئەمڕۆ لەسەر دینی راستن، ئەوا کەسێکی موسڵمان نییە، هەروەها هەرکەسێ وا ببینێ دینەکان بیرۆکەن ئەوەی بیەوێ بە ویستی خۆی هەڵیدەبژێرێ، ئەوا کەسێکی موسڵمان نییە

## مەسەلەکان :

گەورەترین و گرنگترین مەسەلەی تێدایە : ئەویش : تەفسیری تەوحید و تەفسیری شایەتیدان (شەهادەت) و بە چەند کارێکی روون روونی کردەوە ( پێویستە نەفی و سەلماندنی تێدا بێت) .

لەوانە : ئایەتەکەی سورەتی (الاسراء)، وەڵامی موشریکەکانی تێدا داوەتەوە ئەوانەی داوا لە پیاوچاکان دەکەن، جا ئەوەی روون کردووەتەوە کەوا ئەم کارە شیرکی گەورەیە (شیرك لە داواکردندا) .

وە لەوانە : ئایەتەکەی سورەتی (براءة) ئەوەی تێدا روون کردووەتەوە کەوا ئەهلی کیتاب قەشە و زاناکانیان کردووەتەوە خوداو لە جگە لە خوا (دەیانپەرستن)، وە ئەوەشی روون کردووەتەوە هیچ فەرمانێکیان پێنەکراوە تەنها ئەوە نەبێت خوای تاك تەنها بپەرستن، لە گەڵ ئەوەشدا ئەو تەفسیرەی کە گومانی تێدا نییە : گوێڕایەڵی زانایان و خواپەرستان لە سەرپێچیدا، نەك داواکردن لە خۆیان (شیرکی گوێڕایەڵی) .

وە هەر لەوانە : ئەو قسەیەی ئیبراهیم کە بە بێباوەڕانی فەرموو : ﴿ إِنَّنِي بَرَآءٌ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ ۝٢٦ إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي ۝٢٧ ﴾ جا لە پەرستراوەکان خوای گەورەی بە دەرهێنا، ئەمجار خوای گەورە ئەوەی روون کردووەتەوە کەوا ئەم بەرائەتە و ئەم دۆستایەتییە بریتییە لە تەفسیری : شایەتیدانی (لا اله الا الله) بۆیە دەفەرموێت : ﴿ وَجَعَلَهَا كَلِمَةَۢ بَاقِيَةٗ فِي عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ۝٢٨ ﴾ وە هەر لەوانە : ئایەتەکەی سورەتی (البقرة) دەربارەی بێباوەڕان ئەوانەی خوای گەورە دەربارەیان فەرموویەتی : ﴿ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ۝١٦٧ ﴾ باسی ئەوەی کردووە کەوا ئەوان هاوبەشەکانیان خۆش دەوێت وەکو خۆشویستنی خوای گەورە، ئەمەش بەڵگەیە کەوا ئەوان خوای گەورەیان بە خۆشەویستییەکی مەزن

خۆش دەوێت کەچی ئەو خۆشەویستییە نەیانهێناوە ناو ئیسلامەوە، ئەی چۆنە ئەگەر کەسێك هاوشێوەکەی لە خوای گەورە زیاتر خۆش بوێت ؟ ئەی چۆنە ئەگەر کەسێك تەنها هاوشێوەکەی خۆش بوێت و خوای گەورەی خۆش نەوێت ؟ (شیرکی خۆشەویستی) .

کەواتە چوار بەشە :

١. خوای گەورەی لە هەموو شتێك زیاتر خۆش بوێت، ئەمەش تەوحیدە .
٢. جگە لە خوای گەورەی وەکو خوای گەورەی خۆش بوێت، ئەمەش شیرکە .
٣. جگە لە خوای زیاتر خۆش بوێت لە خوای گەورە، ئەمەش لەوەی پێشی گەورەتر و مەزنترە.
٤. جگە لە خوای گەورەی خۆش بوێت و بە هیچ شێوەیەك لە دڵیدا خۆشەویستی خوا نەبێت، ئەمەش گەورەتر و سەختترە.

وە هەر لەوانە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە دەفەرموێت : ((مَنْ قالَ : لاَ إلـه إلاَّ الله وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ الله حَرُمَ مَالُهُ وَدَمُهُ وَحِسَابُهُ عَلَى الله عَزَّوَجَلَّ)) ئەمەش مەزنترین شتە مانای (لا اله الا الله) روون بکاتەوە، ئەوەتا تەنها وتن بە زمانی نەکردووەتە پارێزەرێك بۆ خوێنەکەی و سامانەکەی، بەڵکو زانینی ماناکەی لە گەڵ وتنیدا، بەڵکو دانپیانانش پێیدا، بەڵکو ئەوەیش کە تەنها داوا لە کەس ناکات تەنها لە خوای گەورە نەبێت کە تەنهایە و بێ شەریکە، بەڵکو ماڵ و خوێنی حەرام نابێت تاوەکو کوفر دەکات بەوەی لە جگە لە خوای گەورە دەپەرسترێت، جا ئەگەر گومانی بوو یان راوەستا ئەوا خوێن و ماڵی حەرام نابێ.

تەماشاکە چی مەسەلەیەکی گرنگە ! چەند مەزن و بە شکۆیە ! وە چەند بە جوانی روونی کردووەتەوە ! وە چی بەڵگەیەکە کە قسەی نەیاران ناهێڵێ و دەیبڕێت !

## ٧/ بەشی : هەر لە جۆری شیرك لەبەرکردنی ئەڵقە و دەزوو و نمونەی ئەوانە بە مەبەستی لادان و دوورخستنەوە بەڵا .

- (من الشرك) : واتە : هەندێ لە شیرك، وە لەوانە یان گەورەیە و یان بچووکە، بۆیە بە رەهایی باسی کردووە.
- (لرفع البلاء) لادانی لە پاش تووش بوونی، (أو دفعه) دوورخستنەوەی پێش تووشبوونی .

### ئایە لەبەرکردنی ئەڵقە و دەزوو شیرکی بچووکە یان گەورەیە ؟

| شیرکی گەورەیە | شیرکی بچووکە |
| --- | --- |
| **شیرکی گەورەیە** : ئەگەر باوەڕی وابوو کەوا لە خودی خۆیدا کاریگەری هەیە، وە بە دەستهێنانی قازانج و دوورخستنەوەی زیانی بە دەستە . | **شیرکی بچووکە** : ئەگەر باوەڕی وابوو کەوا هۆکارە لە گەڵ ئەوەیشدا خوای گەورە نەیکردووەتە هۆکار نە هۆکاری هەستپێکراو و نە هۆکاری شەرعی . |

### بەشەکانی خەڵکی لەباوەڕبوون بە هۆکارەکان سێ بەشن :

| ڕاست و دروست | شیرکی بچووك | شیرکی گەورە |
| --- | --- | --- |
| **ڕاست و دروست** : باوەڕی وابێت و ئەوەی خوای گەورە کردوویەتیە هۆکار ئەمیش بیکاتە هۆکار، وە هۆکارەکانیش یان هەستپێکراون (وەکو دەواو دەرمان) وە یان شەرعین (وەکو ڕوقیە) . | **شیرکی بچووك** : باوەڕی وابێت و ئەوەی خوای گەورە نەیکردووەتە هۆکار ئەم بیکاتە هۆکار، وەکو هەڵواسینی سەری گا بە مەبەستی دوورخستنەوەی چاو (چاوەزار)، لە کاتێکدا ئەوە هۆکار نییە . | **شیرکی گەورە** : باوەڕی وابێت کە لە خودی خۆیدا کاریگەری هەیە و بە دەستهێنانی قازانج و دوورخستنەوەی زەرەری بەدەستە . |

**خەڵکی لە گرتنە بەری هۆکارەکان بوونەتە دوو لایەن و ناوەڕاستەوە :**




**حوکمی ئەو کەسەی دەزوویەك یان نمونەی ئەوانە هەڵدەواسێت و حاڵەتەکانی :**

| حاڵەت | حوکم |
|---|---|
| کەسێك حوکمەکەی نەزانێت : | ئەوا ئەم کەسە فێر دەکرێت |
| باوەڕی وابێت کە هۆکارە، لە کاتێکدا خوای گەورە نەیکردووەتە هۆکار : | ئەمە شیرکی بچووکە |
| باوەڕی وابێت کەوا کاریگەریان هەیە لە خودی خۆیاندا و بە دەستهێنانی قازانج و دوورخستنەوەی زەرەریان بە دەستە : | ئەمە شیرکی گەورەیە |
| هیچ باوەڕێکی پێ نەبێت بەڵام لەبەری دەکات بۆ جوانی وەکو حاڵی هەندێ لە گەنجان – خوای گەورە هیدایەتی ئێمە و ئەوان بداتلج جا هەرکەسێك ئەم هەڵواسینەی بینی وا دەزانێت دروستە، ئا بەم شێوە دەرگای خراپەکاری لەسەر خەڵکی کردووەتەوە، هەروەها لەیەکچواندی ئافرەتان و موشریکەکانی تێدایە : | ئەم کارە تاوانێکی گەورەیە لە تاوانە گەورەکان |

## بەڵگەی یەکەم :

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت : ﴿ قُلۡ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنۡ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلۡ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ ﴿٣٨﴾ ﴾ الآية.

- ئەم بتانە هیچ سوودێك بە خاوەنەکانیان ناگەیەنێت، نە لە بە دەستهێنانی قازانج و نە دوور خستنەوەی زیانەکان، جا ئەوانە هۆکار نین بۆ دەستکەوتنی ئەو کارە، جا لەسەر ئەم شتانە هەموو ئەوانەی تر (قیاس) دەکرێت کە هۆکاری شەرعی و قەدەری نین، جا ئەگەر ئەوانە بکرێنە هۆکار ئەوا کراونەتە شەریك لە گەڵ خوای گەورەدا .
- ﴿ قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا هەموو کارەکانی بداتە دەستی خوای گەورە نەك هۆکارە خەیاڵاوییەکان.

## بەڵگەی دووەم :

عن عِمْرَانُ بن حُصَيْنٍ : أن النبي (ﷺ) رأى رجلاً في يده حَلْقَةٌ من صُفْرٍ فقال : ما هذه؟ قال : مِنَ الْوَاهِنَةِ .فقال: انزعها فإنها لاَ تَزِيدُكَ الا وَهْناً. فَإِنَّكَ لو مِتَّ وَهِيَ عَلَيْكَ ما أَفْلَحْتَ أَبَداً )) (رواه أحمد بسندٍ لا بأس به.) لە (عمران)ی کوڕی (حصین)ەوە ریوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) کابرایەکی بینی ئەڵقەیەکی مسی لە دەست کردبوو، فەرمووی : ئەمە چییە ؟ کابرا وتی : لەبەر نەخۆشی (باداری)یە . فەرمووی : لایبە چونکە ئەوە تەنها (باداری)ت بۆ زیاد دەکات، جا ئەگەر بمریت، لە کاتێکدا بمریت ئەوەت لەسەر بێت (لای نەبەیت) ئەوا هەرگیز رزگارت نابێ ).

- (حَلْقَةً من صُفْرٍ) : ئەڵقەیەکە لە مس و نمونەی ئەوانە دروست دەکرێت، هەرچەندە ئاسنیش بێت یان دەزوو بێت .
- (ما هذه؟) : بۆ دڵنیابوون پێش ئینکاری کردن، چونکە رەنگە گومان ببەیت شتێك مونکەر بێت کەچی مونکەر نەبێت .
- (الْوَاهِنَةِ) : نەخۆشییەکە تووشی ئێسکەکان دەبێت وەکو (رۆماتیزم)، وە مەبەست لێی : ئەم نەخۆشییەی لێ دوور بخاتەوە و بیپارێزێ .
- (لاَ تَزِيدُكَ الا وَهْناً) : واتە : لاوازی لە جەستە و بیروباوەڕدا، وە سزاش لە جۆری کارەکە دەبێت .

**بەڵگەی سێیەم :**

لە (عقبة)ی کوڕی (عامر)ەوە ریوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((من تعلَّق تميمة فلا أتمّ الله له ومن تعلَّق ودعة فلا ودع الله له)) واتە : هەرکەسێك چاوەزارێك هەڵواسێت خوای گەورە –کارەکانی– بۆ تەواو نەکات وە هەرکەسێك هێلکە شەیتانۆکە (ودعة) هەڵواسێ، ئەوەی ئەو لێی دەترسێت خوا لەسەری سووکی نەکات (لە ئارامی و دڵنیاییدا نەبێت) . وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە : ((من تعلَّق تميمة فقد أشرك)) واتە : هەرکەسێ چاوەزارێك هەڵواسێت (یان هەر شتێك هەڵواسێت بە گومانی ئەوەی حەسوودی رەت دەکاتەوە) ئەوا شیرکی کردووە .

- (من تعلَّق تميمة) : هەڵیواسیوە و دڵیشی پێوە پەیوەست کردووە، بۆیە فەرمووی : (تعلَّق) وە نەیفەرموو : (علَّق)
- (فلا أتمّ الله له) : یان ئەمە دوعایەکە لێی دەکات، وە یان هەواڵێکە دەربارەی داویەتی .

- **(ومن تعلَّق ودعة) :** چەند شتێکن لە دەریاکان دەردەهێنرێن وەکو صەدەفەکان (هێلکە شەیتانۆکە) .
- **(فلا ودع الله له) :** خوای گەورە لە ئارامیدا نەیهێڵێ، بۆیە بە پێچەوانەی نیەتەکەیەوە مامەڵەی لە گەڵدا کراوە .
- **(فقد أشرك) :** شیرکی گەورەیە: ئەگەر باوەڕی وابوو کە خودی خۆی کاریگەری هەیە بە بێ فەرمانی خوا، ئەگەر نا ئەوە شیرکی بچووکە .

**بەڵگەی چوارەم :**

وە (ابن أبي حاتم) ریوایەتی کردووە لە (حذیفة) کەوا : (رأى رجلاً في يده خيط من الحمى، فقطعه، وتلا قوله : ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ۝١٠٦﴾

واتە: کابرایەکی بینی دەزوویەکی بەستبووە دەستییەوە بە هۆی (تا) وە، ئەویش دەزووەکەی بڕی و ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ۝١٠٦﴾

- **(من الحمى) :** واتە بە هۆی (تا)وە بۆ ئەوەی فێنکی بکاتەوە یان چارەسەری بکات .
- **(فقطعه)** واتە : دەزووەکەی بڕی : گۆڕینی مونکەرە بە دەست، وە بەڵگەی هێزی پێشینی تێدایە لە گۆڕینی مونکەر .
- **حوکمی هەڵواسین :** هەڵواسین هەمووی حەرامە : ئەڵقە و دەزوو و چاوەزار و تەمیمە و چاوی گورگ و سم و نەعلە کۆنە و مووروی شین و ناودەست و چاو و سەرەگا و پەیکەری شێر یان هەندێ دار و جگە لەوانە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** توندی و بە گەورەزانینی لەبەر کردنی ئەڵقە و دەزوو و هاوشێوەی ئەوانە.

**دووەم :** ئەگەر هاوەڵێك کۆچی دوایی کرد و ئەوەی پێوە بوو، رزگاری نابێت،ئەمەش شاهێدێکی تێدایە بۆ قسەی هاوەڵان کەوا شیرکی بچووك تاوانێکی گەورەیە لە تاوانە گەورەکان (چونکە خوای گەورە لە شیرك خۆش نابێت هەرچەندە بچوکیش بێت، بە جیاواز لە گەڵ تاوانە گەورەکاندا) .

**سێیەم :** بیانووی نەزانینی بۆ نەهێنایەوە (بیانووی نییە لە پاش ئەوەی بۆی روون کردەوە، وە نەزانین (جهل) دوو جۆرە :

١. نەزانینێك کە بیانووی نییە، ئەوەش کە بە هۆی کەمتەرخەمی و فەرامۆشکردنەوە سەرچاوەی گرتووە لە گەڵ ئەوەی لە توانایدا بووە فێر بێت، ئەوا هیچ بیانوویەکی نییە، جا ئەگەر کوفر بێت یان سەرپێچی .
٢. نەزانینێك بیانووی هەیە، ئەمەش ئەگەر بە جیاواز لەوەی پێشووەوە سەرچاوەی گرتبێت، واتە ئەو کەمتەرخەم نەبووە و فەرامۆشی نەکردووەو پێویست نەبووە بۆ فێربوونی وەکو ئەوەی بە خەیاڵیدا نەهاتبێت کەوا ئەم شتە حەرامە، ئەوا ئەو کاتە بیانووی هەیە، جا ئەگەر موسڵمان بێت ئەوا زیانی نییە وە ئەگەر بێباوەڕ بێت ئەوا بێباوەڕە لە دونیادا، بەڵام لە دوارۆژدا ئەوا کارەکەی دەگێڕدرێتەوە بۆ لای خوا .

**چوارەم :** ئەو کارە هیچ سوودێکی پێ ناگەیەنێت، بەڵکو زەرەری لێ دەکات، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە : **(لا تزيدك الا وهناً)** .

**پێنجەم :** ئینکارکردن بە توندی و گەورەکردنەوەی بابەتەکە بۆ هەر کەسێ ئەو کارە بکات .

**شەشەم :** روونکردنەوەی ئەوەی : هەرکەسێ شتێك هەڵواسێت ئەوا بەو رادەسپێردرێت.

**حەوتەم :** ڕوونکردنەوەی ئەوەی : هەرکەسێ تەمیمەیەك هەڵواسێت ئەوا شیرکی ئەنجام داوە .

**هەشتەم :** هەڵواسینی دەزوو بە هۆی (تا)وە لەو جۆرەیە .

**نۆیەم :** خوێندنەوەی ئایەتەکە لە لایەن (حذيفة)ەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هاوەڵان ئەو ئایەتانەیان دەکردە بەڵگە کە دەربارەی شیرکی گەورە هاتووە بۆ شیرکی بچووك، هەروەکو ابن عباس باسی ئایەتەکەی سورەتی (البقرة) کردووە (دەربارەی خۆشەویستی) .

**دەیەم :** هەڵواسینی هێلکە شەیتانۆکە (وەدەعە) بە هۆی چاوەزارەوە لە تەمیمە شیرکییەکانە.

**یازدەیەم :** دوعاکردن لەو کەسانەی تەمیمە هەڵدەواسن بەوەی خوای گەورە کارەکەیان بۆ تەواو نەکات، وە هەرکەسێ هێلکە شەیتانۆکە (وەدەعە) هەڵواسێت ئەوا خوای گەورە لە ئارامیدا نەیهێڵێ واتە خوای گەورە نائارامی بۆ جێدەهێڵێ (بەم راشکاوییە لە گەڵ کەسدا نادوێین و بە کەسێکی دیاری کراو نالێین ئەگەر بینیمان تەمیمەیەکی هەڵواسی بوو : خوای گەورە کارەکەت بۆ تەواو نەکات، چونکە لە گەڵ کەسێکدا ئەو کارەی کردبێت بەراشکاوی و دیاری کراوی بلێین رەنگە هۆکارێك بێت بۆ دوورکەوتنەوەی، بەڵام دەڵێین : واز لەو تەمیمە و هێلکە شەیتانۆکانە (وەدەعانە) بهێنە و ئەمجار فەرموودەکەی بۆ دەخوێنینەوە) .

## ٨/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی روقیە و تەمیمە هاتووە.

بۆ نوسەر فەرموویەتی : (بەشی ئەو بەڵگانەی هاتووە) وە نەیفەرمووە : (روقیە لە جۆرەکانی شیرکە) هەروەکو بەشی پێشوو؟

١. چونکە روقیە دابەش دەبێتە دوو بەشەوە : شەرعی و نا شەرعی .

٢. وە تەمیمە هەمووی شیرکە ئیللا مەگەر لە قورئان کرابێت ئەوا حەرامە .

## بەڵگەی یەکەم :

لە کتێبی (الصحیح)دا هاتووە لە (أبو بشیر الانصاري)یەوە: (أنه كان مع النبي (ﷺ) في بعض أسفاره، فأرسلَ رسولاً : ( أنْ لا يبقينَّ في رقبة بعير قلادةٌ من وتر – أو : قلادةٌ – إلّا قُطعتْ) واتە : ئەو لە گەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بوو لە هەندێ لە سەفەرەکانیدا، نێردراوێکی نارد : کە بە گەردنی هیچ وشترێکەوە هیچ گەردنبەندێکی (ملوانکەیەکی) دەزوو نەهێڵێت –یان ملوانکە–ئیللا بیبچرێت).

- (فأرسلَ) : بۆ بە دواداچوونی حاڵی ئەوان بەوەی شەریعەت فەرمانی پێکردووە.
- (قلادة) : باوەڕیان وایە کە چاو لە وشترەکە دوور دەخاتەوە (چاوەزارە)، ئەمەش باوڕێکی هەڵە و خراپە.

## بەڵگەی دووەم و سێیەم :

٢/ لە (ابن مسعود)ەوە ریوایەت کراوەو فەرموویەتی : گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (إنَّ الرقى والتمائم والتولةَ شرك) (رواه أحمد وأبو داود ) واتە : بە دڵنیاییەوە روقیە و تەمیمە و نوشتەی سۆزداری (تیوەلە) شیرکن).

٣/ لە (عبدالله بن عُکیم)ەوە هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەوا فەرموویەتی: ((من تعلَّق شيئاً وُكِلَ إليه) (رواه أحمد والترمذي) واتە : هەرکەسێك شتێك هەڵواسێت ئەوا بەو دەسپێردرێت .

- (إنَّ الرقى) : واتە ئەو روقیانەی کە لایان باو بووە ئەویش جۆرێکی شیرکە، بە بێ ئەوەی لە شەرعدا هیچ دەربارەی هاتبێت .
- (من تعلَّق شيئاً وُكِلَ إليه) : نەیفەرموو : (من علَّق) چونکە هەڵیواسی و دڵی پەیوەست بوو پێوە، جا هەرکەسێك دڵی پەیوەست بوو بە خواوە ئەوا خوای

بەسە، وە هەرکەسێ دڵی پەیوەست بوو بە جگە لە خواوە ئەوا شەرمەزار دەبێت .

- بۆیە نابێت هیچ کەسێك دڵی پەیوەست بکات بە هۆکارەکەوە، بەڵکو پەیوەستی بکات بە خواوە، بۆ نمونە کەسی فەرمانبەر کەوا دڵی پەیوەست کردووە بە مووچەکەیەوە، بە پەیوەست بوونێکی تەواو و بێ ئاگا لەو کەسەی ئەو هۆکارەی بۆ رەخساندووە کە ئەویش خوای گەورەیە، ئەوا کەوتوەتە ناو جۆرێك لە جۆرەکانی شیرکەوە، بەڵام ئەگەر باوەڕی وابوو کەوا ئەم مووچەیە تەنها هۆکارێکەو خوای گەورە بۆی رەخساندووە، ئەوا لە گەڵ پەناگرتندا (توکل)دا جیاواز نییە .




ئەگەر مەرجێك لە مەرجەکانی لە دەستدا ئەوا دەبێتە روقیەیەکی ناشەرعی، وە هیچ روقیەیەك نییە بە زمانێکی تر جگە لە زمانی عەرەبی، ئیللا مەگەر لە باس و بابەتی دوعا بێت ئەوا دروستە بە جگە لە زمانی عەرەبی بپارێتەوە بە مەرجێك ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە نەگۆڕێت، چونکە ئەوانە تەوقیفین (وە ناوەکان دەگێردرێتەوە هەروەکو چۆن هاتووە لە هەموو زمانەکاندا).

**(التمائم) تەمیمەکان :** شتێکە لەبەر چاوەزار بە منداڵاندا هەڵدەواسرێت، بەڵام ئەگەر هەڵواسراوەکە لە قورئان بوو، ئەوا هەندێ لە سەلەف ڕێگەیان پێداوە، وەهەندێکیان ڕێگەیان پێ نەداوە، وە دەیکەنە لەو جۆرەی نەهی لێکراوە، لەوانە ئیبن مەسعود .

**وە روقیە :** ئەوەی پێی دەڵێن : (العزائم) وە بەڵگە هاتووە لە سەر دروستی ئەگەر شیرکی تێکەڵ نەبوو، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگەی پێداوە بۆ چاو و پێوەدان بکرێت .

**وە (التولة) :** شتێکە دروستی دەکەن و باوەڕیان وایە کە ژن خۆشەویست دەکات لای پیاوەکەی، وە پیاو لای ژنەکەی .

**هەر لە جۆری تەمیمەکان ئەڵقەی هاوسەرگیرییە ( الدبلە )یە :**

**شیرکی گەورەیە :** ئەگەر باوەڕی وابوو کەوا لە خودی خۆیدا کاریگەری هەیە و بە دەست هێنانی قازانج و دوور خستنەوەی زەرەری بە دەستە .

**شیرکی بچووکە :** ئەگەر باوەڕی وابوو کە هۆکارێکە بۆ مانەوەی پەیوەندی هاوسەرگیری.

**حەرامە :** ئەمەش کەمترین حاڵەتی ئەوە، چونکە ئەوە لە نەریتی گاورەکانە،چونکە باوەڕیان بە عەقیدەی سێ خوا **(التثلیث)** هەیە لە دانانیدا، وە حەرامێکی تری تێدایە ئەگەر ئاڵتون بوو بۆ پیاوان .

## بەڵگەی چوارەم :

ئیمامی ئەحمەد لە (رویفع) ەوە ریوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرمووم : (يَا رُوَيْفِعُ، لَعَلَّ الْحَيَاةَ سَتَطُولُ بِكَ، فَأَخْبِرِ النَّاسَ : أَنَّ مَنْ عَقَدَ لِحْيَتَهُ أَوْ تَقَلَّدَ وَتَرًا أَوِ اسْتَنْجَى بِرَجِيعِ دَابَّةٍ أَوْ عَظْمٍ فَإِنَّ مُحَمَّدًا (ﷺ) بَرِيءٌ منه) .واتە : ئەی (رویفع) رەنگە تەمەنێکی زۆر بکەیت، جا هەواڵ بە خەڵکی بدە : هەرکەسێ ریشی خۆی گرێدا یان دەزووی هەڵواسی یان بە پاشەڕۆی وڵاخ یان بە ئێسك خۆی پاك کردەوە ئەوا (محمد(ﷺ)) لێی بەرییە).

- (أَنَّ مَنْ عَقَدَ لِحْيَتَهُ) : یان بە هۆی فیززلییەوەیە، وە یاخود کردوویەتییە هۆکارێك بۆ دوور خستنەوەی چاو .
- (تَقَلَّدَ وَتَرًا) : دەزوو : بریتییە لە دەزوویەك یان کشتەکێك لە (عصب) دروستکراوە لە جەستەی مەڕ وەردەگیرێ، بۆ دوورخستنەوەی چاو بە کار دەهێنرێت .
- (أَوِ اسْتَنْجَى بِرَجِيعِ دَابَّةٍ) : لادانی شوێنەواری ئەوەی لە پاش و پێشەوە دەردەچێت بە پاشەڕۆی ئاژەڵ .
- (أَوْ عَظْمٍ) : ئەوەیش خۆراکی جنۆکەیە، وەپاشەڕۆیش ئالفی ئاژەڵی جنۆکەکانە .

## بەڵگەی پێنجەم و شەشەم :

٥/ وە لە (سعيد)ی كوڕی (جبير)ەوە هاتووە و فەرموویەتی : ( من قطع تميمة من إنسانٍ كان كعدل رقبةٍ) (رواه وكيع) واتە : هەركەسێ تەمیمەیەكی بە قەد كەسێكەوە ببچڕێت وەكو ئەوەیە كۆیلەیەكی ئازاد كردبێت ).

٦/ هەروەها لە (ئیبراهیم)ەوە هاتووە : (كانوا يكرهون التمائم كلها من القرآن وغير القرآن) واتە : –پێشینەكان– تەمیمەیان پێ باش نەبوو بە هەموو جۆرەكانیەوە، لە قورئان بوایە یان جگە لە قورئان .

- (كان كعدل رقبةٍ) : چونكە لە كۆیلایەتی شەیتان رزگاری كرد كە شیركی تێدایە، وە ئەمەش بەرزترە لە رزگاركردنی كەسێك لە كۆیلایەتی مرۆڤە، بەڵام دەیبڕێت بە شێوازێكی چاك و رێك و پێك .

## بۆ حوكم دەدەین بە حەرامبوونی تەمیمە هەرچەندە بە قورئانیش بێت ؟

| چونكە سەلەف ئەوەیان بە مەكروه زانیوە، وە كەراهەتیش لای سەلەف بە مانای حەرام دێت . | چونكە ئەو فەرموودەیە : (إنَّ الرقى والتمائم والتولة شرك) دەیگرێتەوە. | تاوەكو دەرگای خراپەكاری لەسەر خەڵكی نەكەینەوە، چونكە ئەگەر كەسێك بتبینێ وا بزانێت هەموو جۆرە تەمیمەیەك دروستە هەرچەندە لە جگە لە قورئان بێت . | چونكە سووكایەتی پێكردنی قورئانی تێدایە . رەنگە بە ئەوەوە بچێتە سەرئاو و یان پیسی بەر كەوێت. |
|---|---|---|---|

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری روقیە و تەمیمە .

**دووەم :** تەفسیری نوشتەی سۆزداری (التولة) .

**سێیەم :** ئەم سێ شتە هەموو شیرکن بە بێ جیاوازی .

**چوارەم :** روقیەکردن بە قسەی حەق بە هۆی چاوەوە یان پێوەدانەوە لەو جۆرە نییە (هەروەها جگە لە ئەویش دەگرێتەوە وەکو جادوو) .

**پێنجەم :** تەمیمە ئەگەر لە قورئان بێت، ئەوا زانایان تێیدا جیاوازن، ئایە ئەوە لەوانە یان نا ؟ (وە باشترینیان مەزهەبەکەی ئیبن مەسعودە، چونکە ئەصل وایە کە دروست نییە).

**شەشەم :** هەڵواسینی دەزوو بە ئاژەڵاندا بۆ مەبەستی چاوەزار لەو جۆرەیە (شیرکە).

**حەوتەم :** هەڕەشەیەکی توند هاتووە بۆ ئەو کەسەی دەزوو هەڵدەواسێت .

**هەشتەم :** فەزڵی ئەوە کەسەی تەمیمەیەکی هەڵواسراو بە قەد مرۆڤێکەوە دەبچرێت .

**نۆیەم :** قسەکەی (ئیبراهیم) هیچ جیاواز نییە لە گەڵ ئەو جیاوازییەی پێشوو، چونکە مەبەستی لە هاوەڵان هاوەڵانی (عبدالله بن مسعود)ە، ( وە مەبەستی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و شوێنکەوتوان بە گشتی نییە ) .

## ٩/ بەشی ئەوەی : ئەو کەسانەی تەبورك دەکەن بە دارێکەوە یان بەردێکەوە یان نمونەی ئەوانە .

**تەبەروك بریتییە لە :** داواکردنی بەرەکەت، هەر لەوانە :

**تەبەروکی ڕێگە پێدراو :**

**بە کارێکی شەرعی :** وەکو نوێژ لە مزگەوتی حەرام (کەعبە) و خوێندنەوەی قورئان .

**بە کارێکی هەستپێکراو :** وەکو تەبەروك کردن بە دیراسەتکردنی کتێبەکانی ئەهلی سوننە، وەکو کتێبەکانی شیخ الاسلام – رەحمەتی خوای لێ بێت لێ.

**تەبەروکێکی قەدەغەکراو :** ڕێکخەر تێیدا : ئەوەی بەڵگەیەکی شەرعی یان هەستپێکراوی تێدا نەسەلمێنرابێت، وەکو دەست هێنان بە ژوورەکەی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) .

**بەڵگەی یەکەم**

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلۡعُزَّىٰ ١٩ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ ٢٠ ﴾ الآيات.

**بەڵگەی دووەم :**

لە (أبو واقد الليثي)یەوە هاتووە دەفەرموێت : (( خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى حُنَيْنٍ، وَنَحْنُ حدثاء عَهْدٍ بِكُفْرٍ وللمشركين سِدْرَةٌ يَعْكِفُونَ عندها، وينوطون بها اسلحتهم، يقال لها: ذات أنواط، فَمَرَرْنَا بسدرة، فَقُلْنَا : يَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) اجْعَلْ لَنَا ذَاتَ أَنْوَاطٍ كَمَا لَهُمْ ذَاتُ أَنْوَاطٍ، فقال رسول الله (ﷺ) : اللَّهُ أَكْبَرُ إنها السنن، قُلْتُمْ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ كَمَا قَالَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ لِمُوسَى (( اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ)) لَتَرْكَبُنَّ سُنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ)

واتە : لە گەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەرچووین بۆ حونەین، لە کاتێکدا ئێمە تازە لە کوفر رزگارمان بوو بوو، موشریکەکانی دارێکیان هەبوو (داری کنار) لە بەتەنیشتیەوە دەمانەوە و چەکەکانیان (تیرو شمشێرەکانیان) پێدا هەڵدەواسی بە مەبەستی بەرەکەت : پێیان دەگوت : (ذات أنواط)، ئێمەش بە تەنیشت دار کنارێکەوە رۆیشتین، وتمان : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ذات أنواط)ێك بۆ ئێمە دیاری بکە هەروەکو چۆن ئەوان (ذات أنواط)یان هەیە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : الله أكبر .. ئەمە سوننەتەکانە (رێچکەکانە)، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە هەمان قسەتان کرد کە بەنی ئیسرائیل بە موسایان فەرموو (( اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ)) شوێنی رێچکە و رێگای ئەوانەی پێش خوتان دەکەون ).

- (أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ) : هەواڵم پێ بدەن و پێم بڵێن ئایە ئەم بتانە چین کە ئێوە هێندە بە مەزنی دەزانن ؟ وە حاڵی ئەوانە چۆنە بەرانبەر بە ئەو ئایەتە مەزنانە وەکو میعراج ؟ چونکە ئەوان باوەڕیان وایە ئەم بتانە زیان و قازانجی بە دەستە، بۆیە دەچن بۆ لایان و لێیان دەپاڕێنەوە و ئاژەڵیان بۆ سەردەبڕن و خۆیانی لێ نزیك دەکەنەوە .
- وە مەبەست لە پرسیارەکە لێرەدا بۆ بە کەمزانینە .
- (ٱللَّٰتَ) : دەخوێنرێتەوە بە بوونی شەددە لە سەر پیتی (تاء) ەکە : یەکێ بوو لە پیاوچاکان ئاردەوای بۆ حاجییەکان دەکرد، وە دەخوێنرێتەوە بەسووکی پیتی (تاء)ەکە (واتە بە بێ شەددە) : لە ناوەکانی خوای گەورە ناویان بۆ ئەم بتە داتاشاوە، وە ناویان ناوە بە (اللات) .
- (وَٱلْعُزَّىٰ) : لە ناوی خوای گەورە (العزيز)ەوە وەرگیراوە .

- **(وَمَنَوٰةَ) :** لە ناوی خوای گەورە (المنان)ەوە وەرگیراوە، یان لە وشەی (منی) وە وەرگیراوە لە بەر زۆر رشتنی خوێن لەوێدا، وە وشەی (منی)ش هەر لە ئەوەوە هاتووە .
- **(حدثاء) :** تازە بووبونە موسڵمان (تازە لە کوفر رزگاریان بووبوو)، باسی ئەوەی کردووە وەکو هێناوەنەوەی بیانوویەك بۆ داواکردن و پرسیارەکەیان .
- **(ینوطون) :** چەکەکانیان پێدا هەڵ دەواسی بۆ تەبەڕوك.
- **(ذات أنواط) :** چونکە چەکی پێدا هەڵدەواسرا بە ئومێدی بەرەکەت .
- **(اجْعَلْ لَنَا ذَاتَ أَنْوَاطٍ كَمَا لَهُمْ ذَاتُ أَنْوَاطٍ) :** زانیان کەوا پەرستنەکان تەوقیفین، پێویستە مۆڵەت لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەرگرن، بۆیە مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەرگرت، کەچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بە توندی وەڵامی دانەوە، بۆیە ئەوانیش نەکەوتنە ناو ئەو شیرکەوە .
- **(لترکبُنَّ) :** وەکو ئەو کارەی ئەوان کردیان ئێوەش دەیکەن، هەروەها وەکو قسەکانی ئەوان دەکەن، بۆیە هەواڵدان و وریاکردنەوەی تێدایە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکانی سورەتی (النجم) : ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ ﴾.

**دووەم :** زانینی شێوازی فەرمانەکە کە داوایان کردبوو .

**سێیەم :** هاوەڵان ئەو کارەیان نەکرد .

**چوارەم :** مەبەستیان بوو خۆیان بەو کارە لە خوا نزیك بکەنەوە، چونکە گومانیان وابوو کەوا ئەو خۆشی دەوێت .

**پێنجەم :** ئەگەر ئەوان ئەو بابەتەیان نەزانیبێت، ئەوا جگە لەوان لە پێشترە بۆ نەزانین ( بۆیە مەغرور نەبین بە کرداری خەڵکی).

**شەشەم :** هێندە چاکەیان زۆرە و بەڵێنی لێخۆشبوونیان پێدراوە کە جگە لەوان کەس نییەتی (بۆیە بە باشە زیاتر بە هیچ شێوەیەك باسیان مەکە، چونکە تانەدان لەوان تانەدانە لە خوا و دینی خوا و پێغەمبەری خوا (ﷺ) ).

**حەوتەم :** پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیانووی بۆ نەهێنانەوە بەڵکو وەڵامی ئەوانی دایەوە و فەرمووی : **(اللَّهُ أَكْبَرُ إنها السنن ... لَتَتبعنَّ سُنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ)** کارەکەی لە سەر قورس و توند کرد بەم سێ شتە .

**هەشتەم :** مەسەلە گەورەکە –کە هەر ئەوەیش مەبەستەکەیە– هەواڵی پێدان کەوا داواکەیان وەکو داواکەی بەنی ئیسرائیلە کاتێ بە موسایان فەرموو : (اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا) ( بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەوا نەهی کراوە لەوەی خۆمان بە موشریکەکان بچوێنین لە وشەو گفتارەکانماندا) .

**نۆیەم :** نەفیکردنی لەم باسە لە مانای **(لا إله الا الله)**یە لە گەڵ ئەوەشدا ورد و شاراوەیە لای ئەوان ( چونکە شایەتیدان : نەفی هەموو خوایەك دەکات جگە لە (الله) نەبێت، بە هەمان شێوە داوای بەرەکەت لە جگە لە خوا بە دەست ناهێنرێت و داواناکرێت) .

**دەیەم :** سوێندی لەسەر فەتواکەی خوارد، ئەویش تەنها بۆ بەرژەوەندییەك سوێند دەخوات ( یان دوور خستنەوەی خراپەیەك) .

**یازدەیەم :** شیرك گەورە و بچووکی هەیە، چونکە ئەوان بەو کارەیان مورتەد نەبوونەوە (لە دین پێی هەڵنەگڕانەوە).

**دوازدەیەم :** مەبەست لە : **(وَنَحْنُ حدثاء عَهْدٍ بِكُفْرٍ)** بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا جگە لەوان ئەوەیان دەزانی ( جا ئەوان بیانوویان هەیە لەبەر نەزانینیان، چونکە تازە هاتبوونە ناو ئیسلامەوە).

**سیازدەیەم :** وتنی **(الله أكبر)** لە کاتی بینینی شتێکی سەیردا، بە جیاواز لە گەڵ ئەو کەسانەی کە پێیان باش نییە (پێیان مەکروهە) .

**چواردەیەم :** داخستنی دەرگای هۆکارەکان (سد الذريعة) ( ئەویش بریتییە لەو ڕێگایانەی خاوەنەکەی دەگەیەنێتە شتێك، وە هۆکارەکان دوو جۆرن :

١/ هۆکارێك بۆ کارێکی داواکراو، ئەوا ئەمەیان داناخرێت، بەڵکو دەکرێتەوەو داواکراوە .

٢/ هۆکارێك بۆ کارێکی نەویستراو، ئەوا ئەمەیان دادەخرێت، هەر ئەمەش مەبەستی نوسەرە .

**پازدەیەم :** نەهیکردن لە خۆچواندن بە نەفامەکان ( تایبەت نییە بەوانەی پێش هاتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بەڵکو هەر کەسێك حەق نەناسێت و بە کاری نەفامی کار بکات، ئەوا لە نەفامەکانە).

**شازدەیەم :** تووڕەبوون لە کاتی فێرکردندا .

**حەڤدەیەم :** بنەما گشتییەکە لە فەرموودەی : (إنها السنن) ( ئەمەش وریا کردنەوەیە) .

**هەژدەیەم :** ئەمە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی چونکە هەر وەکو ئەوەی ئەو هەواڵی پێداین ڕوویداو هاتە دی .

**نۆزدەیەم :** هەرشتێك خوای گەورە زەمی جولەکەو گاوری پێ کردبێت لە قورئاندا بۆ ئێمەشە.

**بیستەم :** لای ئەوان جێگر و سابت بووە کە پەرستنەکان لە سەر فەرمانکردن بنیات نراوە، بۆیە وریاکردنەوەی (پرسیارەکانی ناو گۆڕی) تێدایە، ئەوەی کە دەڵێت : خواکەت کێیە؟ ئەوا ڕوونە، بەڵام ئەوەی کە دەڵێت : پێغەمبەرەکەت (ﷺ) کێیە؟ لەو هەواڵانەیە کە دەربارەی غەیب داویەتی، وە : دینەکەت چییە ؟ لەو قسەیەوە وەردەگیرێت کە دەڵێت : (اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا) تا کۆتایی .

**بیست و یەکەم :** سوننەتی ئەهلی کیتاب نەویستراوە هەر وەکو سوننەتی موشریکەکان .

**بیست ودووەم :** ئەو کەسەی لە ناحەقی و (باطل) واز هێنابێت کە دڵی لەسەری راهاتووە، لەسەری تەئمین نین لەوەی شتێك لەو نەریتە کۆنەی لە دڵدا مابێت، بە بەڵگەی : **(وَنَحْنُ حدثاء عَهْدٍ بِكُفْرٍ)** (بۆیە حیکمەت لە دوورخستنەوەی کەسی زیناکار لە پاش جەڵدە لێدانی لە جێگای تاوانەکەی، بۆ ئەوەیە بۆی نەگەڕێتەوە، جا مرۆڤ پێویستە دوور بکەوێتەوە لە جێگای کوفر و شیرك و فسوق، وە رێگای ئەهلی سوننە ئەوەیە کە لە زانا خواناسەکانەوە شت وەردەگرن، وە هەرکەسێك لە گومرایی بگەڕێتەوە لێی وەرناگیرێت تاوەکو زانایان شایەتی پاکی و سەلامەتی باوەڕەکەی بۆ نەدەن و نەمانی ئەو گومراییەی لەسەری بوون) .

## ١٠ / بەشی : ئەو بەڵگانەی دەربارەی سەربڕینی ئاژەڵ بۆ جگە لە خوا هاتوون .

بۆ فەرمووی : (بەشی ئەو بەڵگانەی ...) وە نەیفەرموو : (لە جۆرەکانی شیرکی گەورە سەربڕینی ئاژەڵ بۆ جگە لە خوا) ؟

١. دەیەوێ قوتابی رابهێنێ لەسەر وەرگرتنی حوکم لە بەڵگەوە، ئەمەش لە جۆری پەروەردەی کردارییە .

٢. یان لەبەر ئەوەیە کەوا سەربڕین بۆ جگە لە خوا دابەش دەبێتە دوو بەشەوە : دروست و شیرکی گەورە.

### بەڵگەی یەکەم و دووەم

١/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ ﴾ .. الآية.

٢/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ ﴿٢﴾ ﴾

- ( قُلْ ) : بە موشریکەکان بڵێ و ئاگاداریان بکەرەوە بە هەستانت بە جێگەیاندنی تەوحید و ئیخلاص.
- (صَلَاتِي) : کردارە جەستەیەکان، وە لە باشترینیان نوێژە جا ئەگەر نوێژە فەرزەکان بێت یان سوننەتەکان .
- (وَنُسُكِي) : ئاژەڵ سەربڕینەکەم، کردارەکان کە بە سامان دەکرێن وە لە باشترینیان ئاژەڵ سەربڕینە بۆ خوای گەورە .
- (وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي) : واتە : هەر تەصەروف و کاروبارێکم، هەروەها بەڕێوەبردنی کارەکانم بە زیندوویی و مردوویی بۆ خوای گەورەیە.
- ( أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ) ١- یەکەمینی دانەپاڵە، واتە : من یەکەم موسڵمانم لەم ئوممەتە. ٢- یەکەمینی ڕەهاییە، وە مەبەست لێی : مەزنترین خەڵکیم لە ئیسلامەتیدا و لە هەموویان تەواوترم لە ملکەچبووندا لە ناو ئوممەتەکاندا .
- (وَٱنْحَرْ) : هەروەکو چۆن نوێژەکەت بۆ خوایە ئاواش ئاژەڵ سەربڕینەکەت هەر بۆ ئەو بێت، وە ئاژەڵ سەربڕین یەکێکە لە پەرستنەکان.

**بەشەکانی ئاژەڵ سەربڕین :**

| **سەربڕینێك بۆ خوای گەورە** : وەکو (هەدی) و قوربانی و گوێزەبانە (العقیقة)، ئەنجامدانی بۆ جگە لە خوا شیرکی گەورەیە . | **سەربڕینێکی دروست :** وەکو سەربڕینی مەڕێك بۆ گۆشتەکەی بێت، وە ڕێزگرتن لە میوان یان بۆ بازرگانی . | **سەربڕینێك بۆ جگە لە خوا لەبەر خۆشەویستی و بە مەزنراگرتن** : (شیرکی گەورەیە) وەکو ئاژەڵ سەربڕین بۆ خاوەن گۆڕ و جنۆکەکان . |
|---|---|---|

## بەڵگەی سێیەم :

(لە (علی کوڕی ئەبو تالیب)ەوە ریوایەت کراوەو دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوار وشەی بۆ گێڕامەوە : (لَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ، لَعَنَ اللهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَيه، لَعَنَ اللَّهُ مَنْ آوَى مُحْدِثًا، لَعَنَ اللَّهُ مَنْ غير مَنَارَ الْآرْضِ) واتە : خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو کەسەی بۆ جگە لە خوا سەر دەبڕێ، خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو کەسەی نەفرەت دەکات لە دایك و باوکی، خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو کەسەی داڵدەی بیدعەچییەك (تاوانبارێك) بدات، خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو کەسەی نیشانەکانی زەوی دەگۆڕێت) .

- (لَعَنَ) : لەعنەت کردن لە خواوەیە : ئەویش دەرکردن ودوورخستنەوەیە لە رەحمەتی خوای گەورە، رەنگە هەواڵی پێداوین کەوا خوای گەورە لەعنەتی کردووە لەو کەسەی بۆ جگە لە خوا ئاژەڵ سەردەبڕێت، یان دوعای لێ کردووە واتە : ئەی خودایە لەعنەت بکە لەو کەسەی بۆ جگە لە خوا ئاژەڵ سەردەبڕێت.

## بەڵگەی چوارەم :

(لە (طارق ی کوڕی شهاب)ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (دخل الجنةَ رجلٌ في ذباب، ودخل النارَ رجلٌ في ذباب ) قالوا : وكيف ذلك يا رسول الله (ﷺ) ؟ قال : (مرَّ رجلان على قوم لهم صنم لا يجاوزه أحد حتى يُقَرِّب له شيئاً، قالوا لأحدهما : قَرِّبْ، قال : ليس عندي شيء أقرب، قالوا له: قَرِّبْ ولو ذبابا، فقَرَّبَ ذبابا، فخلّوا سبيله، فدخل النار، وقالوا للآخر : قَرِّبْ، قال : ما كنت لأقرب لأحد شيئاً من دون الله عزوجل، فضربوا عنقه فدخل الجنة) (رواه أحمد)

واتا : کابرایەك چووە بەهەشتەوە بە هۆی مێشێکەوەو کابرایەك چووە ئاگرەوە بە هۆی مێشێکەوە، وتیان : ئەوە چۆنە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ فەرمووی : دوو

پیاو بە نزیك كۆمەڵێكدا تێپەڕین كە بتێكیان هەبوو، هیچ كەسێك لێی تێنەدەپەڕی ئیللا دەبوایە شتێكی بۆ بكردایەت بە قوربانی، بە یەكێكیان وت : شتێك بۆ بتەكەمان بكە بە قوربانی، وتی : هیچ شتێكم نییە تاوەكو بۆی بكەم بە قوربانی، پێیان وت: شتێكی بۆ بكە بە قوربانی تەنانەت ئەگەر مێشێكیش بووە، بۆیە مێشێكی بۆ كردە قوربانی، ئەوانیش ڕێگایان پێدا و ڕۆیشت، بۆیە چووە ئاگرەوە، بە ئەویتریان وت : شتێك بۆ بتەكەمان بكە بە قوربانی، ئەویش وتی : بە هیچ شێوەیەك هیچ شتێك بۆ جگە لە خوا ناكەمە قوربانی، بۆیە لە گەردنیان داو چووە بەهەشتەوە ).

- **(في ذباب) :** پیتی (في) لێرەدا پێی دەڵێن : (السببية) واتە : بە هۆی مێشێكەوە.

## مەسەلەكان :

**یەكەم :** تەفسیری ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێت : ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي ﴾

**دووەم :** تەفسیری ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێت : ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴾

**سێیەم :** دەستپێكردن بە لەعنەت كردن لەو كەسەی بۆ جگە لە خوا ئاژەڵ سەردەبڕێت ( چونكە جۆرێكە لە شیرك، وە حەقی خوای گەورە گەورەترین حەقە).

**چوارەم :** لەعنەت كردن لەو كەسەی لەعنەت لە دایك و باوكی دەكات، هەر لەوانە لەعنەت بكەیت لە دایك و باوكی كەسێك و ئەویش لەعنەت بكات لە دایك و باوكت (چونكە هۆكاریش هەروەكو ڕاستەوخۆ وایە، یان بە ڕاستەوخۆیی لەعنەت لە دایك و باوكی بكات).

**پێنجەم :** لەعنەت كردن لەو كەسەی داڵدەی بیدعەچییەك (تاوانبارێك) بدات، ئەویش بریتییە لەوەی كەسێك شتێك دادەهێنێت كە حەقی خوای تێدا پێویست كراوە، ئەویش خۆی دەداتە پاڵ كەسێك تاوەكو داڵدەی بدات لەو كارە

( وە هەرکەسێك سەریان بخات ئەوا توندتر و مەزنترە لەو کەسەی دەیانپارێزێ، وە داهێنان لە دوو شتدا دەبێت :

١. لە دیندا : وەکو ئەو بیدعانەی جەهەمی و موعتەزیلەو رافیزەکان و جگە لەوان دایان هێناوە.
٢. لە کاروباری ئوممەتدا : وەکو کەتنەکان و نمونەی ئەوانە، بۆ نمونە داڵدەی دز و رێگرەکان دەدات ).

**شەشەم :** خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو کەسەی نیشانەکانی زەوی دەگۆرێت، ئەویش ئەو هێمایانەن کە حەقی زەوییەکەت لە حەقی دراوسێکەت جیا دەکاتەوە، جا دەیگۆریت بە پێشخستن یان دواخستن .

**حەوتەم :** جیاوازی لە نێوان لەعنەت کردنی کەسێکی دیاری کراوە وە لەعنەت کردن لە سەرپێچیکاران بە شێوەیەکی گشتی (جا کەسی دیاری کراو ئەوا بۆت نییە لەعنەتی لێ بکەیت و قەدەغەیە، وە دووەم دروستە، جا کەسی دیاری کراو بۆت نییە لەعنەتی لێ بکەیت، وەئەصڵ و بنەماش ئەوەیە کە لەعنەت کردن بە رەهایی دورست نییە ).

**هەشتەم :** ئەمە چیرۆکێکی مەزنە، ئەویش چیرۆکی مێشەکەیە ( ئەگەر فەرموودەکە صحیح بێت) .

**نۆیەم :** چووە ئاگرەوە بە هۆی مێشێکەوە کە مەبەستی نەبوو، بەڵکو ئەو کارەی ئەنجامدا بۆ ئەوەی لە خراپەیان دوور بکەوێتەوە و رزگاری بێت ( چونکە ناچارکردن لە ئوممەتەکانی پێشوودا بیانوو نەبووە ) .

**دەیەم :** زانینی ئەندازەی شیرك لە دڵی ئیمانداراندا، چۆن ئارامی گرتووە لەسەر کوشتن کەچی رازیی نەبووە بە داواکارییەکەیان، لە گەڵ ئەوەشدا تەنها داوای کارێکیان لێ کرد بە رواڵەت ؟ (ئەگەر هاتوو لە رازی بوون و ئارامنەگرتنی زەرەرێك لە سەر ئیسلام هەبوو، ئەوا ئارام دەگرێت، وە رەنگە ئارامگرتنەکە واجیب بێت ).

**یازدەیەم :** ئەوەی چووە ئاگرەوە کابرایەکی موسڵمان بوو، چونکە ئەگەر کافر بوایە نەیدەگوت : چووە ئاگرەوە بە هۆی مێشێکەوە (جا خۆنزیکردنەوەکەی بەو قوربانییە بووە هۆی ئەوەی بچێتە ئاگرەوە).

**دوازدەیەم :** شاهیدێکی تێدایە بۆ فەرموودەیەکی (صحيح) : (الجنة أقربُ الى أحدكم من شراك نعليه، والنار مثل ذلك) واتە : بەهەشت نزیکترە لە هەر یەکێکتانەوە لە قەیتانی پێڵاوەکەی لێیەوە و ئاگریش هەروەها نزیکە) وە مەبەست لەمە هاندان و ترسانە .

**سیازدەیەم :** زانینی ئەوەی مەبەستە گەورەکە بریتییە لە کاری دڵ، تەنانەت لای بت پەرستەکانیش (وە دەرمان و چارەسەری دڵ تەنها قورئان و سوننەتە، بۆیە دڵی خۆت سەرقاڵ مەکە بە دونیاوە).

ئەگەر کەسێك ناچار کرا کوفر بکات، ئایە کامیان لە پێشترە : کوفر بکات و رزگاری بێت یان ئارام بگرێت هەرچەندە بیکوژن ؟ یان بە رواڵەت لە گەڵیاندا بێت و تەئویل بکات ؟

١. ئەگەر لە گەڵیاندا بێت بە ئاشکرا و پەنهانی، ئەوا دروست نییە، چونکە هەڵگەڕانەوەیە لە دین.
٢. ئەگەر بە رواڵەت لە گەڵیاندا بێت و بە پەنهانی لە گەڵیاندا نەبێت، بەڵام مەبەستی تەنها خۆ رزگارکردن بێت لەبەر ناچاری، ئەوا دروستە .
٣. بە ئاشکرا و پەنهانی لە گەڵیاندا نەبێت و بکوژرێت، ئەمەش دروستە و جۆرێکە لە ئارامگرتن، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر لە گەڵیاندا بێت ئەوا زەرەر و زیان بە دینی گشتی بگەیەنێت، ئەگەر نا لە گەڵیاندا دەبێت بە رواڵەت نەك پەنهانی.

## ١١/ بەشی هیچ ئاژەڵێك سەرنابڕێت لە جێگایەکدا کە سەربڕینی بۆ جگە لە خوای تێدا ئەنجام دەدرێت .

ئەمە باشترین گواستنەوەیە لە لایەن نوسەرەوە، لە پاش ئەوەی باسی سەربڕینی بۆ جگە لە خوا کرد، ئەمجار چووە باسی نادروستی سەربڕین بۆ خوای گەورە لە جێگایەکدا کە سەربڕینی بۆ جگە لە خوا تێدا ئەنجام دەدرێت، وەکو ئەوەی کەسێك قوربانی بکات بۆ خوا لە جێگایەکدا کە بۆ بتەکان ئاژەڵی تێدا سەردەبردرێت، وە حیکمەتیش لەوەدا ئەمانەی خوارەوەیە :

١. چونکە بەرەو خۆچواندن بە بێباوەرەکان دەبیات .
٢. خەڵکی بەرەو مەغرور بوون دەبات بەم کارە، بۆیە وا گومان دەبرێت کە کرداری موشریکەکان دروستە .
٣. موشریکەکان لە کردەوەکەیاندا بە هێز دەبن، ئەمەش قەدەغەکراوە، لە کاتێکدا دوورکەوتنەوەو تووڕەکردنیان داواکراوە .

### بەڵگەی یەکەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ ﴾

### هۆی هێنانەوەی ئەم ئایەتە لە لایەن نوسەرەوە :

کاتێ مزگەوتی (ضرار) بۆ ئەوە درەست کرا ببێتە جێگای سەرپێچی و کوفر، ببێتە بنکەیەك بۆ دووبەرەکی لە نێوان ئیمانداراندا، خوای گەورە نەهی لە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کرد نوێژی تێدا بکات، هەرچەندە بێگومان نوێژەکەی لەو مزگەوتە تەنها بۆ خوایە، ئەمەش بەڵگەیە کەوا هەر جێگایەك سەرپێچی خوای تێدا ئەنجام بدرێت نابێت لەوێدا نوێژ بکرێت، هەرچەندە شوێنی سەرپێچییەکە نەمابێت، جا نوێژ پەرستنە، هەروەها ئاژەڵ سەربڕینش .

وە لە نمونەی نزیك ئەم بابەتە نەهی کردنە لە نوێژ کردن لە کاتی ڕۆژ هەڵات و ئاوابووندا، چونکە ئەو دوو کاتە بێباوەڕان بۆ ڕۆژ (خۆر) سوژدەی تێدا دەبەن، ئەمە بە پێی کات، فەرموودەکەش بە پێی شوێنە .

## بەڵگەی دووەم :

لە (ثابت) ی کوڕی (الضحاك)ەوە هاتووەو دەڵێت : (نذر رجل أن ينحر إبلاً ببوانة، فسأل النبي (ﷺ) فقال : ( هل كان فيها وثن من أوثان الجاهلية يُعبد؟ قالوا : لا، قال : فهل كان فيها عيد من اعيادهم، قالوا : لا، فقال رسول الله (ﷺ) : أوفِ بنذرك فإنه لا وفاء لنذر في معصية الله، ولا فيما لا يملك ابن آدم) ( رواه أبو داود، وإسناده على شرطهما)

واتە : کابرایەك نزری کردبوو کەوا وشترێك سەربېڕێت لە (بوانه) بۆیە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد و ئەویش فەرمووی : ئایە بتێکی پەرستراو لە بتەکانی سەردەمی نەفامی تێدا بوو؟ وتیان : نەخێر، وتی : ئایە جەژنێك لە جەژنەکانی ئەوانی تێدا بووە؟ وتیان : نەخێر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : نزرەکەت جێبەجێ بکە، چونکە وەفاکردن بە نزرێك لە سەرپێچی خوادا بێت ناکرێت، یان لە شتێکدا موڵکی بەنی ئادەم نەبێت و نەیبێت).

**( نەزر ) لە زمانەوانیدا :** پەیمان و ئەرك خستنە سەرخۆ . **لە شەرعدا :** ئەرك خستنە سەرخۆ لەسەر شتێك كە واجب نییە لەسەری بە ئەنجامدانی لە لایەن پێسپێردراوەوە (مكلف).

**نەزر بۆ خوای گەورە :**

**نەزر بۆ جگە لە خوا ( شیركی گەورەیە ) :** وەكو سوێند خواردن بە جگە لە خوا تەنها لە گفتدا، دانامەزرێت ( واتە ئەنجام نادرێت و كەفارەتی نییە، وە دەبێ تەوبە بكات و بگەڕێتەوە بۆ لای خوا )

**نزری تایبەت :** وەكو ئەوەی شتێكی دیاری كراو بكاتە نزر .

**نـزری گشـتی :** هەموو موسڵمانێك دەگرێتەوە ﴿ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ ﴾، چونكە كەسی موسڵمان نزری كردووە بە ئەنجامدانی فەرمانەكان و وازهێنان لە نەهیكراوەكان .

**لە پاش وتنی بە زار:** دەبێ جێبەجێی بكات یان كەفارەتی سوێندی بدات .

**پێش وتنی بە زار:** حوكمەكەی حەرامە، چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی لێكردووە، وە ئەگەر خەیر و چاك بوایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نزری دەكرد .

**گوێڕایەڵی :** پێویستە جێبەجێی بكات، وە ئەگەر نەیكرد ئەوا كەفارەتی لەسەرە ( نمونەی ئەوە : نزری نوێژێكی سوننەتی كرد).

**سەرپێچی :** حەرامە جێ بە جێی بكات وە دەبێت نەیكات و كەفارەتی بدات (نمونەی ئەوە : نزری كارێكی حەرامی كرد وەكو غەیبەت) .

**دروست ( مباح ) :** سەرپشكە لە ئەنجامدانیدا — ئەنجامدانی لە پێشترە یان نەیكات و كەفارەتەكەی بدات ( نمونەی ئەوە : نزری كرد ئەم پۆشاكە لەبەر بكات) .

**تووڕەبوون و عینادی :** حوكمەكەی وەكو (مباح) ە، وە مەبەست لێی سوێندە (بۆ نمونە: نزر بێت ئەم شارە بە جێ بهێڵم).

**مەكروهە :** مەكروهە جێ بە جێ بكات و موستەحەببە نەیكات و كەفارەتی بدات (بۆ نمونە : نزر بێت لەسەرم لە نوێژدا ئاوڕبدەمەوە).

**ڕەها :** خاوەنەكەی ناوی هیچ شتێكی لێ نەهێناوە، ئەوا كەفارەتی لەسەرە، ( وەكو ئەوەی بڵێت : نزرێك بۆ خوا لەسەرم بێت، ئەمجار بێ دەنگ بێت ) .

- ئەگەر نزرەکە بۆ خوای گەورە بێت ئەوا دادەمزرێت : یان دەبێ نزرەکە بە جێ بگەیەنێت وە یان نەیکات، ئەوا کەفارەتی دەکەوێتە سەر .
- ئەگەر نزرەکە بۆ جگە لەخوای گەورە بێت ئەوا دانامزرێت: ئەوا نەجێ بە جێی دەکرێت و نەکەفارەتی لەسەرە، وە تەوبەی لەسەرە (چونکە شیرکی گەورەیە) .

**مەسەلەکان :**

**یەکەم :** تەفسیری ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت : ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ﴾.

**دووەم :** سەرپێچی رەنگە کاریگەری هەبێت لەسەر زەوییەکە، هەروەها گوێڕایەڵی (کاتێ ئەم زەوییە شوێنی شیرك بێت، ئەوا حەرام دەبێت هەر کەسێك کاری بکات لەسەر شێوەی شیرك بێت، چونکە خۆچواندنی موشریکەکانی تێدایە)

**سێیەم :** گێڕانەوەی ئەو مەسەلانەی ئاڵۆزن بۆ مەسەلەیەکی روون، بۆ ئەوەی ئاڵۆزییەکەی نەمێنێ .

**چوارەم :** بە درێژی باسکرنی بابەتەکە لە لایەن (مفتی) یەوە ئەگەر پێویستی بەوە کرد(یان بە درێژی باسی بکات)

**پێنجەم :** تایبەتمەند کردنی جێگایەکی دیاری کراو بە نزر ئاساییە ئەگەر هیچ رێگرییەك نەبوو ( بەڵام ئەگەر ترسی هەبوو لەوەی خەڵکی عەوام وا بزانێت ئەم جێگایە تایبەتمەندی هەیە ئەوا دەبێتە کارێکی قەدەغەکراو).

**شەشەم :** رێگری کردن لێی ئەگەر بتێك لە بتەکانی سەردەمی نەفامی تێدا بێت، هەرچەندە لە پاش نەمانی بێت .

**حەوتەم :** رێگری کردن لێی ئەگەر جەژنێك لە جەژنەکانی موشریکەکانی تێدا بوو، هەرچەندە لە پاش نەمانی بێت.

**هەشتەم :** دروست نییە ئەو نزرەی کردوویەتی لەو جێگایە جێ بە جێی بکات، چونکە نزرێکی سەرپێچییە .

**نۆیەم :** وریابوون لە خۆچواندن بە موشریکەکان لە جەژنەکانیاندا، هەرچەندە مەبەستی نەبێت ( شیخ الاسلام ئەوەی دووپات کردووەتەوە کەوا بە ئەنجام گەیاندنی شوبهاندن مەرج نییە مەبەست و نیەتی کەسەکەی لە گەڵدا بێت، جا ئەگەر مەبەستەکەی لە گەڵدا بوو ئەوا تاوانەکەی سەختتر و توندترە).

**دەیەم :** نزر لە سەر پێچیدا نییە ( مەبەست ئەوەیە کە نزرەکە دادەمەزرێت بەڵام دەبێت جێ بە جێ نەکرێت).

**یازدەیەم :** بەنی ئادەم نزری ناکەوێتە سەر لە شتێکدا موڵکی ئەو نەبێت ( واتە : جێبە جێی ناکات) ئەوەی موڵکی ئەو نییە یان نیەتی دەکرێتە دوو بەشەوە :

١. **شەرعی :** وەکو ئەوەی بڵێت : نزر بێت لەسەرم بۆ خوا کۆیلەکەی فلان کەس ئازاد بکەم، ئەوا دروست نییە چونکە موڵکی ئەو نییە .

٢. **قەدەری :** وەکو ئەوەی بڵێت : نزر بێت لەسەرم بۆ خوا بە دەستەکانم بفرم، ئەوا دروست نییە چونکە نیەتی و ناتوانێت .

**کەفارەتی نزر بۆ خوا وەکو کەفارەتی سوێندە:**

- سەرپشك دەبێت لە نێوان رزگارکردنی کۆیلەیەکی موسڵمان، یان نانی دە هەژار، یان دابین کردنی پۆشاك بۆیان.
- ئەگەر نەیبوو ئەوا دەچێت بۆ رۆژوو گرتنی سێ رۆژ بە دوای یەکدا .

## ١٢/ بەشی : نزرکردن بۆ جگە لە خوا جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرك.

### بەڵگەی یەکەم ودووەم :

١. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ ﴾

٢. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوۡ نَذَرۡتُم مِّن نَّذۡرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُهُۥ ﴾

موناسەبەتی دوو ئایەتەكە بە بەشەكەوە : نزر یەكێكە لەو هۆكارانەی كە چاكەكاران بە هۆیەوە دەچنە بەهەشتەوە، ئەویش پەرستنە، بۆیە ئەنجامدانی بۆ جگە لە خوا شیركە، هەروەها پەیوەست كردنی شتێك بە زانستی خواوەو جەزاكەی لەسەری .

## بەڵگەی سێیەم :

وە لە فەرموودەیەكی (صحیح)دا هاتووە لە عائیشەوە كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (( مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ الله فَلاَ يَعْصِهِ)) واتە: هەركەسێك نزری كرد كەوا گوێڕایەڵی خوا بكات ئەوا با گوێڕایەڵی بكات و هەركەسێك نزری كرد كەوا سەرپێچی بكات ئەوا با سەرپێچی نەكات).

## جیاوازی نێوان نزری گوێڕایەڵی و سەرپێچی و بۆ جگە لە خوا :

### نزری گوێڕایەڵی بۆ خوا :

وەكو سوێند خواردنە بە خوای گەورە، دادەمزرێت (جیٚ بە جیٚ كردن یان كەفارەتی لەسەرە) واجیبە لەسەری جێبەجێی بكات .

### نزری سەرپێچی بۆ خوا :

وەكو سوێند خواردنە بە خوای گەورە، دادەمزرێت (جیٚ بە جیٚ كردن یان كەفارەتی لەسەرە) حەرامە لەسەری جێبەجێی بكات .

### نزر بۆ جگە لە خوا :

وەكو سوێند خواردن بە جگە لە خوا، دانامەزرێت، وە پێویستە خاوەنەكەی تەوبە بكات، چونكە شیركی گەورەیە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** واجیب بوونی جیٚ بە جیٚ کردنی نزر ( تەنها نزری گوێڕایەڵی ئەگەر بۆ خوا بوو).

**دووەم :** ئەگەر سەلمێنرا کەوا پەرستنە بۆ خوا، ئەوا ئەنجامدانی بۆ جگە لە خوا شیرکە .

**سێیەم :** نزری سەرپێچی نابێت جیٚ بە جیٚ بکرێت (وە کەفارەتی سوێندی دەکەوێتە سەر).

### تێبینی :

نزر و سوێند خواردن حوکمەکانیان نزیکی یەکترن، بۆیە فەقیهەکان لە یەك بەشدا هەردوو باسەکەیان کۆکردووەتەوە دەڵێن : بەشی سوێندخواردن و نزرەکان .

## ١٣/ بەشی : لە جۆرەکانی شیرك پەناگرتنە بە جگە لە خوا

## (لە شتێکدا هیچ کەسێك توانای لەسەر نییە تەنها خوا نەبێت)

### بەڵگەی یەکەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقًا ٦ ﴾

- (يَعُوذُونَ) : خۆیان دەدەنە پاڵ، جا وشەی (العیاذ) بۆ ئەو شتەیە لێی دەترسێت و وشەی (اللّياذ) بۆ ئەو شتەیە ئومێدی پێی هەبێت .
- (فَزَادُوهُمۡ رَهَقًا) : ترس و دڵەڕاوکیٚ لە دڵدایە، وە ماندوویەتی و شەکەت بوون لە جەستەدایە، وە خۆدانە پاڵ جگە لە خوا هیچ سوودێکی بۆ کەسەکە نییە، بەڵکۆ ماندووبوون و شەکەتی زیاتر دەکات، ئەوەش شیرکی گەورەیە، بۆیە بە پێچەوانەی مەبەستەکەی خۆی سزا درا .

## بەڵگەی دووەم :

لە (خەولە ی کچی حکیم السلمیة) وە ریوایەت کراوە دەڵێت : گوێم لێ بوو پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی : ( من نزل منزلاً ثم قال : (أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق) لم يضره شيء حتى يرحلَ من منزله ذلك ) (رواه مسلم) واتە : هەر کەسێك چووە ماڵێك (لە ماڵێك یان لە جێگایەك لایدا)و ئەمجار گوتی : (پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە خراپەی هەموو ئەوانەی کە دروستی کردووە ) ئەوا هیچ شتێك زیانی پێناگەیەنێت تاوەکو ئەو ماڵە بە جێ دەهێڵێ )).

- **(منزلاً) :** ئەو جێگەیە دەگرێتەوە لێی دەمێنێتەوە بە مەبەستی نیشتەجێ بوونی بەردەوام، یان لە ناکاو بوو وەکو کەشتی .
- (أعوذُ) : خۆم دەدەمە پاڵ وشەکانی خوا و پشتی پێ دەبەستم، وشە گەردوونی و شەرعییەکان .
- **(التامَّات) :** ١/ راستگۆیی لە هەواڵەکاندا .   ٢/ دادپەروەری لە حوکمەکاندا .
- **(شر ما خلق) :** خراپە (الشر) نادرێتە پاڵ خوای گەورە، چونکە خراپە (الشر) ی لەبەر حیکمەتێك دروست کردووە، بەشەکانی دروستکراوەکان : .

١. خەیرێکی پوخت و تەواوە : وەکو بەهەشت و پێغەمبەران و فریشتەکان .

٢. خراپەیەکی تەواو : وەکو ئاگر و ئیبلیس بە پێی خودی خۆیان، بەڵام بە پێی حیکمەت لە دروستکردنیاندا ئەوا خەیرە.

٣. خراپە و خەیری تێدایە : وەکو مرۆڤ و جنۆکە و ئاژەڵ .

- **(لم يضره شيء) :** هەواڵێکە و نابێت خیلاف تێدا بێت لە لایەن ئەو کەسەوە هەواڵەکەی داوە، چونکە ئەوە قسەی راستگۆی باوەڕ پێکراوەو پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، بەڵام ئەگەر نەهاتە دی، ئەوە لە بەر بوونی رێگرێکە نەك لەبەر کەمی و قصوری هۆکارەکە بێت یان خیلاف هەواڵەکە بێت، وەکو خوێندنەوەی سورەتی (الفاتحة) بەسەر نەخۆشدا بۆ ئەوەی چاك ببێتەوە، کەچی هەندێ کەس دەیخوێننەوە و نەخۆشەکە چاك نابێتەوە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (الجن) ﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقًا ۝٦ ﴾

**دووەم :** ئەو کارە شیرکە (شیرکی گەورەیە، واتە پەناگرتن بە جگە لە خوا لە شتێکدا هیچ کەسێك توانای لەسەر نەبێت تەنها خوا نەبێت) .

**سێیەم :** بە بەڵگەهێنانەوەی فەرموودە بۆ ئەوە، چونکە زانایان ئەمە دەکەنە بەڵگە کە وشەکانی خوا دروستکراو نییە، چونکە پەناگرتن بە دوستکراوە شیرکە (شیرکی گەورەیە، لە نمونەی ئەم کارانەدا، جا ئەگەر دروست کراو بوایە ئەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێنمویی نەدەکردین بۆ پەناگرتن پێی) .

**چوارەم :** فەزڵی ئەم دوعایە هەرچەندە کورتە (هیچ شتێك زەرەرت پێ ناگەیەنێت تاوەکو لەو جێگایەدا بیت )

**پێنجەم :** ئەو شتەی سوودێکی دنیایی بە دەست بهێنێ، لە نەهێشتنی خراپە یان بە دەستهێنانی قازانجێك، بەڵگە نییە لە سەر ئەوەی کەوا ئەوە شیرك نییە (جا بە دەستهێنانی قازانجێك مەرج نییە ئەوە شیرك نەبێت).

### چەند سوودێکی تر :

لە فەرموودەکەدا بەڵگەی ئەوە هاتووە کەوا شەرع هیچ کارێك لە کارەکانی نەفامی پوچەڵ ناکاتەوە ئیللا باسی کارێکی لەو چاکتر کردووە، لەوانە : ئەوان لە نەفامیدا پەنایان دەگرت بە جنۆکە، خوای گەورە بۆی گۆڕین بەم وشانە .

ئەمەش ڕێگایەکی سەلامەتە پێویستە کەسی بانگخواز لەسەری بڕوات، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر هاتوو دەرگایەکی خراپەی لە خەڵکی داخست ئەوا واجیبە دەرگایەکی خەیریان بۆ بکاتەوە، ئەمەش نمونە زۆرە لەسەری لە قورئان و فەرموودەدا .

## ١٤/ بەشی لە جۆرەکانی شیرك پەناگرتنە بە جگە لە خوا یان داواکردن لە جگە لەو .

### بەڵگەی یەکەم تاکو پێنجەم :

١. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ.. ﴾

٢. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ ﴾

٣. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾

٤. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ ﴾

٥. وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ( إنه لا يستغاث بي، وإنما يستغاث بالله عز وجل ) واتە : هاوار بە من ناکرێت (داوا لە من ناکرێت)، بەڵکو تەنها هاوار بە خوا دەکرێت (داوا لە خوا دەکرێت).

(وَلَا تَدۡعُ) : دوعای پەرستن و داواکردن لە شتێکدا هیچ کەسێك توانای لەسەر نییە تەنها خوا نەبێت .

(عِندَ ٱللَّهِ) : پێشخستنی ئەوەی تێدایە کە حەقی دواخستنە، سوودی (حصر) دەگەیەنێت، واتە : بە دوای رزقدا بگەڕێن لە کاتێکدا لای خوای گەورەیە نەك لای جگە لە ئەو، جا ئەوان ئەو بتانە دەپەرستن کەچی پێدان و دابین کردنی هیچ رزقێکیان بە دەست نییە .

(وَٱعۡبُدُوهُ) : ئاماژەیە بۆ جێ بە جێ کردنی پەرستن بۆ ئەو کەسانەی شوێنی رزق و هۆکارەکەی دەکەوێت.

(وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓ) : چونکە نیعمەت تاقیکردنەوەیە و پێویستی بە سوپاسگوزارییە، بە دڵ و زمان و ئەندامەکان .

(يُجِيبُ) : داوا لە کەسێك ناکات تەنگانەکەی لەسەر لادات و کێشەکانی بۆ چارەسەر بکات کەچی ناتوانێت .

(منافق) : (دووڕوو ): ئەو کەسەیە کە ئیسلام ئاشکرا دەکات و کوفر دەشارێتەوە، وە ئازاردان لە نەرێتی ئەوە .

**بەشەکانی رزق و رۆزی**

**گشتییە :** بۆ هەموو دروستکراوێك، ئەویش یان حەڵاڵە وە یان حەرامە .

**تایبەتە بە ئیمانداران :** ئەویش ئیمان و تەقوا و کاری چاکە یە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** (عطف) کردنی دوعا لەسەر (استغاثة) لە جۆر و باسی (عطف) ی گشتییە لەسەر تایبەتی .

**دووەم :** تەفسیری ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت : ﴿ وَلَا تَدۡعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ﴾

**سێیەم :** ئەم کارە شیرکی گەورەیە .

**چوارەم :** ئەگەر چاکترین کەس ئەنجامی بدات بە مەبەستی رازی کردنی جگە لە خوا، ئەوا دەبێتە یەکێك لە ستەمکاران (ئەم نەهییە رووبەرووی کەسێك وتراوە کە هەرگیز ناکرێت ئەنجامی بدەن بە پێی حاڵەکەی چونکە پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، جا بۆ ئەو کەسانەی کە دەکرێت ئەنجامی بدەن نەهییەکە لە پێشترە).

**پێنجەم :** تەفسیری ئەو ئایەتەی لە پاش ئەو هاتووە ﴿ وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ .. ﴾ جا ئەگەر هیچ کەسێك زەرەر و زیان لانادات ئیللا ئەو نەبێت، ئەوا پێویستە هەموو پەرستن و داواکردنەکانمان تەنها بۆ ئەو بێت.

**شەشەم :** ئەو شتە لە دونیادا سوودی لێ نابینێ لە گەڵ ئەوەشدا کوفرە ( کەوابوو خەسارەتمەندی دونیا و دوارۆژ بوو).

**حەوتەم :** تەفسیری ئایەتی سێیەم : ﴿ فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ ﴾ .

**هەشتەم :** داواکردنی ریزق لە هیچ کەسێك ناکرێت تەنها لە خوا نەبێت، هەروەکو چۆن بەهەشت لە هیچ کەسێك داوا ناکرێت تەنها لەو نەبێت.

**نۆیەم :** تەفسیری ئایەتی چوارەم : ﴿ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾.

**دەیەم :** هیچ کەسێك لەوە گومڕاتر نییە کە داوا لە جگە لە خوا دەکات (چونکە مەبەست لە پرسیارکردنەکە لێرەدا نەفی یە)

**یازدەیەم :** ئەو کەسەی داوای لێ دەکرێت بێ ئاگایە لە داوای ئەوەی داوای لێ دەکات و زانیاری دەربارەی نییە .

**دوازدەیەم :** ئەو داواکردنە هۆکارە بۆ رق لێبوون و دوژمنایەتی نێوان داواکار و داوالێکراو.

**سیازدەیەم :** ئەو داواکردنەی ناوناوە بە پەرستنی کەسی داوالێکراو .

**چواردەیەم :** کوفری کەسی داوالێکراو بەو پەرستنە (ڕەد دانەوە و ئینکاری کردنی).

**پازدەیەم :** هۆکاری ئەوەی دەبێتە گومڕاترین کەس: ١/ چونکە داوا دەکات لە جگە لە خوا و هەرگیز وەلامی داواکەی نادرێتەوە. ٢/ ئەوانەی داوایان لێ دەکرێت بێ ئاگان لەو داوایانەی لێیان دەکرێت . ٣/ ئەو کەسێکی بێباوەڕە بە هۆی پەرستنیانەوە )

**شازدەیەم :** تەفسیری ئایەتی پێنجەم : ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ ﴾.

**حەڤدەیەم :** کارەکە زۆر سەیرە ! ئەویش ئەوەی، بت پەرستەکان دان دەنێن بەوەدا کەوا هیچ کەسێك لە تەنگانەدا وەلامیان ناداتەوە تەنها خوا نەبێت، بۆیە لە کاتی تەنگانەدا تەنها داوا لە ئەو دەکەن و ئیخلاصی دینەکەیان بۆ دەبێت.

**هەژدەیەم :** پاراستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ پاراستنی تەوحید و بە ئەدەب بوون لە گەڵ خوادا ( چونکە ئەو دەزانێت کەوا ئەم ئوممەتە خۆی دەداتە پاڵ خوای تاك و تەنها لە تەنگانەدا، وە هاوار بە هیچ کەسێك ناکرێت تەنها خوا نەبێت).

## تاقیکردنەوە لە بەشی دووەم ( ٩ بەشەکە )

**پرسیاری یەکەم :** جیاوازییەکانی نێوان ئەم جۆرە نزرانە بنووسە :

| نزری گوێڕایەڵی | نزری سەرپێچی | نزر بۆ جگە لە خوا |
|---|---|---|
| ١/........................... | ........................... | ........................... |
| ٢/........................... | ........................... | ........................... |
| ٣/........................... | ........................... | ........................... |

**پرسیاری دووەم :** حوکمی ئەم کردارانەی خوارەوە بنووسە : (بە هەڵبژاردنی ژمارەی گونجاو بۆ هەر کارێك : (١) دروستە، (٢) مەکروهە، (٣) تاوانی بچووکە، (٤) تاوانی گەورەیە، (٥) شیرکی بچووکە، (٦) شیرکی گەورەیە، (٧) وردەکاری تێدایە، (٨) واجیبە، (٩) موستەحەببە .

| کردار | حوکمەکەی | کردار | حوکمەکەی |
|---|---|---|---|
| خۆشویستن لە گەڵ خوادا | ............ | خۆشویستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) | ............ |
| خۆشویستنی خێزان | ............ | گومان لە کوفری ئەهلی کیتاب | ............ |
| مەصحەف بەمەبەستی دوورخستنەوەی چاو | ............ | دوعاکردن لەو کەسەی دەزوویەکی هەڵواسیوە | ............ |
| لەعنەت کردن لە کەسێکی دیاریکراو | ............ | هەڵواسینی تەمیمە | ............ |
| ئەڵقەی هاوسەر گیری (الدبلة) | ............ | خۆپاککردنەوە بە پاشەڕۆی ئاژەڵ یان بە ئێسك | ............ |
| دەستهێنان بە ژوورەکەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) | ............ | تەبەڕوك کردن بە خوێندنەوەی قورئان | ............ |
| دیاریکردنی شوێنێکی دیاری کراو بە نزر | ............ | هاوارکردن بە دروستکراوەکان | ............ |
| ئامادەبوون لە جەژنی بێباوەڕاندا | ............ | نزر بۆ جگە لە خوا | ............ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| نزری سەرپێچی | ............ | ترسان لە جنۆکە | ............ |
| هەڵواسێنی پارچە پەڕۆیەك یان نەعلێك | ............ | هەڵواسینی چەند ئایەتێك لە قورئان | ............ |
| هەڵواسینی دەزووی جوانی | ............ | تەمیمە لە قورئان | ............ |
| روقیە بە جگە لەزمانی عەرەبی | ............ | زیکرکردن بە ناوەکانی خوا بە جگە لە زمانی عەرەبی | ............ |
| دەستهێنان بە بەردە رەشەکەدا | ............ | خواردنەوەی ئاوی زەمزەم بە مەبەستی چارەسەر | ............ |
| سەرف کردنی سەروەت و سامان بۆ بەرژەوەندییەك | ............ | زانینی جێگای مزگەوتی (ضرار) | ............ |
| وتنی : هاوار دەکەینە پێغەمبەری خوا (ﷺ) | | | |

**پرسیاری سێیەم :** نیشانەی (×) لە شوێنی گونجاودا دابنێ یان دەستەواژەکە تەواو بکە:

١/ تەفسیری تەوحید بریتییە لە : بەشی دووەم بەشی شەشەم هەمووی

٢/ راڤەی ناونیشانەکە ئەو بەشانەیە لە پاشی دێن تاوەکو :

کۆتایی کتێبەکە کۆتاییە بەشەکە

٣/ نوسەر –رەحمەتی خوای لێ بێت– تەفسیری تەوحیدی کردووە بە :

دژەکەی چەند کارێکی ئاشکرا هەمووی

٤/ بەشی دووەم لە کتێبەکە چەند بەشی تێدایە ؟ ٥ ٩ ٧

٥/ ﴿ يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ﴾ واتە : .....................................

٦/ بەشەکانی خۆشویستن :

١/.............................. حوکمەکەی ..............................

٢/.............................. حوکمەکەی ..............................

٣/ .............................. حوکمەکەی..............................

٧/ خۆشەویستی بۆ خوا بە

.................. و ......................و.................و........... دەبێت .

٨/ **هۆکارەکانی حەرامبوون تەمیمە بە قورئان بنووسە :**

**١/.........................................**

**٢/.........................................**

**٣/.........................................**

**٤/.........................................**

**٩/ مەرجەکانی دروستی روقیە چین ؟**

١/.........................................................

٢/.........................................................

٣/.........................................................

١٠/ هۆی هێنانەوەی ئایەتی ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ﴾ لە بەشی (لە جێگایەکدا ئاژەڵ سەرنابردرێت کە بۆ جگە لە خوا ئاژەڵی تێدا سەربرابێت):.............................

١١/ هۆی هێنانەوەی ئایەتی :﴿ يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ ﴾ لە بەشی ( لە بەشەکانی شیرك نزرکردنە بۆ جگە لە خوا) ...............................................

**١٢/ پێناسەی نزر لە شەرعدا بکە :**..................................................

١٣/ گرێدان و دامەزراندنی نزر واتە : ..........................................

١٤/ (فيما لا يملك ابن آدم) واتە : .............................................

١٥/ (بوانة ) واتە : ......................... (لا يَجُوزُهُ) واتە : .........................

١٦/ مزگەوتی (ضرار) دروست کرا بە مەبەستی کوفرو .................. و ....................و.................

١٧/ بۆ لە جێگایەکدا ئاژەڵ سەرنابڕین بۆ خوا ئەگەر بۆ جگە لە خوا ئاژەڵی تێدا سەربڕابێت ؟ ١/................................. ٢/ ..........................

٣/.....................................

١٨/ بۆ فەرمووی : (هاوار بە من ناکرێت ) ؟.......................................

١٩/ (آوی) واتە : .............. (محدثاً) واتە : لە ............یان.......................

٢٠/ (لعن والدیه) واتە : ...................... أو ...............................

٢١/ ﴿ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ١٦٣ ﴾ واتە:................ یان .......................

٢٢/ ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ﴾ واتە : ........................ ﴿ٱللَّٰتَ﴾ واتە ..................

٢٣/ ﴿وَٱلْعُزَّىٰ ﴾ واتە : ............. ﴿وَمَنَوٰةَ﴾

واتە : ....................یان لە ..................وەرگیراوە .

٢٤/ (أعوذ) واتە :...................... (بکلمات الله) واتە :...........................

٢٥/ بەشەکانی تەبەڕوك چین ؟ ١/ ........................ ٢/........................

وە جیاوازی دەکەین لە نێوانیاندا بەوەی ...................................

٢٦/ بەشەکانی خەڵکی لە بیانوو هێنانەوە بە نەزانیندا :

١/.....................................................

٢/.....................................................

٢٧/ کەسانێك هەن نوێژ دەکەن و ڕۆژوو دەگرن و زەکات دەدەن، کەچی دەچن بۆ سەر قەبران و سوژدەیان بۆ دەبن جا ئەم کارە :

کوفری گەورەیە　　کوفری بچووکە　　تاوانە گەورەکانە　　دووڕووییە

٢٨/ شیرکی گەورە دابەش دەبێت بۆ : ٣ بەش　　٤ بەش　٢ بەش

٢٩/ ئاژەڵ سەربڕین دابەش دەبێتە : ٣ بەشەوە　　٤ بەشەوە

٣٠/ ﴿ إِنَّنِي بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ٢٦ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى ..﴾ ئەم ئایەتە چی تێدایە؟

مانای (لا إله إلا الله )　　تەنها دروستکار شایستەی پەرستنە

بێ دەسەڵاتی بتەکان　　هەموو ئەوانەی باسکرا

٣١/ ﴿ أَحْبَارَهُمْ ﴾ واتە : زاناکانیان　　خواپەرستەکانیان

٣٢/ (وَرُهْبَـٰنَهُمْ) واتە : خواپەرستەکانیان　　زاناکانیان

٣٣/ (أَرْبَابًا) شیرکە لە : خۆشویستندا گوێڕایەڵیدا

٣٤/ خەڵکی لە دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە بوونەتە :

دوو بەش و ناوەندێك دروست و شیرکی گەورە و بچووك

٣٥/ ئاژەڵ سەربڕین گەورەترین پەرستنە جەستەییەکانە : **راستە** **هەڵەیە**

٣٦/ دروست نییە لەعنەت بکرێت لە خاوەن سەرپێچییەکان ئیللا لە رووی گشتییەوە نەبێت : **راستە** **هەڵەیەیە**

٣٧/ پێویستە لە سەر کەسی موسڵمان زمانی خۆی لە لەعنەت کردن بپارێزێ، لەعنەت نەکات لە هیچ کەسێك تەنها لەوانە نەبێت کە شایەنی لەعنەتن بە دەقێکی :

گشتی وەکو بێباوەڕان تایبەت وەکو سووخۆرەکان هەمووی

٣٨/ ئەو جێگایانەی ئامادە کراون بۆ دژایەتی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دروست نییە نوێژی تێدا بکرێت ئیللا لە مزگەوتەکان نەبێت : **راستە** **هەڵەیە**

٣٩/ وە ئەگەر توانرا بکرێتە جێگای گوێڕایەڵی ئەوا دەکرێت : **راستە** **هەڵەیە**

٤٠/ دروستە کۆچ و بار ببەسترێت بە مەبەستی سەردانی مزگەوتی (قباء)

**راستە** **هەڵەیە**

٤١/ رۆیشتن بۆ جێگاکانی شیرك کە ئاسەواریان نەماوە ئەوا دروستە بە مەبەستی یادخستنەوەی : **راستە** **هەڵەیە**

٤٢/ دروستە سەردانی ئەشکەوتی (حراء) بکرێت بە مەبەستی زانینی ئەوەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لەسەر بووە لە خواپەرستی : **راستە** **هەڵەیە**

٤٣/ میعراج : واتە کۆچکردنی لە مەککەوە بۆ بیت المقدس : **راستە** **هەڵەیە**

٤٤ / هەرکەسێ ئەو ناونیشانانە بگۆڕی کە رێگاکانی پێ دەدۆزرێتەوە :

لەعنەتی لێکراوە تاوانبارە

٤٥/ پیاوچاکان بە کەم دەزانن و نکۆڵی لە فەزڵیان دەکەن :

زیادەڕەوەکان کەمتەرخەمەکان ناوەندەکان

**پرسیاری چوارەم :** به درێژی باسی حوکمی نزر بکه :

نزر بۆ خوا ..............................................................

نزر بۆ جگه له خوا (شیرکی گەورەیه)....................................

له پاش وتنی :.........................................................

له پێش وتنی :.........................................................

گوێڕایەڵی : .........................................................

سەرپێچی :............................................................

دروست :.............................................................

تووڕەبوون :..........................................................

مەکروهە :...........................................................

ڕەهایه : ...........................................................

**پرسیاری پێنجەم :** بۆشاییەکانی خوارەوه بەم وشانه پڕ بکەرەوە :

(نەزر – دووڕوو – روقیه – التولة – تەمیمەکان – لَعَنَ)

١. .........................................پێی دەڵێن : (العزائم) وه بەڵگه هاتووه له سەر دروستی ئەگەر شیرکی تێکەڵ نەبوو .

٢. .........................................شتێکه دروستی دەکەن باوەڕیان وایه که ژن خۆشەویست دەکات لای پیاوەکەی، وه پیاو لای ژنەکەی .

٣. ..................... شتێکه لەبەر چاوەزار به منداڵاندا هەڵدەواسرێت .

٤. ..................... دەرکردن ودوورخستنەوەیه له ڕەحمەتی خوای گەورە.

٥. ..................... ئەرك خستنه سەرخۆ له شتێکدا که واجیب نییه لەسەری به ئەنجامدانی له لایەن (مکلف)ەوە.

٦. .....................ئەو کەسەیه که ئیسلام ئاشکرا دەکات و کوفر دەشارێتەوە , وه ئازاردان له نەرێتی ئەوە .

## سێیەم: پووچەڵی پەرستنی جگە لە خوا ( ٤ بەشە )

لە پاش تەفسیری تەوحید باسی ئەو بەڵگانەی کردووە کە دەلالەت دەکەن لەسەر پوچەڵبوونی پەرستنی جگە لە خوا بە چوار بەش :

پوچەڵبوونی پەرستنی بتەکان و جگە لە خوا و پەرستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) .

پوچەڵبوونی پەرستنی فریشتەکان، کە ئەوان نزیکترین کەسن لە خوای گەورەوە جگە لە کەسە تایبەتەکانی بەنی ئادەم نەبێت .

پوچەڵبوونی شەفاعەتی نەفیکراو بۆ جگە لە خوا، وە شەفاعەتی حەق هی خوای گەورەیە .

پوچەڵبوونی هیدایەتی تەوفیق بۆ جگە لە خوا، وە هیچ کەسێك خاوەنی نییە تەنها خوا نەبێت .

### ١٥/ بەشی : ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت : ﴿ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَا أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ ﴾.

- خوای گەورە بێ دەسەڵاتی ئەو بتانەی روون کردەوە، وە ئەوانە بە کەڵکی پەرستن نایەن لە چوار رووەوە :

١. ئەوانە ناتوانن هیچ شتێك دروست بکەن، وە هەرکەسێ نەتوانێت شتێك دروست بکات شایەنی پەرستن نییە .

٢. ئەوانە خۆیان لە نەبوونەوە دروست کراون، جا ئەوان پێویستیان بە جگە لە خۆیانە لەسەرەتاوە و بۆ بەردەوام بوون .

٣. ناتوانن ئەو کەسانە سەربخەن کە داوایان لێ دەکەن .

٤. ئەوانە ناتوانن خۆیان سەربخەن .

## بەڵگەی دووەم :

ئــەو ئایەتــەی خــوای گــەورە دەفــەرموێت : ﴿ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ ﴿١٣﴾ ﴾ ئایەتەکە

- (قِطۡمِيرٍ) : بریتییە لەو توێکڵە تەنکەی لەسەر ناوکی خورمایە .
- خوای گەورە پەرستنی جگە لە خۆی بە ئەم بوارانە پووچەڵ کردەوە :

١. ئەوان خاوەنی هیچ شتێك نین .
٢. ئەوانە نابیسن .
٣. ئەگەر وای دانێین ئەوانە دەبیسن ئەوا وەڵام نادەنـەوە، چـونکە ئەوانـە توانـای ئەوەیان نییە .
٤. لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە هـەموو ئەوانـە دەهێنێـت کـە لـە جگـە لـە خـوا دەپەرسترا، ئەوانیش کوفر دەکەن بەشیرکی ئەوانەی ئەوانیان کردبووە شەریك بۆ خوا .

## بەڵگەی سێیەم تا پێنجەم :

٣/ لە کتێبی (صحیح)دا هاتووە لە (ئەنەس)ەوە دەفەرموێت : (شُجَّ النبي (ﷺ) يوم أُحد، وكُسِرَتْ رَباعِيَتُه، وشُجَّ فقال : كيف يُفْلِحُ قوم شَجُّوا نبيَّهم ) فنزلتْ : ﴿ لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ ﴾ واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی (ئوحـود)دا بریـندار بـوو، ددانــی شــکاو بریـنـدار بـوو، فــەرمووی : چـۆن کۆمــەڵێك ســەرفراز دەبـن پێغەمبەرەکـەیان (ﷺ) بریـنـدار کردبێـت ؟ خــوای گــەورە ئــەم ئایەتــەی دابەزانـد :

﴿ لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ ﴾ .

٤/ وە هەر لە (صحيح)دا هاتووە لە (ابن عمر)ەوە کەوا گوێی لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) – کاتێ سەری بەرز دەکردەوە لە کۆتا کرنۆشی نوێژی بەیانیدا – دەیفەرموو : (اللهم العن فلاناً وفلاناً) لە پاش ئەوەی دەیفەرموو : (سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد) خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿ لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ ﴾ .

وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە : دوعای دەکرد لە (صفوان بن أمية) و (سهيل بن عمرو) و ( الحارث بن هشام )، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿ لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ ﴾ .

٥/ وە هەر لە (صحيح)دا هاتووە لە (أبو هريرة)وە فەرموویەتی : کاتێ ئایەتی ﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ دابەزی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستا و فەرمووی : « يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ –أو كلمة نحوها – اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ، لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ لاَ أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، ويَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) سَلِينِي من مالي مَا شِئْتِ لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ». واتە : ئەی هۆزی قورەیش – یان وشەیەك لە نمونەی ئەوە– خۆتان لە خوا بکڕنەوە، هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنم لای خوای گەورە، ئەی (عەبباسی کوڕی عبدالمطلب) هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنم لای خوا، ئەی (صفية)ی پووری پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنم لای خوا، ئەی (فاطمة ی کچی محمد) (ﷺ) هەر شتێك لە سامانەکەم ویستت لە سەرە داوام لێ بکە، دڵنیابە کە هیچ قازانجێکت پێ ناگەیەنم لە لای خوای پەروەردگار ))

- (شُجَّ) الشَّجَّة : ئەو برینەیە کە بە تایبەتی لە سەر و دەموچاودا دەبن .
- (رباعيتهُ) : ئـەو دوو ددانـەی ناوەڕاست پێـی دەڵێن : (ثنايـا) وە ئـەو دوانـەی ئەولایان پێی دەڵێن : (رباعيتين) .
- بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەوا پێغەمبـەری خـواش (ﷺ) مرۆڤـە و ئـەوەی تووشـی مـرۆڤ دەبێت تووشی ئەویش دەبێـت، هـەروەها پووچـەڵبوونی پەرسـتنی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ).
- پەند و عیبرەتی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی پەند وەردەگرن، بەوەی هیچ کەسێکی سەرپێچیکار لە رەحمەتی خوای گەورە دوور نەخەینەوە .
- (صفوان بن أمية و سهيل بن عمرو و الحارث بن هشام) ئەو سـێ کەسـە ئیسـلام بوون و بە ئیسلامەتییەکی جوان و چـاك، بۆیـە وردەبـەرەوە کـەوا دوژمنایـەتی رەنگە بگۆردرێت بۆ دۆستایەتی .

- **ئەوەی نەهی لێکراوە :**

١. لەعنەت کردن لە کەسێکی دیاریکراو لە بێباوەڕان، بەڵام لەعنەت کردن لێیـان بە شێوەیەکی گشتی ئەوا ئاساییە، وە دروستە دوعا لە کەسی بێباوەڕ بکرێت و بگوترێت : ((اللهم ! أرح المسلمين منه)) .
٢. پاڕانەوە لە خوا بە هەلاکەت چوونی هەموو بێباوەڕان، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دوعای لێ نەکردن، خوای گەورە تەقدیری وایە کە بمێننەوە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری دوو ئایەتەکە ( بەڵگەی ئەوەیان تێدایە کەوا پەرستنی بتەکان و جگە لە خوا پووچەڵە).

دووەم : چیرۆکی ئوحود ( بەڵگەی پووچەڵبوونی پەرستنی پێغەمبەری (ﷺ) خوای تێدایە جا جگە لە ئەو لە پێشترە).

**سێیەم :** قنوت کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گەورە ئەولیاکانیش لە پشتییەوە (ئامین)یان دەکرد لە نوێژەکەدا ( هیچ کەسێك لەم ئوممەتە نزیکتر نییە لە خوداوە وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی، لە گەڵ ئەوەشدا خۆیان دەدەنە پاڵ خوای گەورەو داوایان لەو دەکرد، جا جگە لەوان لە پێشترن ) .

**چوارەم :** ئەوانەی دوعایان لێ دەکرا بێباوەڕ بوون ( کەچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرانبەر بەوان هیچی بە دەست نەبوو)

**پێنجەم :** ئەوان چەند شتێکیان کرد کەوا زۆربەی بێباوەڕان نەیانکردووە، لەوانە بریندارکردنی دەموچاوی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، سووربوونیان لەسەر کوشتنی و هەروەها شێواندنی جەستەی کوژراوەکان، هەرچەندە ئەوانە ئامۆزای بوون .

**شەشەم :** خوای گەورە لەو بارەیەوە ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاند : ﴿ لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ ﴾ (جا هەموو کاروبارەکە بۆ خوایە) .

**حەوتەم :** ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت : ﴿أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ أَوۡ يُعَذِّبَهُمۡ فَإِنَّهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴾ جا خوای گەورە تەوبەی لێ وەرگرتن و ئیمانیان هێنا .

**هەشتەم :** قنوت کردن لە کاتی بەڵا و موصیبەتدا (نەوازل)دا ( دروستە نییە بکرێت ئیللا لەو کاروبارانەدا نەبێت کە لە لایەن خوداوەیە وەکو زەمینە لەرزە).

**نۆیەم :** ناوهێنانی ئەوانەی دوعایان لێ دەکرێت لە نوێژەکاندا بە ناوی خۆیان و ناوی باوکیانەوە (دروستە).

**دەیەم :** لەعنەت کردن لە کەسی دیاری کراودا لە قنوتدا ( دروست بووە لە پێشدا و ئەمجار نەهی لێکراوە) .

**یازدەیەم :** چیرۆکەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ ئەو ئایەتەی بە سەردا دابەزی: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ (ئەویش فەرمانی خوای بە جێ هێنا).

**دوازدەیەم :** هەوڵ و تێکۆشانی زۆری پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە پێناوی ئەم کارەدا، بە شێوەیەك گەیشتە ئەوەی شێتبوونی بدرێتە پاڵ، هەروەها ئەگەر هەر کەسێکی موسڵمان ئێستا بیکات ئەوا شێتبوونی دەدەنە پاڵ (بۆیە پێویستە ئەوپەڕی هەوڵ و تێکۆشان بدرێت لە بانگەوازدا بەڵام بە حیکمەتەوە).

**سیازدەیەم :** بە کەسی دوور و نزیکی فەرموو : (لاَ أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ) تەنانەت بە (فاطمة)ی کچی فەرموو : (يَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا) جا ئەگەر بە ئاشکرا ئەوەی دووپاتکردەوە کەوا ئەو هیچ سوودێك بە گەورەی ئافرەتانی جیهانیان ناگەیەنێت – لە کاتێکدا خۆیشی گەورەی پێغەمبەرانە –، وە مرۆڤ باوەڕی وا بێت کەوا هیچ ناڵێت تەنها حەق نەبێت، ئەمجار تەماشای ئەوەی کرد کە تووشی دڵی خەڵکی بووە لە ئەمڕۆدا، بۆی روون دەبێتەوە کە خەڵکی چۆن وازیان لە تەوحید هێناوەو دین نامۆ بووە ( ئەوەی سوود بەخشە بە نیسبەت پێغەمبەری خواوە(ﷺ) باوەڕهێنانە پێی و شوێنکەوتنیەتی، ئەمجار کەسی ئیماندار سۆز و خۆشەویستی بۆ لای پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، ئەمەش کارێکە و ئینکاری لێ ناکرێت، بەڵام کەسی موسڵمان نابێت حوکم بدات لەسەر بنەمای سۆز و خۆشەویستی، بەڵکو پێویستە شوێنی ئەوە بکەوێت کە قورئان و فەرموودە دەلالەتی لەسەر دەکەن و عەقڵی ساغ و سەلامەت پشتگیری دەکەن لە کاتی گومان و شەهەواتدا) .

## ١٦ / بەشی ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ٢٣ ﴾

- ئەمە یەکێکە لەو بەڵگانەی کە دەلالەت دەکەن لەسەر ئەوەی هیچ کەسێك شایستەی ئەوە نییە ببێتە شەریك لە گەڵ خوادا، چونکە ئەوەتا فریشتەکان کە نزیکترین دروستکراوی خوان –جگە لە کەسە تایبەتەکانی نەوەی ئادەم نەبێت – کەچی تووشی ئەو ترسە زۆرە دەبن لە کاتی بیستنی قسەی خوای گەورەدا.

### باوەڕهێنان بە فریشتەکان، چی لە خۆ دەگرێت ؟

- ئەوە لە خۆ دەگرێت کەوا : باوەڕمان هەبێت ئەوان جیهانێکی غەیبین، خوای گەورە ئەوانی لە روناکی دروست کردووە، گوێڕایەڵی خوا دەکەن و سەرپێچی ناکەن، ئەوان رۆح و عەقڵ و جەستە و دڵیان هەیە، باوەڕمان پێیان هەیە و بەو هەواڵانەی خوای گەورە دەربارەی کارو صیفات و ناو و هەواڵیان داویەتی و ئەوەی لە بارەی ئەوانەوە هاتووە .

(فُزِّعَ) : ترسی لە ناکاو لەسەر دڵیان روویاوە .

(وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ) : ئەهلی سوننە ئەوە دەسەلمێنن کەوا : ١/ بەرزی زاتی خۆی .
٢/ بەرزی صیفاتەکانی ٣ / بەرزی زاڵبوونی بەسەر هەموو دروستکراوەکاندا . .

سوود بە دەست هاتووەکانی ئایەتەکە :

فریشتەکانش لە خوای گەورە دەترسن، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ ﴾

سەلماندنی دڵ بۆ فریشتەکان، خوای گەورە دەفەرموێت : (حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ).

سەلماندنی ئەوەی : ئەوان خاوەنی جەستەن و تەنها گیانێك نین بە بێ جەستە، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِيٓ أَجْنِحَةٖ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ ﴾

ئەوان خاوەنی عەقڵن، چونکە دڵەکان عەقڵی لە خۆ گرتووە .

سەلماندنی قسە بۆ خوای گەورە و ئەوەش پەیوەستە بە ویستی خوداوە .

سەلماندنی ئەوەی قسەی خوای گەورە حەقە، حەقیش لە قسەدا واتە:

١/ راستگۆیی لە هەواڵەکاندا. ٢/ دادپەروەری لە ئەحکامەکاندا، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ ﴾ .




**بەڵگەی دووەم :**

لە (الصحيح)دا هاتووە لە (أبو هريرة)وە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرموویەتی :

((إذا قضى الله الأمر في السماء ضربت الملائكة بأجنحتها خضعاناً لقوله، كأنه سلسلة على صفوان، ينفذهم ذلك حتى إذا فزع عن قلوبهم، قالوا : {ماذا قال ربكم؟} قالوا: الحق وهو العلي الكبير، فيسمعها مسترق السمع، ومسترق السمع هكذا بعضه فوق بعض – وصفه سفيان بكفه فحرفها وبدد بين أصابعه – فيسمع الكلمة فيلقيها إلى من تحته، ثم يلقيها الآخر إلى من تحته، حتى يلقيها على لسان الساحر أو الكاهن، فربما أدركه الشهاب قبل أن يلقيها، وربما ألقاها قبل أن يدركه، فيكذب معها مائة كذبة، فيقال : أليس قد قال لنا يوم كذا وكذا: كذا وكذا ؟ فيصدق بتلك الكلمة التي سمعتْ من السماء"

واتە : ئەگەر خوای گەورە فەرمانێکی دا لە ئاسمانەکاندا فریشتەکان باڵیان دەدەن بە یەکدا وەکو زەلیلی نواندنێك بۆ فەرمانەکانی خوا، هەروەکو زنجیرێك بەسەر بەردێکی لووس و رەقدا دابێت، ئەم دەنگە دەگاتە هەموو جێگایەك کاتێ ترسەکە لە دڵیان رووایەوە و نەما، وتیان : پەروەردگارتان چی فەرموو ؟ وتیان : حەقی فەرموو هەر خۆی بەرز و مەزنە، ئەو کات لەوانەی گوێقلاّغ دەبەن گوێیان لێ دەبێت، وە گوێقلاّغەکان ئا بەم شێوەن هەندێکیان لە سەر هەندێکی ترن – سوفیان بە لەپی دەستی وەصفی شێوازەکەی کرد و بە سەر یەکەوە پەنجەکانی لە یەك جودا کردەوە – ئەویش وشەکە دەبیسێ و دەیداتە گوێی ئەوەی خوارەوەی خۆی، ئەمجار ئەویتر دەیداتە گوێی ئەوەی خوارەوەی خۆی، تا دەیخەنە سەر زاری جادووبازەکە یان کاهینەکە، رەنگە پێش ئەوەی بگاتە لای جادووبازەکە ئەستێرەیەك لێی بدات، وەرەنگە بگاتە لای جادووبازەکە پێش ئەوەی ئەستێرەکە لێی بدات، ئەمجار ئەویش سەد درۆی لە گەڵدا دەکات، خەڵکیش دەڵێت : ئایە فلاّن رۆژ فلاّن قسەی بۆ نەکردین و قسەکەی تەواو بوو ؟ بۆیە بە هۆی ئەو وشەیەوە کە لە ئاسمانەوە بیستی خەڵکی باوەڕ بە قسەکانی دەکات)).

- **(صفوان) :** بریتییە لە بەردێکی لووسی رەق، وە دەنگی زنجیرەکە بە سەریدا دەنگێکی مەزنی دەبێت، مەبەست لێی شوبهاندنی ئەو ترسەی بە سەریاندا دێت کاتێ گوێیان لە قسەکانی دەبێت .
- **(ینفذهم ذلك) :** ئەم دەنگە دەگاتە هەموو جێگایە دەنگ پێی بگات.

**سوود بە دەست هاتووەکانی فەرموودەکە :**

- سەلماندنی قسەکردن بۆ خوای گەورە و سەلماندنی مەزنی خوای گەورە، وە هیچ شتێك لە خوای گەورەوە دەرناچێت ئیللا حەق نەبێت .
- سەلماندنی باڵ و قسە و عەقڵ بۆ فریشتەکان، وە ئەوان دەترسن و ملکەچی خوا دەبن .

- خوای گەورە خۆی توانای بەو جنۆکانە بەخشیوە بگەنە ئاسمان بۆ ئەوەی ببێتە تاقیکردنەوەیەك و فیتنەیەك بۆ خەڵكی .
- زۆری جنۆکە، وە جەستەیان سووکە و بە فڕین دەفڕن .
- کاهینەکان درۆزنترین خەڵکن، بۆیە چەندین درۆ دەخەنە پاڵ ئەوەی بیستوویانە .
- کەسی جادووباز شتێ پیشانی کەسی جادوولێکراو دەدات کە ڕاستی نییە، بۆیە پێویستە لێی بە ئاگا بین .قوناغەکانی گوێقلاغ کردن لە لایەن جنۆکەوە :

١. لە پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێقلاّغی زۆر بووە .
٢. کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەوانە کرا ڕێگریان لێکرا چیتر گوێقلاّغی بکەن .
٣. لە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جارێکی تر گەڕانەوە بۆ گویقلاّغی بەلاّم بە کەمی .

## بەڵگەی سێیەم :

لە (النواس بن سمعان)ەوە هاتوە دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :

((إِذَا أَرَادَ اللَّه تعالى أَنْ يُوحِي بِالأمر، تَكَلَّمَ بِالْوَحْيِ أَخَذَتِ السَّمَاوَات منه رَجْفَة - أَوْ قَالَ: رَعْدَة - شَدِيدَة، خَوْفًا مِنَ اللَّه عَزَّ وَجَلَّ، فَإِذَا سَمِعَ ذَلِكَ أَهْل السَّمَاوَات صعِقُوا وَخَرُّوا لِلَّهِ سُجَّدًا، فَيَكُون أَوَّل مَنْ يَرْفَع رَأْسه جِبْرائيل، فَيُكَلِّمهُ اللَّه مِنْ وَحْيه بِمَا أَرَادَ، ثم يمرُّ جِبْرائيل عَلَى الْمَلَائِكَة، كُلَّمَا مَرَّ بِسَمَاءٍ سَأَلَهُ مَلَائِكَتهَا : مَاذَا قَالَ رَبّنَا يَا جِبْرائيل ؟ فَيَقُول جِبْرائيل: قَالَ الْحَقّ وَهُوَ الْعَلِيّ الْكَبِير، فَيَقُولُونَ كُلّهمْ مِثْل مَا قَالَ جِبْرائيل، فَيَنْتَهِي جِبْرائيل بِالْوَحْيِ حَيْثُ أَمَرَهُ اللَّه عزَّ وجل)) .

واتە : ئەگەر خوای گەورە – بەرز و پیرۆز بێت – ویستی وەحی بە فەرمانێك بکات، بە وەحییەکە قسە دەکات، ئەو کات ئاسمانەکان بە هۆی ئەو قسەیەوە دێنە لەرزە – یان فەرمووی : گرمەیەکی توند – لە ترسی خوای پەروەردگاردا، جا ئەگەر ئەهلی ئاسمانەکان ئەوەیان بیست هەموو دادەچەڵەکێن و دەچنە سوژدە بۆ خوای

گەورە، جا یەکەم کەسێك سەر بەرز دەکاتەوە جبرائیلە، جا خوای گەورە ئەوەی بیەوێ وەحی بۆ جبرائیل دەکات، ئەمجار جبرائیل بە فریشتەکاندا تێدەپەڕێت، هەر کاتێك بە هەر ئاسمانێکدا تێپەڕێت فریشتەی ئەو ئاسمانە لێی دەپرسن، ئەی جبرائیل پەروەردگارمان چی فەرموو ؟ جبرائیل دەفەرموێت : حەقی فەرموو، هەر ئەو بەرز و بڵند و مەزنە، ئەمجار هەموویان وەکو ئەوە دەڵێن کە جبرائیل فەرمووی، جا جبرائیل وەحییەکە دەگەیەنێتە ئەو شوێنەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووە )).

## سوود بە دەست هاتووەکانی فەرموودەکە :

- سەلماندنی ئیرادە بۆ خوای گەورە، ئەویش دوو بەشە :
  ١/ ئیرادەیەکی شەرعی .
  ٢/ ئیرادەیەکی گەردوونی (کەونی) .
- دروستکراوەکان هەرچەندە بێ گیان بن هەست بە مەزنی دروستکارەکەیان دەکەن .
- بوونی چەند ئاسمانێك، وە هەر ئاسمانە و فریشتەی تایبەتی خۆی هەیە .
- فەزڵی جبرائیل، ئەوەتا ئەو ناسراوە بە ئەمانەت پارێزی وەحی و ئەویش ئەمین و سپاردە پارێزە .

## سەلماندنی عیززەت و شکۆمەندی بۆ خوای گەورە (عزَّ وجل) :



## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکە : ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ ﴾

**دووەم :** ئەو بەڵگانەی تێدایە لەسەر پووچەڵبوونی شیرك، بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەستن بە پیاوچاکانەوە، ئەویش ئەو ئایەتەیە کە دەڵێن : دەماری داری شیرك لە دڵەکاندا دەبڕێت .

**سێیەم :** تەفسیری ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت : (قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ٢٣).

**چوارەم :** هۆی پرسیار کردنەکەیان دەربارەی ئەوە ( توندی و سەختی ترسەکەیانە) .

**پێنجەم :** جبرائیل وەڵامیان دەداتەوە لە پاش ئەوە دەڵێت : (قال كذا وكذا).

**شەشەم :** باسی ئەوەی کردووە کەوا یەکەم کەس سەری بەرز دەکاتەوە جبرائیلە (ئەمەش بەڵگەی فەزڵی ئەوە) .

**حەوتەم :** ئەو قسەیە بە هەموو ئەهلی ئاسمانەکان دەڵێت چونکە پرسیاری لێ دەکەن ( ئەمەش بەڵگەی مەزنی ئەوی تێدایە لە ناویاندا) .

**هەشتەم :** ئەو بورانەوە هەموو ئەهلی ئاسمان دەگرێتەوە .

**نۆیەم :** لەرینەوە و هاتنە لەرزەی ئاسمانەکان بە هۆی قسەی خوای گەورەوە (لەبەر مەزنی خوای گەورە) .

**دەیەم :** جبرائیل وەحییەکە دەگەیەنێتە ئەو جێگەیەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووە (چونکە ئەو دەست پاك و سپاردە پارێزە) .

**یازدەیەم :** باسی گوێقلاغی شەیتانەکان .

**دوازدەیەم :** شێوازی سواربوونی هەندێکیان بەسەر ئەوانی تردا .

**سیازدەیەم :** ناردنی ئەستێرە (شیهاب) ( ئەو کەسانە دەسوتێنێ کە گوێقلاغ بوون).

**چواردەیەم :** هەندێ جار ئەستێرەکە لێی دەدات پێش ئەوەی پێی بگات، وە هەندێ جار دەیگەیەنێتە گوێی دۆستەکەی خۆی لە مرۆڤەکان، پێش ئەوەی ئەستێرەکە (شیهابەکە) لێی بدات .

**پازدەیەم :** هەندێ جار کاهینەکان راست دەکەن .

**شازدەیەم :** لە گەڵیدا سەد درۆ دەکەن (لە رووی زیادەڕەوییەوە نەك لە رووی ژمارەوە).

**حەڤدەیەم :** هیچ کەسێك باوەڕ بە درۆکانی ناکات ئیللا بە هۆی ئەو وشەیەوە نەبێت کە لە ئاسمانەوە بیستی .

**هەژدەیەم :** نەفسەکان شتی پووچ وەردەگرن، ئەگەر نا چۆن خۆیان پەیوەست دەکەن بە یەك دانەوە و عیبرەت لەو سەدەکەی تر وەرناگرن ؟

**نۆزدەیەم :** ئەوان ئەو وشە لە یەکتر وەردەگرن و لەبەری دەکەن و دەیکەنە بەڵگە بۆ خۆیان (چونکە ئەو وشەیە رەواج بە قسەکانیان دەدات، جا ئەگەر قسەکانیان هەموو درۆ بوایە ئەوا رەواجی نەبوو).

**بیستەم :** سەلماندنی صیفاتەکانی تێدایە، بە جیاواز لە گەڵ گرووی ئەشعەری و (معطلة)کاندا .

**بیست و یەکەم :** بە راشکاوی وتنی : ئەو لەرزین و بوورانەوە لە ترسی خوادایە .

**بیست و دووەم :** ئەوان دەچنە سوجدە بۆ خوای تاك و تەنها ( وەکو مەزنی بۆ خوا و خۆپارێزی لەوەی لێی دەترسن).

## ١٧/ بەشی : شەفاعەت

### بۆ نوسەر ئەم بەشەی هێناوەتەوە ؟

- لەبەر پوچەڵی شەفاعەتی بتەکان، چونکە بێباوەڕەکان باوەڕیان وابوو کەوا لای خوای گەورە شەفاعەتیان بۆ دەکەن .
- چونکە خوای گەورە زانست و توانا و دەسەڵاتی کامل و تەواوە، نەك وەکو پادشاکانی دونیا چونکە ئەوان پێویستیان بە شەفاعەتکارە لەبەر کەمی زانست و دەسەڵات و کەمی تواناکانیان، بۆیە شەفاعەت کارەکان جورئەت ئەکەن و بە بێ ئیزنی ئەوان شەفاعەت بکەن.

## بەڵگەی یەکەم تا پێنجەم :

١/ خـوای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ﴾

٢/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ﴾

٣/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ﴾ البقرة: ٢٥٥

٤/ خـوای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ ٢٦﴾

٥/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ ٢٢ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥۚ﴾

- (وَأَنذِرۡ بِهِ) : (الانذار) بریتییە لە : ئاگادارکردنەوەیەك ترس لە خۆ بگرێت، وە مانای ئەوەیە کە بە قورئان ئاگاداریان بکەرەوە.
- (وَكَم مِّن مَّلَكٖ) : واتە : ئەو فریشتانەی لە ئاسمانەکاندا چەندە زۆرن ! لە گەڵ ئەوەشدا شەفاعەتیان هیچ سوودێکی نییە ئیللا لە پاش ئیزنی خوا نەبێ و رازی بوونی لە شەفاعەتکار و لەوەی شەفاعەتی بۆ دەکرێت .
- (ٱدۡعُواْ) : بۆ تەحەددا و بێ توانایی بەرانبەرە، بە مانای ئەوەی : ئامادەیان بکەن یان لێیان بپارێنەوە بە پاڕانەوەیەکی داواکردن .

- (مِن شِرۡكٖ) : واتە : خاوەنی هیچ شتێك نین نە بەتەنها و نە بە بەشداری یەکتر.
- (مِّن ظَهِيرٖ) : نەفی ئەوەی کردووە کەوا بتەکان ببنە یارمەتیدەر، وە (ظَهِيرٖ) یارمەتیدەرە .
- ئەم بتانە خاوەنی هیچ شتێك نین لەوەی کە پەرستراوەکانیان خۆیان پێوە پەیوەست کردووە، چونکە ئەوان خاوەنی هیچ شتێك نین نە بە تەنها و نە بە بەشداری یەکتر و نە بە یارمەتیدانی یەکتر، چونکە ئەوەی یارمەتیت دەدات هەرچەندە شەریکت نەبێت ئەوا منەتی دەبێت بە سەرتدا، چونکە رەنگە پشتگیری بکەیت لە بەخشینی ئەوەی دەیەوێت، جا ئەگەر ئەم سێ کارە نەفی کرا و نەبوو، هیچ شتێك نامێنێتەوە تەنها شەفاعەت نەبێت، ئەویش خوای گەورە پووچەڵی کردووەتەوە، بۆیە شەفاعەتی ئەوانە هیچ سوودێکی نییە .
- ئەم ئایەتەو ئەوەی لە پاشی دێت، (ابن القيم) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەربارەی دەفەرموێت : (ئەم ئایەتە ئەوەیە کە دەماری داری شیرك لە دڵەکاندا دەبڕێت ).

**بەشەکانی شەفاعەت ( بریتییە لە نێوەندگیری کردن بۆ کەسێکی تر بە مەبەستی بە دەس ت هێنانی قازا نجێك یان دوورخستنەوەی زیان و زەرەرێك ) .**

**سەلێندراو :** بریتییە لەو شەفاعەتەی کە خوای گەورە بۆ خۆی سەلماندوویەتی، وە پێویستە ئەم مەرجانەی تیادا بێت :

١الجمۆڵەتدانی خوای گەورە بەو شەفاعەتە .

٢الجرازیبوونی خوای گەورە لەو کەسەی شەفاعەتەکە دەکات .

٣الجرازیبوونی خوای گەورە لەو کەسەی شەفاعەتەکەی بۆ دەکرێت.

**ئەمیش دوو جۆر :**

**شەفاعەتی نەفیکراو** ئەوەیە کە قورئان نەفی کردووە، ئەویش ئەو شەفاعەتەیە کە لە جگە لە خوا داوا دەکرێت لە شتێکدا کە هیچ کەسێك توانای لەسەر نیە تەنها خوا نەبێت . وە حوکمی ئەم جۆرە شیرکی گەورەیە .

**ئەوەی کە دروستکراوەکان توانایان لەسەر هەیە** ئەمەش دروستە بەو مەرجەی کەوا کەسی شەفاعەتکار : زیندوو بێت، توانای هەبێت، ئامادە بێت، هۆکار بێت .

﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ﴾

١/ تایبەت بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هیچ کەسێك لە گەڵیدا بەشدار نییە :

**شەفاعەتە مەزنەکە :** ئەویش بریتییە لە (المقام المحمود) کە خوای گەورە بەڵێنی پێداوە.

شەفاعەت کردن بۆ (ابو تالیب)ی مامی بۆ ئەوەی سزاکەی کەم بکرێتەوە .

شەفاعەت کردنی بە مەبەستی کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشت .

٢/ گشتییە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەموو پێغەمبەران و نێردراوان و فریشتەکان و یەکتاپەرستان و منداڵەکان (ئەوانەی بە منداڵی مردوون).

شەفاعەت کردن بۆ بەرزکردنەوەی پلەو پایەی یەکتاپەرستان لە بەهەشتدا .

شەفاعەت کردن بۆ ئەو یەکتاپەرستانەی کە شایستەن بچنە ناو دۆزەخەوە بەوەی نەچنە دۆزەخەوە.

شەفاعەت کردن بۆ ئەو یەکتاپەرستانەی چوونەتە ئاگرەوە بەوەی لە ئاگر دەرچن.

**(أبوالعباس)** دەفەرموێت : خوای گەورە هەموو ئەوەی موشریکەکان خۆیان پێوە پەیوەست کردووە نەفی کردووە جگە لە خۆی، جا نەفی خاوەنداریێتی لە جگە لە خۆی کردووە، یان هیچ بەشێکی هەبێت یان یارمەتیدەری خوا بێت، کەواتە هیچ شتێك نەمایەوە تەنها شەفاعەت نەبێت، جا ئەوەی روونکردەوە کەوا هیچ سوودێکی نییە ئیللا بۆ ئەو کەسانە نەبێت کە پەروەردگار ئیزنی پێ داون، هەروەکو دەفەرموێت : ﴿ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ ﴾ .

جا ئەم شەفاعەتەی کە موشریکەکان باوەڕیان پێی هەیە شەفاعەتێکی نەفیکراوە و بوونی نییە لە قیامەتدا، هەروەکو قورئان نەفی کردووە، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداوین کەوا دێت و بۆ خواکەی سوجدە دەبات و سوپاس و ستایشی دەکات — لە سەرەتادا بە شەفاعەت دەست پێ ناکات — ئەمجار پێی دەگوترێت : (ارْفَعْ رَأْسَكَ، وقل يُسمعْ، وسَلْ تُعْطَهْ، واشْفَعْ تُشَفَّعْ) واتە : ((سەرت بەرزکەرەوە، وە بڵێ و قسەکانت دەبیسترێت، وە داوا بکە و پێت دەبەخشرێت و شەفاعەت بکە و شەفاعەتەکەت وەردەگیرێت )) .

ئەبو هورەیرە بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) فەرموو : (من أسعد الناس بشفاعتك ؟ قال: (من قال: لا إله إلا الله، خالصاً من قلبه). واتە : کێ بەختیارترین و کامەرانترین کەسە بە شەفاعەتت ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەو کەسەیە وتبێتی : ( لا اله الا الله) بە موخلیصی و دڵسۆزییەوە لە دڵیەوە )) .جا ئەو شەفاعەتە بۆ خاوەن ئیخلاصەکانە بە ئیزنی خوا، وە بۆ کەسێك نییە شەریکی بۆ خوا بڕیار دابێت .

وە حەقیقەتەکەشی : خوای گەورە خۆی فەزڵی خۆی دەبەخشێتە ئەهلی ئیخلاص و لێیان خۆش دەبێت بە هۆی دوعای ئەو کەسەی خۆی ئیزنی پێداوە شەفاعەت بکات بۆ ئەوەی ڕێزی لێ بگرێت، وە بگاتە پلەو پایەی سوپاسکراو (المقام المحمود).

جا ئەو شەفاعەتەی کە قورئان نەفی لێکردووە ئەوەیە کە شیرکی تێدایە، بۆیە خوای گەورە شەفاعەتی سەلماندووە بە ئیزنی خۆی لە چەند جێگایەکدا، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی روونکردووەتەوە کەوا بۆ هیچ کەسێك نابێت ئیللا بۆ ئەهلی تەوحید و ئیخلاص نەبێت )) قسەکانی لێرەدا تەواو بوو .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکان (ئەوانیش پێنج ئایەتن) .

**دووەم :** صیفەتی شەفاعەتە نەفیکراوەکە (ئەویش ئەوەیە کە شیرکی تێدایە) .

**سێیەم :** صیفەتی شەفاعەتە سەلمێنراوەکە ( ئەویش شەفاعەتە بۆ ئەهلی تەوحید لە پاش ئیزن و رازیبوون) .

**چوارەم :** باسی شەفاعەتەکە گەورەکە، ئەویش پلەو جێگا سوپاسکراوەکەیە (المقام المحمود) بۆ ئەهلی (مەوقیف) .

**پێنجەم :** صیفەتی ئەو کارەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیکات، ئەویش سەرەتا بە شەفاعەت دەست پێ ناکات، بەڵکو سوجدە دەبات، جا ئەگەر ئیزنی پێدرا ئەو کات شەفاعەت دەکات ( ئەمەش بەڵگەیە لەسەر مەزنی پەروەردگار و کەمالی ئەدەبی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)) .

**شەشەم :** کێ لە هەموو کەس زیاتر دڵخۆشە بەو شەفاعەتە ؟ (ئەهلی تەوحید و ئیخلاص) .

**حەوتەم :** ئەو شەفاعەتە بۆ کەسێك نابێت کە شیرکی بڕیار دابێت .

**هەشتەم :** روونکردنەوەی حەقیقەتەکەی (خوای گەورە فەزڵی خۆی دەبەخشێتە ئەهلی ئیخلاص و لێیان خۆش دەبێت بە هۆی دوعای ئەو کەسەی خۆی ئیزنی پێداوە شەفاعەت بکات بۆ ئەوەی رێزی لێ بگرێت، وە بگاتە پلەو پایەی سوپاسکراو (المقام المحمود).

## ١٨ / بەشی ئەو ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموێت :
## ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ﴾

### بەڵگەی دووەم :

لە کتێبی (صحیح)دا هاتووە لە (ابن المسیب)ەوە لە باوکییەوە فەرموویەتی : (لَمّا حَضَرَتْ أَبا طَالِبٍ الْوَفاةُ، جاءَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) و عِنْدَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبي أُمَيَّة و أَبو جَهْلٍ، فقَالَ (ﷺ) له : ((يا عَمِّ، قُلْ : لا إلهَ إلاّ الله، كَلِمَةً أُحاجُ لَكَ بِها عِنْدَ اللهِ )) فَقَالا له : أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ المطَّلِب؟ فأعاد عليه النبي (ﷺ)، فأعادا، فكان آخر ما قال : هُوَ عَلى مِلَّة عَبْدِ المطَّلِبِ، وَأَبى أَنْ يَقُولَ: لا إلهَ إلاّ الله، فَقالَ النبي (ﷺ) : (( لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ ما لَمْ أُنْهَ عَنْكَ )) فَأَنْزَلَ اللهُ عزَّ وجل : ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ وأنزل الله في أبي طالب : ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ ﴾.

واتە : کاتێ ئەبو تالیب لە سەرە مەرگدا بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لای لە کاتێکدا (عبدالله بن أبي أمية) و (أبو جهل) ی لابوون، فەرمووی : ئەی مامە، بڵێ : (لا اله الا الله) تەنها وشەیەکە دەیکەمە بەڵگەیەك بۆ تۆ لای خوای پەروەردگار، وتیان : ئایە پشت لە دینەکەی (عبدالمطلب) دەکەیت ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووبارەی کردەوە، ئەوانیش دووبارەیان کردەوە، جا کۆتا وشەیەك وتی : ئەو لە سەر دینەکەی (عبدالمطلب) ە، وە رازی نەبوو بڵێت : (لا اله الا الله) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : دەبێ هەردەم داوای لێخۆشبوونت بۆ بکەم لای خوا ئەگەر نەهیم لێ نەکرێت )) جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ وە دەربارەی ئەبو تالیب ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ ﴾.

## بەشەکانی هیدایەت :

**هیدایـــەتی تـــەوفیق :** هـــیچ کەســێك خــاوەنی نییــە تــەنها خــوای گــەورە نــەبێت ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ﴾

**هیدایەتی دەلالەت و ڕێنمویی :** پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) خـاوەنی ئەوەیە و بە دەستێتی ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾

- نوسەر ئەم بەشـەی هێناوەتـەوە بـۆ ئـەوەی ئـەوە ڕوون بکاتـەوە کـەوا هـیچ کەسێك ناتوانێت هیدایەتی هیچ کەسێك بـدات بـە هیدایـەتی تـەوفیق، ئـەویش هەستێ بەوەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووە .
- پرسیارێك : چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو تالیبی خۆش دەوێت لـە کاتێکـدا ئەو کەسێکی بێباوەڕ بووە ؟

ماناکەی تەقدیر دەکرێت بە :

١. ئەوەی هیدایەتی ئەوت لا خۆشەویستە نەك خودی خۆیت لا خۆشەویست بێـت ( ئەمەش بەهێزترین بۆچوونەکانە) .
٢. ئەوەی کە بە خۆشویستنێکی سروشتی خۆشت دەوێت، ئەمەش دروستە .
٣. ئــەوەی خۆشــت دەوێــت پــێش ئــەوەی نــەهی بکرێــت لــە خۆشویســتنی موشریکەکان.

- (جاءَهُ رَسُولُ اللهِ(ﷺ)) : بەڵگەیـە لەسـەر موسـتەحەب بـوونی سـەردانی کەسـی بێباوەڕ ئەگەر ئومێدی ئیسلام بوونی لێ دەکرا .
- (یا عَمِّ) : ئـەو کونییـەی بـە کـار هێنـا کـە دەلالـەت دەکـات لەسـەر سـۆز و میهرەبانی، ئەمەش حیکمەتە لە کاتی بانگەوازدا .

- چـۆن کـۆ دەکەینــەوە لــە نێـوان ئــەم فەرموودەیــە و ئـەوەی کـە زانایـان دەفەرموون سوننەتە تەلقینی ئەو کەسە بکەیت لە گیانەڵادایە بـە بـێ ئـەوەی پێی بڵێی : (قل) بڵێ؟

وەڵام : ئەبوتالیب کەسێکی بێ باوەڕ بوو، ئەگەر پێی گوترا : بڵێ و ئەویش رازی نەبوو، ئەوا ئـەو لـە سـەر کوفرەکـەی خـۆی ماوەتـەوە، تەلقینەکە زەرەری پێـی نەگەیاند، بە جیاواز لە گـەڵ کەسـی موسـڵماندا ئـەو کارەکـەی ترسـناکە، چـونکە رەنگە تەلقینەکە زەرەری پێ بگەیەنێت .

- (حضَرَتْ) : واتە : نیشانەکانی مردنی لەسـەر دەرکـەوت، هێشـتا نەکـەوتبووە گیانەڵا، کەوابوو ئایە تەوبەکەی وەردەگیرێت؟

رای راســت و دروســت ئەوەیــە کــە وەرناگیرێـت : ١/ چـونکە ئایــەتی : ﴿ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ ﴾ بە تەواوی بە سەر فەرموودەکەدا جێبەجێ دەبێت .

٢/ چونکە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی : (أُحاجُ لكَ) وە دووپـاتی نـەکردەوە کەوا سوودی بۆی دەبێت .

ئـەم کـارە تایبەتــە بــە پێغەمبــەری خــوداوە(ﷺ) شـەفاعەت بـۆ مـامی دەکـات هەرچەندە بێباوەڕ بووە .

- (المسيَّب) و (عبدالله بن أبي أمية) موسڵمان بوون، بـە جیـاواز لـە گـەڵ (ئـەبو تاليب و ئەبو جەهل)دا .
- (هو على ملةِ) : راوییەکە وشـەکەی گۆڕیـوە، لـە جێگـای رانـاوی (أنـا – مـن) راناوی (هو – ئەو)ی دانا، ئەمەش بەڵگەی جێ بەجێکردنی تەوحیـدی تێدایـە لە لایەن ئەوانەی فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە .

## مەسەلەکان :

**یەکـــەم :** تەفســیری ئایــەتی : ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ٥٦ ﴾

**دووەم :** تەفســیری ئایــەتی : ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ ﴾ ( بۆیــە حەرامــە خــەم و پەژارە دەرخەیت بە هۆی مردنیانەوە و تەعزێباری کردنیان).

**سێیەم :** ئەویش مەسەلە گەورەکەیە، تەفســیری ئـەو فەرموودەیـە : (قل : لا اله الا الله) بە جیاواز لە گەڵ ئـەو کەسـەی بانگەشـەی زانسـت دەکـات ( بۆیـە رازی نـەبوو بیلێت) .

**چوارەم :** ئەبو جەهل و ئەوانەی لە گەڵیدا بوون مەبەستی پێغەمبەری خوایـان (ﷺ) دەزانی ئەگەر بە کەسێك بیگوتایە بلێ : (لا إله إلا الله)، جا خوای گەورە ئەو کەسـە لە هەموو خەیرێك دوور بکاتەوە کە ئەبو جـەهل لـەو شـارەزاتر بێـت لـە بنـەماکانی ئیسلام .

**پێنجەم :** هەوڵ و تێکۆشان و سووربوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئیسـلام بـوونی مامی: ١/ چونکە نزیکی ئەوە ٢/ لەبەر ئەو چاکەیەی هـەیبوو بـۆ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) و ئیسلام، جا ئەو بەم کـارەی سوپاسـکراوە، هەرچـەندە لەسـەر کوفرەکـەی تاوانبارە )

**شەشەم :** رەدد و وەڵامـی ئەوانـەی تێدایـە کـە دەڵـێن ئـەبو تالیـب موسـڵمان بـووە (ئەوان میللەتی کوفر بوون)

**حەوتەم :** پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای لێخۆشبوونی بـۆ کـرد کەچـی خـوای گـەورە لێی خۆش نەبوو، بەڵکو نەهی ئەو کارەی لێکرا (کارەکە بە دەستی خوایە) .

**هەشتەم :** زەرەری هاورێتی کردنی کەسی خراپ لە سەر مرۆڤ .

**نۆیـەم :** زەرەر و زیـانی بـە مـەزن راگـرتنی پێشـین و گـەورەکان (ئەگـەر لەسـەر ناحەقی و ناڕەوایی بوون) .

**دەیەم :** گومانی ئەوانەی لەسەر ناحەقین لەو کارەیاندا (بە مەزن راگرتنی باوو باپیران هەرچەندە لەسەر ناحەق بوون)، چونکە ئەوەتا ئەبو جەهل کردوویەتییە بەڵگە .

**یازدەیەم :** شاهید و بەڵگە ئەوەیە کەوا کارەکان بە پێی کۆتاییەکەیەتی، چونکە ئەگەر بیگوتایە ئەوا سوودی پێ دەگەیاند.

**دوازدەیەم :** جوان وردبەرەوە لە گەورەیی ئەم گومانە لە دڵی گومڕاکاندا، چونکە ئەوەتا لە چیرۆکەکەدا بە هیچ شتێکی تر قسەیان لە گەڵدا نەدەکرد تەنها بەوە نەبێت، هەرچەندە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووبارەی دەکردەوە و سوور بوو لەسەری، جا لەبەر مەزنی و روونی لایان تەنها باسی ئەوەیان دەکرد (ئەویش بە مەزن راگرتنی پێشین و گەورەکانە).

## تاقیکردنەوەی بەشی سێیەم ( ٤ بەشە )

**پرسیاری یەکەم :** ناونیشانی بەشەکانی ئەم بەشە و هۆی هێنانەوەی هەر بەشەی لە لایەن نوسەرەوە بنووسە :

| بەشەکە | ناونیشانەکەی | هۆی هێنانەوەی لە لایەن نوسەرەوە بۆ بەشەکە |
|---|---|---|
| یەکەم | .............................. | ................................... |
| دووەم | .............................. | ................................... |
| سێیەم | .............................. | ................................... |
| چوارەم | .............................. | ................................... |

**پرسیاری دووەم :** حوکمی ئەم کارانە روون بکەرەوە :

(١) دروست، (٢) دروست نییە، (٣) شیرکی گەورەیە، (٤) سوننەتە

| کردار | حوکمەکەی | کردار | حوکمەکەی |
|---|---|---|---|
| داواکردنی شەفاعەت لە مردووەکان | ......... | تەوەسولکردن بە خاتری پێغەمبەری خوا(ﷺ) | ......... |
| سەردانی نەخۆشێکی موشریك | ......... | تەلقین کردنی ئەو کەسەی لە گیانەڵادایە | ......... |
| لەعنەت کردن لە کەسی دیاریکراو | ......... | لەعنەت کردن لە بێباوەڕان بە شێوەیەکی گشتی | ......... |

**پرسیاری سێیەم :** نیشانەی (×) لە جێگای گونجاودا دابنێ یان بۆشاییەکان پڕ بکەرەوە:

١/ ناوەڕۆکی بەشی سێیەم لە بەشەکانی کتێبی تەوحید بریتییە لە :

تەفسیری تەوحید          پووچەڵبوونی پەرستنی جگە لە خوا

٢/ بەشی سێیەم چەند بەشی تێدایە ؟     ٥ بەش     ٤ بەش     ٦ بەش

٣/ ئەو پرسیارکردنەی لەو ئایەتەدا هاتووە : ﴿ أَيُشْرِكُونَ ﴾ بۆ ئینکاری و سەرزنشت کردنە :     **ڕاستە**     **هەڵەیە**

٤/ خوای گەورە بێدەسەڵاتی و بێتوانایی بتەکانی روونکردووەتەوە لە ئایەتی : ﴿ أَيُشْرِكُونَ ﴾ و ئەوانە بە کەڵکی پەرستن نایەن، لە : ٤ رووەوە ٣ رووەوە

٥/ ﴿ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ ﴾ ئەمە دوعای :

پەرستنە داواکردنە هەمووی دەگرێتەوە

٦/ رەحمەتی خوا لە هیچ کەسێك بە دوور نازانین ئەگەر هاتوو سەرپێچیکار بوو ئیللا پێشەوایانی کوفر نەبێت : **راستە هەڵەیە**

٧/ ئەو قسەیەی نوسەر کە دەڵێت : ئەوانەی دوعایان لێ دەکرێت بێباوەڕن، مەبەستی ئاگادارکردنەوەیە بە کوفری ئەوان . **راستە هەڵەیە**

٨/ ئەو قسەیەی نوسەر کە دەڵێت : (قنوتی گەورەی پێغەمبەران) مەبەستی :

دروستی قنوتە هیچ کەسێك لەم ئوممەتەدا وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵان نزیك نین لە خوداوە کەچی پەنا دەبەنە لای خوا .

٩/ چۆن دوعا لە بێباوەڕان دەکەین ؟ .....................................

١٠/ (فُزِّعَ) : ترسەکە لە سەر دڵیان روایەوە : لە ناکاودا بە بەردەوامی.

١١/ (کونهُ یکذبُ معها مائة کذبة) : وەکو : زیادەڕەوی دیاریکردن

١٢/ ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾ : هەرسێ مەرجەکەی شەفاعەتی لە خۆ گرتووە : **راستە هەڵەیە**

١٣/ هەر شەفاعەتێك شیرکی تێدا بێت ئەوا شەفاعەتی :

نەفیکراوە شیرکییە هەمووی

١٤/ مەبەست لە شەفاعەت ئەوە نییە کە یارمەتی خوا بدرێت لە شتێکدا شەفاعەتی تێدا کرابێت، چونکە ئەمە قەدەغەکراوە ( **راستە هەڵەیە** ) بەڵکو مەبەستی لێی

( رێزگرتن لە کەسی شەفاعەتکارە سوودێك بۆ شەفاعەت بۆکراو هەمووی)

١٥/ ئەو ئایەتە کامەیە دەربارەی وتراوە : دەماری داری شیرك لە دڵەکاندا دەبڕێت؟ .......................................

١٦ / هیدایەتی سەلمێنراو بریتییە لە : ............ وە نەفیکراو بریتییە لە..............

١٧/ ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴾ واتە : هیدایەتدانی

خۆشویستنی سروشتی پێش ئەوەی نەهی بکرێت لە بێباوەڕان هەمووی

١٨/ (حضرتْ أبا طالب الوفاةُ) واتە : .................. یان ...........................

١٩ / میللەتی (عبدالمطلب) بریتییە لە :

شیرك و بت پەرستی گاور (نەصرانیەت) ئاگرپەرست (مەجوسیەت)

٢٠/ (أُحاجُ) : واتە : باسی دەکەم وەکو حوججەیەك بۆ تۆ لای خوا

مشتومڕ لەبەر تۆ دەکەم لای خوا

٢١ / سوننەتە تەلقینی ئەو کەسە بکرێت لە گیانەڵادایە بە (لا اله الا الله) بەوەی پێی بڵێین : (بڵێ) بەڵگەش کرداری پێغەمبەری خوایە (ﷺ) لە گەڵ مامیدا ئەبو تالیب :

راستە هەڵەیە

وە چۆن کۆدەکەینەوە لە نێوان ئەو قسەیەی کە زانایان دەفەرموون : سوننەتە ئەو کەسەی لە گیانەڵادایە تەلقین بکرێت بە (لا إله إلا الله) بەڵام بە بێ ئەوەی پێی بگوترێت : (بڵێ )، لە گەڵ ئەو فەرموودەیەی دەفەرموێت : بڵێ : لا إله الا الله ؟

...........................................................................

٢٢/ بۆ راوی فەرموویەتی (هُوَ على مِلَّة) وە نەیفەرموو : (أنا)؟..........................

٢٣/ سووربوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئیسلام بوونی ئەبوتالیب مامی چونکە :

خزمی نزیکی بوو

لەبەر ئەو چاکەیەی بەرانبەر بە خۆی و ئیسلام کردبووی هەمووی

٢٤/ بە مەزن راگرتنی پێشین و گەورەکان نەویستراوە :

بە رەهایی ئەگەر هاتوو لەسەر ناحەقی بوون

**پرسیاری چوارەم :** بەشەکانی شەفاعەت تەواو بکە :

| ............، خوای گەورە بۆ خۆی سەلماندوویەتی، وە تەنها لەو داوا دەکرێت بە چەند مەرجێك : ١/................ ٢/................ ٣/................ | ...................، ئەوەیە کە قورئان نەفی کردووە، ئەویش ئەوەیە کە.......... وە حوکمەکەشی ئەوەیە کە ..... | ...................، ئەمەش دروستە بەم مەرجانە : ١/............................ ٢/............................ ٣/............................ ٤/ ............................ |
|---|---|---|

تایبەتە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لەوانە :

١/............................................................................

٢/............................................................................

٣/............................................................................

گشتییە ............................... دەگرێتەوە، لەوانە :

١/............................................................................

٢/............................................................................

٣/............................................................................

## چوارەم هۆکاری کوفری بەنی ئادەم ( ٤ بەشە )

نوسەر ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی هۆکارەکانی کوفر روون بکاتەوە تاوەکو لێی دوور بکەوینەوە، هەروەکو ئەوەی کەسێك پرسیاری کردبێت لە نوسەر و پێی گوتووە : بۆ لە هەندێکی ئەم ئوممەتەدا کوفر روو دەدات ؟ ئەویش بە سێ بەشە یەکەمەکە وەڵامی داوەتەوە، وە لە بەشی چوارەمدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو رێگاکانی داخستووە کە خاوەنەکەی دەگەیەنێتە شیرك .

## ١٩/ بەشی : ئەو بەڵگانەی هاتوون کەوا هۆکاری کوفری بەنی ئادەم و وازهێنان لە دینەکەیان بریتی بووە لە زیادەڕەوی لە پیاوچاکاندا .

- ئەمە لە گەورەترین هۆکارەکانە و ترسناکترینیانە، وە یەکەم شیرك روویدا هۆکارەکەی گومانی زیادەرەوی لە پیاوچاکاندا بوو.

### بەڵگەی یەکەم و دووەم :

١/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ ﴾

٢/ ئیمامی بوخاری لە (صحیح)ەکەیدا لە ئیبن عەبباسەوە ریوایەتی کردووە دەربارەی ئەو ئایەتە ﴿ وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمۡ وَلَا تَذَرُنَّ وَدّٗا وَلَا سُوَاعٗا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسۡرٗا ﴿٢٣﴾ ﴾ دەفەرموێت : (هذه أَسْمَاءُ رِجَالٍ صَالِحِينَ مِنْ قَوْمِ نُوحٍ فَلَمَّا هَلَكُوا أَوْحَى الشَّيْطَانُ إِلَى قَوْمِهِمْ، أَنْ انْصِبُوا إِلَى مَجَالِسِهِمْ الَّتِي كَانُوا يَجْلِسُونَ فيها أَنْصَابًا، وَسَمُّوهَا بِأَسْمَائِهِمْ، فَفَعَلُوا، ولَمْ تُعْبَدْ، حَتَّى إِذَا هَلَكَ أُولَئِكَ ونسي الْعِلْمُ عُبِدَتْ) واتە: ئەمە ناوی پیاوچاکانە لە قەومەکەی (نوح)، جا کاتێ کۆچی دواییان کرد شەیتان خستیە دڵ قەومەکەیانەوە : لە ناو مەجلیسەکانیاندا –کە تیایدا دادەنیشتن– پەیکەرێك (بتێك) دابمەزرێنن و دروستی بکەن و بە ناوی خۆیانەوە ناوی بنەن،

ئەوانیش کردیان، جا هێشتا نەیاندەپەرست تاوەکو ئەوان بە هەلاکەتدا چوون و زانست و زانیاری لە بیر کرا ئەمجار ئەوانە پەرستران).

پێشەوا ابن القیم –رەحمەتی خوای لێ بێت – دەفەرموێت : لە یەکێك زیاتر لە سەلەف فەرموویانە : کاتێ ئەوان مردن، لە سەر قەبری ئەوان دەمانەوە و رادەوەستان، ئەمجار پەیکەریان لە سەر وێنەی ئەوان دروست کرد، ئەمجار ماوەیەکی زۆر بە سەریاندا تێپەڕی و ئەوانیان پەرست) .

**(يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ) :** ئەوانیش جولەکەن کە تەوراتیان هەیە و گاورەکانن کە ئینجیلیان هەیە.

**(لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ) :** واتە : سنوورەکە مەبەزێنن بە پیاهەڵدان یان لەکەدارکردن، جا گاورەکان زیادەڕەوییان کرد لە عیسادا بە پیاهەڵدان تاکو گەیشتە ئەوەی وتیان : کوڕی خوایە، وە سێیەمی سێ خواکەیە، وە جولەکە زیادەڕەوییان تێدا کرد بە لەکەدارکردنی .

(هَلَكُوا) : واتە : مردن .

**(أَوْحَى الشَّيْطَانُ) :** شەیتان وەسوەسەی بۆ کردن .

**(أَنْ انْصِبُوا) :** هەرشتێك دابنرێت و نەصب بکرێت لە دار و بەرد، ئەویش ئەوە بوو، شەیتان بەوانی گوت : تاوەکو ئەوان ببینن چست وچالاك بن لە پەرستنەکەتاندا، بەڵام جیاواز لە گەڵ رێبازی شەرعدا، جا نییەت تەنها بەس نییە، وە دەبێ کرداریشی لە گەڵدا بێت و لە گەڵ شەرعدا کۆك بێت، جا نییەتەکە تەواوە بەڵام کارەکە هەڵەیە .

(حَتَّى إِذَا هَلَكَ أُولَئِكَ) : ئەوانەی ئەو بتانەیان دانا و ئەو پەیکەرانەیان داتاشی .

ئەوانەی پێش نووح بوون سێ شتیان کردووە :

(صوَّروا) : وێنەی پەیکەرەکانیان کێشا، ئەمەش بەڵگەی ترسناکی وێنەکێشان و پەیکەری تێدایە .

(عكفوا) : لە سەر گۆڕەكانیان دەمانەوە .

(طال عليهم الأمد) : وە سەردەمی پێغەمبەرایەتی دوور كەوتەوە، وە زانست و زانیاری بزر بوو، ئەو كات شیركی گەورە روویدا، ئەوانیش ئەوەیان پەرست جگە لە خوا، وە ئەصڵ و بنەماش وایە كە زانست و كردار پێكەوە بن تاوەكو كاری وەكو ئەمە روو نەدات.

**خراپەكانی زیادەڕەوەی :**

دانانی ئەو كەسەی زیادەرەوییەكەی تێدا دەكات لە سەرووی پێگە وجێگەی خۆی ئەگەر پیاهەڵنان بێت، وە لە خوارەوەی پێگەو جێگەی خۆیەتی ئەگەر لەكەداركردن بێت.

سەردەكێشێ بەرەو پەرستنی ئەو كەسەی زیادەڕەوییەكەی تێدا دەكرێت .

دەبێتە رێگرێك لە پێش بە مەزن دانانی خوای گەورە، چونكە نەفسی مرۆڤ یان سەرقاڵە بە ناحەقی و باتڵەوە وە یان بە حەقەوە .

ئەو كەسەی زیادەڕەوی تێدا دەكرێت، ئەگەر خۆی ئامادە بێت ئەوا لە خۆی دەردەچێت، ئەمەش خراپەیەكە كەوا ئەو كەسەی زیادەڕەوییەكەی تێدا دەكرێت خراپ بێت ئەگەر هاتوو پیاهەڵنان بێت، وە دەبێتە هۆی دوژمنایەتی و بەلا ئەگەر هاتوو لەكەدار كردن بێت.

**بەشەكانی خەڵكی لە پیاوچاكاندا :**

**بەشێكیان زیادەڕەوی دەكات لە پیاهەڵنانا :** وەكو گاورەكان لە گەڵ عیسادا .

**بەشێكیان زیادەڕەوی دەكات لە لەكەداركردندا :** وەكو جولەكە لە گەڵ عیسادا.

**بەشێكیان ناوەند بوون :** نە زیادەڕەوی دەكەن و نە كورتڕەوی، ئەوانیش ئەهلی سوننەن.

## بەڵگەی سێیەم تا پێنجەم :

٣/ لە عومەرە ڕیوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لاَ تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ، إنما أنا عبد،فقُولُوا : عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ) (بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە) واتە : خەڵکینە! لەبارەی منەوە زێدەڕۆیی مەکەن، وەکو گاورەکان دەربارەی عیسا هەڵەڕۆییان کردو ئەوەندەیان پیا هەڵدا، کردیانە کوڕی خوا! بەڕاستیی من تەنها بەندەیەکم، ئێوەش لە بارەی منەوە هەر ئەوەندە بڵێن کە: من تەنها بەندەو ڕەوانەکراوی خوام .

٤/ لە (ابن عباس)ەوە ڕیوایەت کراوەو فەرموویەتی : پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی : (إياكم و الغلو، فإنما أهلك من كان قبلكم الغلو) واتە: وریای زیادەڕەوی بن، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە زیادەڕەوی بە هەلاکەتدا بردنی).

٥/ لە (ابن مسعود)ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( هلك المتنطعون) قالها ثلاثا ) (موسلیم ڕیوایەتی کردووە) واتە : (زیادەرەوەکان بە هەلاکەتدا چوون ) سێ جار دووبارەی کردەوە .

- (لاَ تُطْرُونِي) : (الإطراء) بریتییە لە : زیادەڕەوی کردن لە پیاهەڵناندا، وەکو زیادەڕەوی گاورەکان و ئەوانەی جگە لەوان.
- (عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ) : ئەو دوو سیفەتە بەرزترین و ڕاسترین سیفەتە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ).
- (الغلو) : بریتیە لە سنور بەزاندن لە ستایش کردن و پەرستن و کارکردندا .
- زیادەرەوی لە چیدا بە هەلاکەتدا بردنی ؟ بە هەلاکەتدا بردنی لە :١/لە دیندا ٢/ لە جەستەدا .
- زیادەڕەوی چەندین بەشی هەیە : زیادەڕەوی لە بیروباوەڕ و پەرستن و مامەڵە و نەریتدا، وە دینەکەی خوای گەورە نێوەندە لە نێوان زیادەڕەو و کورتڕەودا .

- **(المتنطعون) :** (المتنطـع) بریتییـه لـه : کەسـی زیـادەڕەو و تونـدڕەو (کـه زۆر دەچێتە ناو قوڵی مەسەلەکانەوە) لە قسە و کـرداردا، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر سەرسام بوون بە خۆی، وە ئەم (التنطع)ـە لە دیندا هەروەکو زیادەڕەوییە، وە هۆکارێکە لە هۆکارەکانی لەناوچوون .

**مەسەلەکان :**

**یەکەم :** هەرکەسێ لەم بەشە و دوو بەشەکەی پاش ئەمـە تێگەیشـت، نـامۆ بـوونی ئیسلامی بۆ روون دەبێتەوە، وە لە توانا و دەسەڵاتی و خوا و ئەم دیـو و ئـەودیوی دڵەکان شتی سەیر دەبینێ .

**دووەم :** زانینی ئەوەی یەکەم شیرك لەسەر رووی زەویـدا روویـدا بـە هـۆی گومـان و شوبهەی پیاوچاکانەوە بوو .

**سێیەم :** زانینی یەکەم شتێك دینی خوای پێ گۆڕدرا (ئەویش شـیرکە)، وە هۆکـاری ئەوە چی بوو ؟ (زیادەڕەوی لە پیاوچـاکاندا) لـە گـەڵ زانـینی ئـەوەی کـەوا خـوای گەورە خۆی ئەوانی رەوانە کردووە (بە نیسبەت پێغەمبەرانەوە).

**چـــوارەم :** قـــایلبوون بـــە بیدعـــە، هەرچـــەندە شـــەریعەتەکان و فـــیترەت رەددی دەکەنەوە .

**پێنجەم :** هۆکاری هەموو ئەوانە، تێکەڵ کردنی حەقە لە گەڵ ناحەقی و باتڵدا، جا سەرەتا خۆشویستنی پیاوچاکانە، ئەمجار ئەنجامدانی شتێك لە لایەن هەندێ کەسی خاوەن زانست و زانیاری کە مەبەستیان لێـی خـەیر بـوو، جا ئەوانـەی دوای ئـەوان هاتن وایان زانی مەبەستیان شتێکی ترە (بۆیە هەرکەسێ بیەوێ دینەکەی بە بیدعە بە هێز بکات ئەوا زیانی لە قازانجی زۆرترە).

**شەشـــەم :** تەفسـیری ئـەو ئایەتـەی لـە سـورەتی (نـووح)دا هـاتووە ( وە بەڵگـەی ئەوەشی تێدایە کەوا ئەوان ئامۆژگاری یەکتر دەکەن بە ناحەقی و باتڵ) .

**حەوتەم :** سروشتی بەنی ئادەم وایە کەوا حەق کەم دەکات لە دڵیدا و باتڵ و ناحەقی زیاد دەکات ( ئیللا کەسێك نەبێت خوای گەورە خۆی منەتی بە سەریدا رژاندبێت) .

**هەشتەم :** بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە لە سەلەفەوە هاتووە : کەوا بیدعە هۆکاری کوفرە (وە هیچ رێگرێك نییە ئەگەر هۆکارەکان چەند دانەیەك بن ) .

**نۆیەم :** شەیتان ئەوە باش دەزانێ کەوا بیدعە خاوەنەکەی بەرەو کوێ دەبات، هەرچەندە خاوەنەکەی مەبەستی باش بێت .

**دەیەم :** زانینی ئەو بنەما گشتییە، ئەویش نەهی کردنە لە زیادەڕەوی و زانینی ئەوەی سەری بۆ دەکێشێ .

**یازدەیەم :** زەرەری مانەوە (العکوف) لە سەر گۆڕ بە مەبەستی کاری چاکە (دەیانگەیەنێتە پەرستنیان) .

**دوازدەیەم :** زانینی هۆکاری نەهی کردن لە پەیکەرەکان و حیکمەت لە نەهێشتن و لادانی (لەبەر سد الذرائع).

**سیازدەیەم :** مەزنی باسی ئەم چیرۆکە و زۆری پێویستی پێی، هەرچەندە خەڵکی لێی بێ ئاگایە .

**چواردەیەم :** ئەویش سەیرترین شتە سەیرەکانە، ئەوان ئەوە دەخوێننەوە لە کتێبەکانی تەفسیر و فەرموودەدا و مانای قسەکە دەزانن، وە خوای گەورە بەربەستێکی داناوە لە نێوان ئەوان و دڵیاندا تاوەکو باوەڕیان وابوو کەوا ئەوەی قەومی نووح کردیان باشترین پەرستنەکانە، وە باوەڕیان وابوو ئەوەی خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) نەهییان لێ کردووە هەر ئەوە کوفرە و خوێن وماڵی خاوەنەکەی حەڵاڵ دەکات .

**پازدەیەم :** روونکردنەوەی ئەوەی کەوا ئەوان هیچ شتێکیان نەویست تەنها شەفاعەت نەبێت ( لە گەڵ ئەوەشدا کەوتنە نێو شیرکەوە) .

**شازدەیەم :** گومانیان وابوو کەوا ئەو زانایانە ئەو وێنانەیان کێشاوە مەبەستیان ئەوە بووە ( کەوا شەفاعەتیان بۆ بکات، ئەمەشە گومانێکی خراپە ) .

**حەڤدەیەم :** روونکردنەوەی فەرموودەی : (لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم) صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت، بە راستی بەوپەڕی روونکردنەوە روونی کردووە (جا نەهی کرد لە زیادەڕەوی لە پیاهەڵناندا و زیادەڕەوی کردن تێیدا، لە کاتێکدا هەندێ لەم ئوممەتە تێی کەوتون، بەڵکو توندتر) .

**هەژدەیەم :** ئامۆژگاری کردووین بە لە ناوچوونی (المتنطعين) (بۆ ئەوەی لێیان وریا بین و ئاگاداریان بین) .

**نۆزدەیەم :** روونکردنەوەی ئەوەی کەوا نەپەرستران تاوەکو زانست و زانیاری نەما و لە بیر کرا، ئەمەش روونکردنەوەی زانینی قەدری بوونی زانستە و زەرەر و زیانی نەمانی زانستە .

**بیستەم :** هۆکاری لە ناوچوونی زانست مردنی زانایانە (ئەمەش لە گەورەترین هۆکارەکانە، هەروەها بێ ئاگایی و پشت کردنە لێی، وە سەرقاڵ بوونە بە کاروباری دونیاوە، و گوێ نەدانە پێی ).

**٢٠/ بەشی : ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی توندی نواندن بەرانبەر ئەو کەسانەی خوای گەورە دەپەرستن لای گۆڕی پیاوچاکێکدا، ئەی چۆنە ئەگەر گۆڕەکەی بپەرستن ؟**

نوسەر ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی نامۆبوونی دین و وازهێنانی خەڵکی لە تەوحیدت بۆ روون بکاتەوە، وە ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی نەهیکردن لەپەرستنی خوای گەورە لای گۆڕی پیاوچاکاندا تاوەکو نەبێتە وەسیلەیەك بۆ شیرك .

**بەڵگەی یەکەم :**

في الصحيح عَنْ عَائِشَةَ –ﷺ– قَالَ : أن أم سلمة ذكرت لرسول الله (ﷺ)كَنِيسَةً رَأَتْهَا بِأَرْضِ الْحَبَشَةِ، وما فيها من الصور، فقال : أُولَئِكَ إِذَا مَاتَ فِيهِمْ الرَّجُلُ الصَّالِحُ أو العبد الصالح بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِداً، و صَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ أُولَئِكَ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللهِ )). فهولاء جمعوا بين الفتنتين : فتنة القبور وفتنة التماثيل .

واتە : لە کتێبی (الصحيح)دا هاتووە لە دایکمان عائیشەوە –ڕەزای خوای لێبێ– دەڵێ: أم سلمە باسی کەنیسەیەکی کرد بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لە حەبەشە بینی بووی، باسی ئەو وێنانەیان کرد کە تیایدا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (( ئا ئەوانە کاتێك پیاو چاکێك – یان بەندەیەکی چاك – تیایاندا بمردایە لەسەر گۆڕەکەی مزگەوتێکیان دروست دەکرد، پاشان ئەو وێنانەیان تیادا دەکێشا، ئا ئەوانە خراپترین دروستکراوەکانن لەلای خودا )) . جا ئەوانە دوو فیتنەیان لە خۆدا کۆکردووە : فیتنەی گۆڕەکان و فیتنەی پەیکەرەکان .

- **(فهولاء جمعوا بين الفتنتين) :** ئەمە قسەی (ابن تيمية) یە – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – وە ئەو کارەی ناوناوە بە فیتنە، چونکە هۆکارە بۆ دوورخستنەوەی خەڵکی لە دینی خوا.
- ئەصڵ و بنەما ئەوەیە کە گۆڕەکان لە دەرەوەی بیناکاندا بن تاوەکو نەبنە هۆکارێك بۆ شیرك .
- فیتنەی گۆڕەکان توندترە لە پەیکەرەکان، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك :
  - گۆڕەکان لە هەموو شوێنێکدا هەن بە جیاواز لە گەڵ پەیکەرەکان .
  - لای گۆڕەکاندا چەند کارێك ڕوو دەدەن کە لە جێگای تردا ڕوونادەن، وەکو : ترس .

## بەڵگەی دووەم :

(ولهما عنها، قَالَتْ : (لما نُزِلَ بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) طفق خميصة له على وجهه، فإذا اغتمَّ بها كشفها، فقال – وهو كذلك- : (( لَعَنَةُ اللهِ على الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى، اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ )) يُحَذِّر ما صنعوا، وَلَوْلا ذَلِكَ لأُبرِزَ قَبْرُهُ، غَيْرَ أَنَّهُ خُشِيَ أَنْ يُتَّخَذَ مَسْجِداً " أخرجاه.

واته : له هەردوو کتێبی (صحيح) دا هاتووه له دایکمان عائیشەوه (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ :((کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەرە مەرگدا بوو پارچەیەکی بەسەر دەموچاویدا دابوو، ئەگەر بێزاری بکردایه ئەوا لای دەدا و فەرمووی – لە کاتێکدا ئەو بەو حاڵەوە بوو- : لەعنەتی خودا لە گاوڕ و جولەکەکان، چونکه گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردە مزگەوت )) عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ : خەڵکی ئاگادار دەکردەوە لەوەی ئەوان کردیان، ئەگەر لەترسی ئەوە نەبوایە ئێستا گۆڕەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بەرز دەکرایەوە، بۆیە ترسی ئەوەی هەبوو گۆڕەکەی بکرێتە مزگەوت) (بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووه).

## بەڵگەی سێیەم :

وه له موسلیمدا هاتووه لە (جندب بن عبدالله)وە دەفەرموێت : گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) له پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات به پێنج رۆژ دەیفەرموو : (( إني أبرأ الى الله أن يكون لي منكم خليل، فإن الله قد اتخذني خليلا كما اتخذ ابراهيم خليلا، ولو كنت متخذاً من أمتي خليلا، لأتخذت أبا بكر خليلا، ألا وإن من كان قبلكم كانوا يتخذون قبور أنبيائهم مساجد، ألا فلا تتخذوا القبور مساجد، فإني أنهاكم عن ذلك) .

واته: من خۆم بەری دەکەم لای خوای گەورە ئەگەر یەکێکتان بە خەلیلی خۆم بزانم، خوای گەورە منی بە خەلیلی خۆی داناوە هەروەکو چۆن ئیبراهیمی بە خەلیلی خۆی داناوە، وە ئەگەر لە ئوممەتەکەمدا کەسێکم بە خەلیلی خۆم بزانیبایە ئەوا ئەبو بەکرم بە خەلیلی خۆم دادەنا، ئەوانەی پێش ئێوە لەسەر گۆڕی

پێغەمبەرانی خۆیان مزگەوتیان دروست دەکرد، بۆیە ئێوە گۆڕەکان مەکەنە مزگەوت، من نەهیتان لێ دەکەم ئەو کارە بکەن)) .

جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کۆتایی تەمەنیدا نەهی لێکرد، –وە لە پێشدا – لەعنەتی کردبوو لەو کەسەی ئەنجامی بدات، وە نوێژکردن لای گۆڕەکان بەشێکن لەوە، هەرچەندە مزگەوتی لا دروست نەکرابێت، ئەویش مانای ئەو قسەیە کە دەفەرموێت : ((خَشِيَ أن يُتخذ مسجداً)) واتە : لەوە ترسا بکرێتە مزگەوت)) جا هاوەڵان لە دەوری قەبرەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مزگەوتیان درەست نەکرد .

وە هەر شوێنێك خەڵکی بۆی بچن بە مەبەستی نوێژ کردن ئەوە مزگەوتە، بەڵکو هەر جێگایەك نوێژی تێدا بکرێت پێی دەڵێن : مزگەوت، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (جُعِلَتْ لِيَ الأرضُ مسجداً وطهوراً) واتە : هەموو زەویم بۆ کراوەتە جێ نوێژگە (مزگەوت) و پاکی )) .

(لما نُزِلَ بِرَسُولِ اللهِ(ﷺ)) : فریشتەی مردن بۆ ئەوەی گیانی پیرۆزی بکێشێ .

(خميصة) : پۆشاك و یان جلوبەرگێکە خەت و نیشانەی پێوەیە .

(لعنة الله) : واتە : دەرکردن و دوورخستنەوەی، ئەمەش هەواڵە لە خواوە، وە رەنگە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای لێیان کردبێت .

(اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ) : یان بە سوجدە بردن لەسەری وە یان بنیاتنانی مزگەوت لەسەری .

(لأُبرزَ قبرُهُ) : واتە : دەردەکەوت و لە ماڵەکەی دەردەکرا بۆ نمونە لە قەبرستانی (بەقیع) دەنێژرا.

بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ناو ژوورەکەدا نێژرا و هیچ کەسێك ژوورەکە نابینێ، چ جا گڵی سەر قەبرەکەی ؟

لەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێت : (ما قبض نبي إلا دُفن حيث يُقبض) واتە : هیچ پێغەمبەرێك گیانی نەکێشراوە ئیللا لەو جێگایەدا دەنێژرێت کە گیانی تێدا کێشراوە).

**(خَشِيَ) :** پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوە ترسا گۆڕەکەی بکرێتە (وثن)ێك .

**(خُشِيَ) :** هاوەڵان لەوە ترسان گۆڕەکەی بکرێتە بتێك (وثن)ێك، لە بەر سووربوونیان بۆ جێ بە جێکردنی تەوحید .

چۆن وەڵامی ئەو کەسانە دەدەینەوە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن گۆڕەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ناو مزگەوتدایە ؟

**أ/ وەڵامێکی گشتی :** ئەمە یەکێکە لە (متشابه)ـکان، ئەوەی واجیب و پێویستە (محكم)ـەکانی قورئان و فەرموودە وەرگرین، وە تۆیش یەکێکی لەوانەی شوێنی (متشابه)ـکان دەکەون و واز لە (محكم)ـەکان دەهێنن، بۆیە هەرگیز گوێت لێ ناگرین .

**ب / وەڵامێك بە وردی :**

١. مزگەوتەکە لەسەر گۆڕەکە بنیات نەنراوە، بەڵکو مزگەوتەکە لە ژیانی خۆیدا دروست کراوە .

٢. پێغەمبەری خوا (ﷺ)لە ناو مزگەوتەکەدا نەنێژرا، بەڵکو لە ماڵەکەی خۆیدا نێژرا، ئەو کاتەش لە دەرەوەی مزگەوتەکە بوو.

٣. کاتێ ژوورەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خرایە ناو مزگەوتەکەوە بە کۆدەنگی هاوەڵان نەبوو، بەڵکو لە پاش ئەوەی زۆربەی هاوەڵان کۆچی دواییان کردبوو، وە هەندێ لەوانەی مابوونەوە ناکۆك بوون، هەروەکو چۆن (سعيد بن المسيب) ناکۆك بوون .

٤. گۆڕەکە لە ناو مزگەوتەکەدا نییە، بەڵکو لە ژوورێکی سەربەخۆدایە، وە مزگەوتەکەی لەسەر بنیات نەنراوە، بەڵکو گۆڕەکە بە سێ دیوار پارێزراوە، وە دیوارەکە کراوەتە سووچێکی لارەوە لە رووی قیبلەوە بۆ ئەوەی کەسی نوێژ خوێن رووی لێ نەکات .

٥. مزگەوتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تایبەتمەندی خۆی هەیە، لە نوێژکردن تیایدا و خۆ بەستن و خۆ ئامادکردن بە مەبەستی سەردانی کردنی و جگە لەوانەش .

**ئاگادارییەك :** (الخُلَّة) گەورەترین و بەرزترین جۆری خۆشەویستییە، وە خوای گەورە بۆ هیچ کەسێکی نەسەلماندووە ئەوەی بزانین تەنها بۆ دوو کەس نەبێت لە دروستکراوەکانی ئەوانیش (ئیبراهیم و محمد)ن (ﷺ)، وە بەم پێیە ئەو نەفامییە گەورەت بۆ دەردەکەوێت کاتێ خەڵکی عەوام دەڵێن : ئیبراهیم (خليل الله)یە و محمد (ﷺ) (حبيب الله)یە، ئەمەش کەمکردنەوەی حەقی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، چونکە پایەی محمدیان (ﷺ) لە خوارەوەی پلەی ئیبراهیم داناوە، وە جیاوازییان نەکردووە لە نێوان ئەو و خەڵکی تردا، چونکە خەڵکی تریش هەن (حبيب الله)ن، ئەوەتا خوای گەورە بۆ نمونە چاکەکارانی خۆش دەوێت، جا هەرکەسێ وەصفی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکات بەوەی (حبيب الله)یە ئەوا هەڵەی کردووە .

**بەڵگەی چوارەم :**

ئیمامی ئەحمەد بە سەنەدێکی (جید) لە (ئیبن مەسعود)ەوە ریوایەتی کردووە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەوا فەرموویەتی : (إنَّ مِن شِرار الناس مَنْ تدركهُمُ الساعة وهم أحياء، والذين يتخذون القبور مساجدَ) واتە : لە خراپترین خەڵکی ئەوانەن کە قیامەت هەڵدەستێ و هێشتا ئەوان زیندوون، و ئەوانەی لەسەر گۆڕەکان مزگەوت دروست دەکەن ) (رواه أبو حاتم في صحيحه).

- (شِرار الناس) : بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەوا خەڵکی لە خراپەدا جیاوازن، هەندێکیان لە هەندێکی تر خراپترن.

**پوختەی بەشەکە :**

پێویستە لە شیرك و وەسیلەکانی دوور بکەوینەوە، وە توند بین بەرانبەر بەو کەسانەی کە خوای گەورە دەپەرستن لای گۆڕی پیاوچاکێکدا، وە نوێژو جگە لە نوێژ دەگرێتەوە، جا هەر کەسێ باوەڕی وابێت کەوا صەدەقە کردن لای ئەم گۆڕە چاکترە لە جێگایەکی تر، ئەوا وەکو ئەو کەسەیە کردوویەتییە مزگەوت .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی کردووە لەوەی کەسێك مزگەوتێك دروست دەکات لای گۆڕی پیاوچاکێکدا بۆ ئەوەی خوای گەورەی تێدا بپەرستێت، هەرچەندە نیەتی کەسی بکەر راست و دروست بێت (ئەم کارە پێویستی بە نیەت نییە، چونکە پەیوەستە بە کارەکەوە و هەروەها چونکە لەیەکچوونی موشریکەکانی تێدایە ) .

**دووەم :** نەهیکردن لە پەیکەر و توندی نواندن بەرانبەر بەو کارە (بە تایبەتی ئەگەر هاتوو وێنەکە لە نەریتدا بە مەزن رادەگیرا، وەکو وێنەی سەرکردەکان و باوك، یان لە شەرعدا وەکو وێنەی ئەولیا و پیاوچاکان ) .

**سێیەم :** عیبرەت لە زیادەڕەوی کردن لە پێغەمبەری خوادا (ﷺ)، ئەوەتا لە سەرەتادا ئەوەی بۆ روون کردنەوە، ئەمجار پێش مردنی بە پێنج رۆژ ئەوەی فەرموو کە فەرمووی، لەسەرە مەرگیشدا تەنها بەوەی پێشوو وازی نەهێنا.

**چوارەم :** نەهی کردووە لەوەی لەسەر گۆڕەکەی بکرێت تەنانەت پێش ئەوەی گۆڕەکەی بوونی هەبێت .

**پێنجەم :** ئەوە لە سوننەتی جولەکە و گاورەکانە بەرانبەر بە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان .

**شەشەم :** پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعنەتی کردووە لەوان بەهۆی ئەو کارەوە .

**حەوتەم :** مەبەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگادار کردنەوەی ئێمەیە بەرانبەر بە گۆڕەکەی .

**هەشتەم :** هۆکار و عیللەتەکە بەرزنەکردنەوەی گۆڕەکەی ( لە ترسی پەرستنی، وە هەموو پێغەمبەرێك لەوێدا دەنێژرێت کە گیانی کێشراوە) .

**نۆیەم :** مانای بە مزگەوت کردنی (دروست کردنی بینایە لەسەری و بکرێتە جێی نوێژ کردن) .

**دەیەم :** ئەو کەسانەی دەیکەنە مزگەوت و ئەوانەی قیامەتیان بەسەردا هەڵدەستێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە یەکەوە گرێی داون و باسی کردوون، جا باسی ئەو هۆکارەی کردووە بەرەو شیرك دەبیات پێش رووداني و باسی کۆتاییەکەشی کردووە.

**یازدەیەم :** باسکردنی ئەو بابەتە لە وتارەکەیدا لە پێش وەفات کردنی بە پێنج رۆژ وەلامی دوو کۆمەڵی تێدایە کە خراپترین گرووی بیدعەکارانن، بەڵکو هەندێ لە زانایان لە حەفتا و دوو کۆمەڵەکەش دەری کردوون، ئەوانیش گرووی (الرافضة و الجهمية) ن، وە بە هۆی (الرافضة) وەوە شیرك و پەرستنی گۆڕەکان روویدا، جا ئەوان یەکەم تاقم و گرووپ بوون لەسەر گۆڕەکان مزگەوتیان بنیات نا .

**دوازدەیەم :** ئەوەی تووشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات لە کاتی توندی گیان کێشاندا .

**سیازدەیەم :** ئەو رێزەی لێی گێراوە و بووەتە خەلیلی خوای گەورە .

**چواردەیەم :** باسکردنی ئەوەی کەوا (خەلیل) لە خۆشەویستی بەرزترە .

**پازدەیەم :** باسکردنی ئەوەی کەوا (أبو بكر الصديق) باشترینی هاوەڵانە (باشترینە لە ئیمان و کردەوەی چاکدا، لە سەرووی ئەوەوە باشترینە بە رەچەڵەك و نەسەب، هەر بۆیە ئەبو بەکر پێش عەلی کەوتووە) .

**شازدەیەم :** ئاماژەیەکە بۆ خیلافەتی ئەبو بەکر .

## ٢١/ بەشی : ئەو بەڵگانەی هاتوون کەوا زیادەڕەوی لە گۆڕی پیاوچاکاندا دەیانکاتە بت و لە جگە لە خوا دەپەرسترێن .

- ئەمە هۆکاری سێیەمە بۆ روودانی شیرك، جا ئەو کەسانەی زیادەڕەوی دەکەن کارەکە بەرەو ئەوە دەیانبات گۆڕەکان یان خاوەنەکانیان بپەرستن، وە زیادەڕەوی بریتییە لە سنوور بەزاندن لە پیاهەڵنانیدا یان لە لەکەدارکردندا .
- بەشەکانی خەڵکی بەرانبەر بە گۆڕەکان دوو لا و ناوەندێکن : بەشێکیان زیادەڕەویان کرد لە پەرستن و دروستکردنی قوببە لە سەری، وە بەشێکیان کەمتەرخەمیان کردووە لەوەی پێویستە لە رێزگرتن لێیان بەوەی لەسەری دادەنیشن و گۆڕەکە هەڵدەدەنەوە، وە حەقیش ناوەندە بەوەی حورمەتی بگیردرێت و زیادەڕەوی نەکرێت تا کار بگاتە ئەوەی بپەرسترێت .

## بەڵگەی یەکەم تا چوارەم:

١. ئیمامی مالیك لە (موطأ)دا ڕیوایەتی کردووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (اللهم لا تجعل قبري وثنا يُعبد اشتد غضب الله على قوم اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد) واتە : ئەی خودایە قەبرەکەم مەکەرە بتێك و بپەرسترێت، خوای گەورە زیاتر پەستو تووڕە بوو لە کۆمەڵێك قەبری پێغەمبەرەکانیان کردە مزگەوت).

٢. (ابن جرير) بە سەنەدێك ڕیوایەتی کردووە لە(سفيان)ەوە لە(منصور)ەوە لە(مجاهد)ەوە : ﴿ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلۡعُزَّىٰ ١٩ ﴾ فەرمووی: کابرا ئاردەوای بۆ دەکردن و مرد، ئەوانیش لەسەر گۆڕەکەی مانەوەو بەجێیان نەدەهێشتن).

٣. هەروەها (أبو الجوزاء) فەرموویەتی لە (ابن عباس)ەوە : (كان يَلِتُ لهم السويق للحاج) واتە: ئاردەوای بۆ حاجییەکان دەکرد).

٤. وە لە (ابن عباس)ەوە ڕیوایەت کراوە کەوا فەرموویەتی : (لعن رسولُ الله (ﷺ) زائرات القبور والمتخذين عليها المساجد والسرج) واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعنەتی کردووە لەو ئافرەتانەی سەردانی گۆڕستان دەکەن و ئەوانەی دەیکەنە مزگەوت و چرا و ڕوناکی لەسەر هەڵدەکەن (رواه أهل السنن).

**(اشتد غضب الله) :** صیفەتێکی حەقیقییە و بۆ خوای گەورە سەلمێنراوەو سابت بووە، وەکو تووڕە بوونی دروستکراوەکان نییە .

**(اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد) :** یان بەوەی سوجدە دەبەن لەسەری، وە یان مزگەوتی لە سەر دروست دەکەن .

ئایە وەڵامی دوعاکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) درایەوە بەوەی گۆڕەکەی نەکرێتە بتێك و بپەرسترێت، یان حیکمەتی خوای گەورە جگە لەوەی ویستووە ؟

(ابن القیم) –ڕەحمەتی خوای لێ بێت– فەرموویەتی : خوای گەورە وەڵامی دوعاکەی دایەوە، هەرگیز نەبووە کەوا گۆڕەکەی وەکو بتێك بپەرسترێت، بەڵکو بە سێ دیوار پارێزراوە :

فأجابَ ربُّ العالمين دعاءَهُ **** وأحاطهُ بثلاثةِ الجدرانِ

ڕاستە هەندێ کەس هەن زیادەڕەوی تێدا دەکەن، بەڵام نەگەیشتووەتە ئەوەی گۆڕەکەی بکەنە بتێك .

**(أَفَرَءَيْتُمُ) :** نیسبەتی ئەم بتانە لە چاو ئەو ئایەتە گەورانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شەوی میعراجدا بینی چەندە ؟

**(السويق) :** جۆیە دەیکوڵێنن، ئەمجار دەیهاڕن پاشان لە گەڵ خورمادا تێکەڵ دەکرێت و پێشکەشی حاجیانی دەکەن .

**(السُرُج) :** کۆی وشەی (سراج)ـە، واتە : چرا، بە شەو و ڕۆژ چرای لەسەر دادەگیرسێنن وەکو بە مەزن ڕاگرتنی و زیادەڕەوی کردن تێیدا .

سەردانی ئافرەتان بۆ لای گۆڕەکان یەکێکە لە تاوانە گەورەکان، هەروەها بکرێتە مزگەوت و چرای لەسەر هەڵواسرێت ئەوا لەعنەت لە خاوەنەکەی کراوە .

بەشەکانی سەردانی گۆڕستان :

١. **( شەرعی ) :** ئەوەیە کە کۆڵ و باری بۆ ڕێك ناخرێت، وە مەبەست لێی یادکردنەوەی دوارۆژە و دوعاکردنە بۆ خۆی و مردووەکان .
٢. وە ئەگەر مەبەستی پاڕانەوە بوو لە مردووەکان ئەوا سەردانێکی (شیرکی)یە .
٣. وە ئەگەر مەبەستی پاڕانەوە بوو لە خوا لای مردووەکان ئەوا سەردانێکی (بیدعی)یە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری (الاوثان) ( ئەوەیە کە لە جگە لە خوا دەپەرسترێت جا ئیتر بت بێت یان گۆڕ یان هەر شتێکی تر ).

**دووەم :** تەفسیری پەرستن ( زەلیلی نواندن و ملکەچ بوون بۆ پەرستراو لە ترس و ئومێد و خۆشەویستی و بە مەزن زانینی)

**سێیەم :** پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەنای بە خوای گەورە نەگرتوو ئیللا لەبەر شتێك ترسی روودانی هەبووبێت .

**چوارەم :** باسی ئەوەی قەبرەکەی نەکرێتە مزگەوت و قەبری پێغەمبەرانی پێش خۆی کراون بە مزگەوت لە یەك فەرموودەدا باس کراوە و بە یەکەوە گرێی داوە .

**پێنجەم :** باسی توندی توورەبوون لە لایەن خوداوە .

**شەشەم :** ئەویش لە گرنگترینیانە زانینی شێوازی پەرستنی (لات)ـە، کە یەکێکە لە گەورەترین بتەکان .

**حەوتەم :** زانینی ئەوەی کەوا ئەوە گۆڕی پیاوچاکێکە .

**هەشتەم :** ئەوە ناوی خاوەنی گۆڕەکەیە، وە باسی مانای ناوەکە (لە چییەوە هاتووە) .

**نۆیەم :** لەعنەت کردنی پێغەمبەری خوا لەو ئافرەتانەی کە زۆر دەچنە سەر گۆڕەکان .

**دەیەم :** لەعنەت کردنی لەوانەی چرا دادەگیرسێنن لەسەر گۆڕەکان .

- **مەسەلەیەکی گرنگ :** زیادەڕەوی لە گۆڕی پیاوچاکاندا دەیانکاتە بت (اوثان) هەروەکو گۆڕی (اللات) کرا بە بت .
- **مەسەلەیەك :** ئەگەر ئافرەتێك رۆیشت بە (الروضة) لە مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئەوەی نوێژی تێدا بکات، ئەو کاتە گۆڕەکەی لێوە نزیکە ئەوا رادەوەستێ و سڵاو دەکات، وە هیچ رێگرێك نییە، وە باشتر وایە لە قەڵەباڵغییەکە و تێکەڵ بوونی پیاوان دوور بکەوێتەوە و بۆ ئەوەی هەرکەسێك بینی گومانی ئەوە نەبات کەوا ئافرەت دروستە بۆی بچێت بۆ زیارەت .

## ٢٢/ ئەو بەڵگانەی هاتوون لە پاراستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ تەوحید، وە داخستنی هەموو ڕێگایەك خاوەنەکەی دەگەیەنێتە شیرك .

ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی ئەوە ڕوون بکاتەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگرێکی داناوە ببێتە بەربەستێك بۆ ئەوانەی دەیانەوێت لە دەوری تەوحید نزیك ببنەوە بە پاراستنێکی مەحکەم، وە هیچ دەرگایەکی کراوەی نەهێشتووەتەوە هەرکێ بیەوێت لێی بێتە ژوورەوە، بەڵکو هەموو دەرگایەکی داخستووە خاوەنەکەی دەگەیەنێتە شیرك .

### بەڵگەی یەکەم و دووەم :

١. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾

٢. لە (ئەبو هورەیرە)وە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ﴿لا تجعلوا بيوتكم قبورا، ولا تجعلوا قبري عيدا، وصلوا علي فإن صلاتكم تبلغني حيث كنتم﴾ (رواه أبو داود بإسناد حسن ورواته ثقات) واتە : ماڵەکەتان مەکەنە گۆڕستان، وە گۆڕەکەی من مەکەنە جەژن (واتە: سەردانی مەکەن لە کاتی دیاری کراودا ساڵانە یان مانگانە یان هەفتانە)، وە صەڵاواتم لەسەر بدەن چونکە صەڵاواتەکەتان پێم دەگات لە هەر کوێیەك بن ) .

(لَقَدْ جَآءَكُمْ) : بە سێ شێوازی دووپاتکردنەوە دووپاتکراوەتەوە : سوێند خواردنە تەقدیر کراوەکە، وە پیتی (لام)، وە (قد) .

(مِّنْ أَنفُسِكُمْ) : واتە: ١/ مرۆڤێکە لە جنسی خۆتان، بەڵام لە ئێوە جیاوازە بەوەی وەحی بۆ دەکرێت . ٢/ وە لە خوێندنەوەیەکی تردا هاتووە : (مِن أَنْفَسِكُمْ):

بە بوونی (فەتحە) لە سەر پیتی (فاء)ەکە، واتە : لە هەمووتان شەریفتر و لە خواترسترە .

(عَزِيزٌ عَلَيْهِ) : ئەوەی ئێوە پێی گران و نارەحەت دەبن ئەویش پێی گران و نارەحەت دەبێت، بۆیە بە حەنیفییەتی پاك و بێگەرد و دوور لە شیرك رەوانە کراوە.

(حَرِيصٌ عَلَيْكُم) : هەموو توانای خۆی دەخاتە گڕ لە پێناوی بەرژەوەندی ئێوەدا.

(بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ) : پێشخستنی ئەوەی حەقی دواخستنە سوودی (حەصر) دەگەیەنێت، واتە : بەرانبەر بە جگە لە ئیمانداران توندە، ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ﴾

(فَإِن تَوَلَّوْا۟) : ئەگەر پشتیان لێ کردی، نەیفەرموو : پشتتان لێ کرد، ١/ چونکە پشت لێکردن لە گەڵ ئەم روونکردنەوەدا مەکروهە، ٢/ هەروەها بۆ ورياکردنەوەی خوێنەرە، بۆیە راناوەکەی گۆڕی تاوەکو وریابێت .

(فَقُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ) : گوێ بە پشتکردنەکەیان مەدە و بە زمان و دڵت بڵێ : (حسبي الله) واتە : من خوام بەسە .

(بُيُوتَكُمْ قُبورا) : واتە : ١/ واز لە نوێژکردن مەهێنن تێیدا . ٢/ مردووی تێدا مەنێژن .

(عيداً) : واتە : بەردەوام مەیەنە سەر گۆڕەکەم و مەیکەنە عادەتێك، جا ئیتر ئەگەر هاتوو ساڵانە بوو یان مانگانە یان هەفتانە، بەڵکو لەبەر هۆکارێك سەردان دەکرێت وەکو گەڕانەوە لەسەفەر یان یادخستنەوەی قیامەت .

(وصلُّوا عليَّ) : جا درووود و صەڵاوات دان لە لایەن خوداوە بریتییە لە ستایش کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لای فریشتەکان .

(تُبَلِّغُني) : چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (إنَّ لله ملائكة سيَّاحين في الأرض يبلِّغوني عن أمتي السلام) واتە : خوای گەورە فریشتە گەلێکی هەیە بە زەویدا دەسوڕێنەوە سەلامی ئوممەتەکەمم پێ دەگەیەنێت ) بۆیە پێویست بەو هەموو قەڵەباڵغییە ناکات لای گۆڕەکەی .

## بەڵگەی سێیەم :

(( وعنْ عَلِيّ بْنِ الحُسَيْنِ، أَنَّهُ رَأَى رَجُلا يَجِيءُ إِلَى فُرْجَةٍ كَانَتْ عِنْدَ قَبْرِ النَّبِيّ (ﷺ)، فَيَدْخُلُ فِيهَا فَيَدْعُو، فَنَهَاهُ، وقَالَ : أَلا أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ أَبِي، عَنْ جَدِّي، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : لا تَتَّخِذُوا قَبْرِي عِيدًا، وَلا بُيُوتَكُمْ قُبُورًا، فَإِنَّ تَسْلِيمَكُمْ يَبْلُغُنِي أَيْنَمَا كُنْتُمْ)) رواه في (المختارة) . واتە : لە (علی کوڕی الحسین) هاتووە، کەوا کابرایەکی بینی دەچووە کەلێنێکەوە لە نزیك قەبری پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، دەچووە ئەو کەلێنەوە و دوعای دەکرد، ئەویش نەهی لێکرد و فەرمووی : ئایە فەرموودەیەکتان بۆ بگێڕمەوە لە باوکمەوە( واتە : ئیمام حوسێن) بیستوومە لە باپیرمەوە (واتە : ئیمام عەلی) لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی : قەبرەکەی من مەکەنە جەژنێك (واتە بەردەوام ساڵانە یان مانگانە یان هەفتانە سەردانی بکەن) وە ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان، چا سەلامەکانتان بە من دەگات لە هەر کوێیەك بن .

- (فَيَدْعُو) : وای دەزانی پاڕانەوە لای گۆڕەکەی تایبەتمەندییەکی تایبەتی هەیە، ئەمە دەرگا و وەسیلەیەکە بەرەو شیرك.
- (أيْنَمَا كُنْتُمْ) : مەبەست : صەڵاواتم لەسەر بدەن لە هەر کوێیەك بوون، وە پێویست ناکات بۆ ئەوەی بێن بۆ لای گۆڕەکەم و سەلامم لێ بکەن و صەڵاواتم لەسەر بدەن لای گۆڕەکە.

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتی (براءة) ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾

**دووەم :** دوور خستنەوەی ئوممەتەکەی لەو جێگا گوماناوییە بەو پەڕی دوور خستنەوە (لا تجعلوا بيوتكم قبورا ...) .

**سێیەم :** باسی سوور بوون و بەزەیی و میهرەبانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئێمە (ئایەتەکەی براءة) .

**چوارەم :** نەهیکردنی لە سەردانی گۆڕەکەی بە شێوەیەکی تایبەت، هەرچەندە سەردانی کردنی یەکێکە لە باشترین کارەکان ( چونکە لە سەردانی کردنیدا سەلامی لێ دەکرێت، وە حەقی ئەو لە گەورەترین حەقەکانە) .

**پێنجەم :** نەهیکردنی لە زۆر سەردانی کردنی .

**شەشەم :** هاندانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئەنجامدانی نوێژە سوننەتەکان لە ماڵەوە.

**حەوتەم :** ئەوان یەکلا بووەتەوە لایان کەوا لە گۆڕستاندا نوێژ ناکرێت .

**هەشتەم :** روونکردنەوەی هۆکاری ئەوەی کەوا صەڵاوات دان و سەلام کردنی هەرکەسێك پێی دەگات هەرچەندە دوور بێت، بۆیە پێویست ناکات بۆ ئەو کەسانەی کە گومانیان وایە خۆیان نزیك بکەنەوە باشترە ( بۆیە علی بن الحسین دەفەرموێت : تۆ و ئەو کەسەی لە (ئەندەلوس)ـە وەکو یەکن ) .

**نۆیەم :** پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بەرزەخدایە و کردەوەی ئوممەتەکەی پیشان دەدرێت کاتێ صەڵاوات و سەلامی لە سەر دەدەن .

## پێنجەم : پەرچدانەوەی بەڵگەی ئەو کەسەی دەڵێت : شیرك لەم ئوممەتەدا روو نادات یان لە نیمچە دورگەی عەرەبیدا ( یەك بەشە ).

### ٢٣/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون کەوا هەندێ لەم ئوممەتە بت دەپەرستن .

- نوسەر ئەم بەشەی هێناوەتەوە بۆ پەرچدانەوەی حوججەی ئەو کەسەی دەڵێت: ناکرێت بتپەرستی لەم ئوممەتەدا روو بدات، چونکە ئەم ئوممەتە لە شیرك پارێزراوە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێت : (إنَّ الشيطان أيِسَ أن يعبدهُ المصلون في جزيرة العرب) واتە : شەیتان بێ ئومێد بوو کەوا نوێژخوێنان لە نیمچە دورگەی عەرەب بیپەرستن)
- وەڵامێك بۆ گومانەکەیان بە شێوەیەکی گشتی : ئەم باسە لە جۆری شوێنکەوتنی (متشابە)ـە و وازهێنانە لە (محكم) .

١. وە بە وەڵامێکی درێژی وەڵامی دەدەینەوە و دەڵێین :
٢. هەواڵدان بە بێ ئومێدی شەیتان مانای ئەوە نییە روو نادات .
٣. بێ ئومێد بووە لە نوێژخوێنان بەڵام خۆ بێ ئومێد نەبووە لەوانەی وازیان لە نوێژ هێناوە، وە نوێژ خوێنیش کەسی یەکتاپەرستە .
٤. ئەم تێگەیشتنە جیاوازە لە گەڵ زۆرێك لە دەقەکانی قورئان و سوننەتدا .
٥. هاوەڵان کوشتاریان لە گەڵ هەڵگەڕاوەکاندا کرد لە نیمچە دورگەی عەرەب بە هۆی شیرکەکەیانەوە .
٦. ئەوەی واقیع پیشانمان دەدات جیاوازە لە گەڵ ئەمەدا، بۆیە بۆ نمونە سەربڕینی ئاژەڵ بۆ جگە لە خوا لە نیمچە دورگەی عەرەبیدا دەبینین .
٧. ئەم شتە لە دڵی شەیتاندا روویدا، بەڵام ئەو وازی نەهێناوە لە کارکردن لەسەر لە خشتەبردنی بەنی ئادەم .
٨. ئەمە روویدا کاتێك فتوحاتی ئیسلامی زۆر بوون و خەڵکی پۆل پۆل هاتنە ناو دینی خواوە .
٩. زانایان باسی چەند شتێك دەکەن کە کەسی موسڵمانی پێ لە دین هەڵدەگەڕێتەوە و لە نیمچە دورگەی عەرەبیدا هەیە .

**سوودێك :**

هەرکەسێك بانگەشەی ئەوە بکات کەوا (مسیلمة) پێغەمبەرە ئەوا کافر بووە، وە سوود لە شایەتومانەکەی نابینێت، ئەی چۆنە ئەگەر کەسێك (التیجاني) و جگە لەو بەرز بکاتەوە بۆ پلەی خوای زەوی و ئاسمانەکان، ئایە بەم کارەی کافر نابێت ؟ ئەمەش لە سەیرترین شتە سەیرەکانە !!

لە چی روویەکەوە نوسەر ئەم ئایەتانەی هێناوەتەوە بۆ بەشەکە چونکە هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە لە سەر ئەوەی دەیەوێت ؟

مەبەستەکە روون نابێتەوە ئیللا بە فەرموودەکەی (أبو سعید) نەبێت، ئەو کات ئایەتەکان بە تەواوی لە گەڵ ناونیشانەکەدا دەگونجێ .

**بەڵگەی یەکەم و دووەم :**

١. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ ﴾

٢. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللَّهِ مَن لَّعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ ﴾

(أَلَمْ تَرَ) : ئەم پرسیارە لێرەدا بۆ دان پیانان و سەرسوڕمانە، وە دواندنەکە دروستە بۆ هەر کەسێك دواندنەکەی رووی تێ بکرێت .

(أُوتُوا) : پێیان درا، وە هەموو کیتابەکەیان پێ نەدرا، چونکە لێی مەحروم بوون بە هۆی سەرپێچییەوە .

(يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ) : واتە باوەڕیان پێ دەکەن، وە دانی پێدا دەنێن و ئینکاری لێ ناکەن .

## سوود بە دەست هاتووەکانی ئایەتی یەکەم :

١. زۆر سەیرە کەسێك پشکێکی لە کیتاب پێ ببەخشرێت ئەمجار باوەڕ بە بت و تاغوت و جادوو بکات .

٢. زانست و زانیاری خاوەنەکەی لە سەرپێچی ناپارێزێت .

٣. پێویستە ئینکاری بکرێت لە بت و تاغوت و جادوو، بۆیە دروست نییە ئیقراری بت و تاغوت و جادوو بکرێت .

٤. کەسانێك هەن لەم ئوممەتەدا باوەڕ بە بت و تاغوت و جادوو دەکەن، هەروەکو لە بەنی ئیسرائیلدا هەبوو .

(قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم) : دواندنەکە بۆ پێغەمبەری خوایە (ﷺ) وەك وەڵامێکی ئەو جولەکانەی کە دینی ئیسلامیان کردووەتە یاری و گاڵتەجاری، وە پرسیار کردنەکە بۆ دانپیانان و تەشویق و هاندانە .

## سوود بە دەست هاتووەکانی ئایەتی دووەم :

١. دانپیانانی کەسی نەیار و بکرێتە بەڵگەی بە سەر خۆیەوە بەوەی نەتوانێت ئینکاری لێ بکات، چونکە جولەکەکان باش دەزانن کەوا کۆمەڵێکیان خوای گەورە لێیان تووڕە بوو و لەعنەتی لێ کردن و ئەوانی کرد بە مەیمون و بەراز، جا ئەگەر ئەوان لە کاتێکدا دان بەوەدا دەنێن کەچی گاڵتە بە موسڵمانان دەکەن، ئەوا پێیان دەڵێین : ئەوانەی کە توشی ئەو سزایە بوون ئەوان لە پێشترن گاڵتەیان پێ بکرێت .

٢. جیاوازی پێگەو پایەی خەڵکی لای خوای گەورە، بە زیادبوونی ئیمان و کەمکردنی ئیمانە و ئەوەی لەسەر بنیات دەنرێت .

٣. خراپی حاڵی جولەکە، چونکە توشی سزای لەعنەت و گۆڕینی رواڵەت (بوونە مەیمون و بەراز) و تووشی تاغوت پەرستی بوون .

٤. سەلماندنی کردارە هەڵبژاردەکانی خوای گەورە، لە لەعنەت کردن وتووڕە بوون و توانا، وە هەرچی شتێك ویستی لێ بێت دەیکات .

٥. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : (إنَّ اللهَ لم يجعل لمسخ نسلا ولا عقبا) واتە : ئەوانەی خوای گەورە کردنی بە مەیمون و بەراز (هەر گیاندارێکی تر) هیچ نەوە و زوریەتێکی بۆ نەهێشتوون) جا مەیمون لە پێشدا بوونی هەبووە .

٦. سزاکان لە جۆر و جنسی کردارەکە دەبێت، جا جولەکە کارێکیان کرد کە لە رواڵەتدا درووست بوو کەچی ئەویش حەرامە .

٧. جولەکەکان وایان لێ هات تاغوتیان دەپەرست، گومانیشی تیادا نییە کە تاوەکو ئێستا دەیپەرستن .

**بەڵگەی سێیەم :**

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ ﴾

(قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟) : ئەم قسەیە دەسەڵات دارەکان وتیان لە کاتێکدا سوێندیان دەخوارد و دووپاتیان دەکردەوە .

١. ئەو رووداوە سەیرانەی لە چیرۆکی یارانی ئەشکەوتدا هاتووە، لە بوونی چەندین ئایەت، هەموو دەلالەت دەکەن لە سەر تەواو و کەمالی توانای خوای گەورە .

٢. لە هۆکارەکانی دروستکردنی مزگەوتەکان لەسەر گۆڕەکان زیادەڕەوییە بۆ لە گۆڕنراوەکە .

٣. زیادەڕەوی لە گۆڕەکاندا هەرچەندە کەم بێت رەنگە سەر بکێشێ بۆ شتێ لەوە گەورەتر .

## بەڵگەی چوارەم :

لە (أبو سعيد الخدري)یەوە ریوایەت کراوە کە خۆشەویستمان (ﷺ) فەرموویەتی :
(( لتتبعن سنن من كان قبلكم، حَذوَ القُذَّة بالقُذَّة، حتى لو دخلوا جحر ضب لدخلتموه "
قالوا : يا رسول الله (ﷺ) : اليهود والنصارى ؛ قال : "فمن ؟؟)) (أخرجاه)، واتە : ڕێگا و ڕێسای ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، وەکو پەڕی تیرەکان (هەروەکو چۆن وەکو یەکن و بە تەنیشت یەکەوەن)، تەنانەت ئەگەر ئەوان بڕۆنە کونی بزن مژەکەوە ئەوا دوایان دەکەون. فەرموویان :- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەبەستت جوولەکە و گاورەکانە ؟ فەرمووی: ئەی کێ ؟ )).

## بەڵگەی پێنجەم :

ئیمامی موسلیم ریوایەتی کردووە لە (ثوبان)ەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إنّ اللَّه زَوَى لِيَ الأَرْض فرأيْتُ مَشارِقَها ومغارِبَها، وإنّ أُمَّتِي سَيَبْلُغُ ملكها ما زُوِيَ لي مِنْها، و أُعْطِيتُ الكَنْزَيْنِ : الأَحْمَرَ والأَبْيَضَ، وإنِّي سأَلْتُ رَبِّي لأُمَّتي أنْ لا يُهْلِكَها بِسَنةٍ عامّةٍ، وأن لا يُسَلِّطَ علَيْهِمْ عدُواً مِنْ سَوى أنْفُسِهِمْ، فَيَسْتَبِيحَ بَيضَتَهُمْ، وإنّ رَبِّي عزَّ وجلَّ قالَ : يا محمّدُ (ﷺ)، إذا قَضَيْتُ قَضاءً فإنّهُ لا يُرَدُّ، وإنّي أعْطَيْتُكَ لأُمّتِكَ أنْ لا أُهْلِكَها بِسَنةٍ عامّةٍ، وأنْ لا أُسَلِّطَ علَيْهِمْ عدُوّاً مِنْ سِوَى أنفُسِهِمْ فَيَسْتَبيحَ بَيْضَتَهُمْ، ولو اجْتَمَعَ علَيْهِمْ مَنْ بأقْطارِها، حَتَّى يَكُونَ بَعْضُهُمْ يُهلكُ بَعْضاً، ويَسبي بعضهم بعضاً )) .
واتە : خوای گەورە زەوی بۆ نزیك کردمەوە (زەوی بۆ کۆکردمەوە) تاوەکو ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوام بینی، وە بە دڵنیاییەوە موڵك و دەسەڵاتی ئوممەتەکەم دەگاتە ئەو جێگایەی کە بۆم کۆ کرایەوە، وە هەردوو گەنجینەکەم پێدرا : سوور و سپی (واتە: گەنجینەی فارس و ڕۆم)، من داوام لە پەروەردگاری خۆم کرد کەوا ئوممەتەکەم بە گرانییەکی سەختی گشتگیر لە ناو نەبات، وە دوژمنێکی جگە لە خۆیان باڵا دەست نەکات بە سەریاندا بگاتە رادەیەك کە وەچە و نەوەیان لە ناو ببات، وە پەروەردگارم پێی فەرمووم : ئەی (محمد) (ﷺ) من ئەگەر هاتوو هەر فەرمایشتێکم بڕیار دابێت ئەوا گەڕانەوەی نییە، دڵنیابە ئەوەم پێ بەخشیت کەوا

ئوممەتەکەت بە گرانییەکی سەختی گشتگیری لە ناو نەبەم و دوژمنێکی جگە لە خۆیان بالاّ دەست نەکەم بە سەریاندا بگاتە رادەیەك کە وەچە و نەوەیان لە ناو ببات، ئەگەرچی هەموو خەڵکی دەور و بەریان لەسەر کۆ ببنەوە، تاوەکو هەندێکیان ئەوانی تر لە ناو دەبەن، وە هەندێکیان ئەوانیتر دیل و ئەسیر دەکەن)).

ورواه البرقاني في صحيحه، وزاد : ((وإنَّما أخاف على أُمَّتِي الأَئِمَّةَ المضلِّين، وإذا وَقعَ عليهم السَّيْفُ لَمْ يُرْفَعْ إلى يَوْمَ القيامَةِ، ولا تَقومُ السَّاعةُ حَتّى يلْحَقَ حيٌّ منْ أُمَّتِي بالمشْرِكينَ، وحَتّى تَعْبُدَ فئامٌ مِنْ أُمَّتِي الأَوْثانَ، وإنّهُ سَيَكُون في أُمَّتِي كذّابونَ ثلاثونَ كُلّهُمْ يَزْعمُ أنّهُ نَبِيٌّ، وأنا خاتِمُ النّبيين، لاَ نبي بَعْدِي، ولا تَزَالُ طائِفَةٌ منْ أُمَّتِي على الحَقِّ منصورة، لا يَضَرُّهُمْ منْ خذلهُمْ حَتّى يأْتِي أمْرُ اللّهِ تبارك وتعالى)

(البرقانی) ریوایەتی کردووە لە (صحیح)ەکەیدا، ئەمەشی زیاد کردووە : ((تەنها لە پێشەوایانی گومڕاکەر دەترسێم لەسەر ئوممەتەکەم، وە ئەگەر کوشتار لە ناو ئوممەتەکەمدا پەیدا بوو ئەوا لە ناویاندا دەمێنێتەوە تاکو رۆژی قیامەت، وە قیامەت هەڵناسێت تاوەکو کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم پەیوەندی بە موشریکەکانەوە نەکەن (دەبنە موشریك)، وە تاوەکو کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم بت دەپرستن، وە لە ئوممەتەکەمدا سی درۆزن پەیدا دەبن هەموویان بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن، وە منیش کۆتا پێغەمبەرم، هیچ پێغەمبەرێك لە پاش من نییە، وە بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم لەسەر حەقن و زاڵ و سەرکەوتوون، ئەوانەی وا دەستیان لێ هەڵدەگرن و پشتیان لێ دەکەن زەرەر و زیانیان پێ ناگەیەنن تاوەکو فەرمانی خوای گەورە دێت )) .

**(سَنَن)** بە دانانی (فەتحە) لە سەر سینەکە بە مانای رێگا دێت، وە بە دانانی (ضمة) لە سەر سینەکە بە مانای تەریقەت دێت.

**(حذو القذة بالقذة)** : (القذة) بریتییە لەو پەڕەی لە تیری دەبەستن، ئەمەش کینایەیە بۆ زۆری لێکچواندنەکە .

١. هەندێ لەم ئوممەتە بت دەپەرستن، چونکە لە سوننەتی ئەوانەی پێش خۆمانە، وە ئێمەش شوێنیان دەکەوین .

٢. پێویستە بە زانینی ئەوەی ئەوانەی پێش خۆمان لەسەری بوون لە شتێکدا کە پێویستە لێی ئاگادار بین بۆ ئەوەی لێی دوورکەوینەوە، وە زۆربەی ئەوانە لە قورئان و فەرموودەدا هەیە، بۆیە لە سەرپێچیدا شوێنیان ناکەوین .

٣. بە گەورە زانینی تاوانی شوێنکەوتنمان بۆ ئەوانەی پێش خۆمان هاتون لە لایەن هاوەڵانەوە، لە پاش ئەوەی هیدایەت دراین و ڕێنمویی کراین .

٤. هەرکاتێك ماوەیەکی زۆر ڕۆیشت بەسەر خەڵکی و پەیامی پەیامبەراندا، ئەوا زیاتر لە حەق دوور دەکەونەوە .

**(زَوی) :** واتە : زەوی بۆ کۆکردەوەو هێنایە یەك . **(الأحمر والأبيض)** : ئاڵتون و زیو، گەنجینەکانی کیسرا و قەیصەر .

**(وإِنّي سألتُ ربي لأُمتي) :** پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای سێ شتی کرد، دوانی پێدرا و یەکێکی پێ نەدرا .

١. ئەم ئوممەتە بە گرانی و بەڵایەکی گشتی لە ناو نەبات، گرانی و قاتی بەسەر هەموو ئەم ئوممەتەدا زاڵ نەکات .

٢. بێباوەڕان دەسەڵاتیان نەبێت بە سەر هەموو ئوممەتی ئیسلامیدا .

٣. ئەم ئوممەتە لە ناو یەکتردا بە جەنگ و شەڕ نەیەن، ئەم خاڵە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبەخشرا .

**(الأئمة المضلين) :** ترسی حەصر کردووە لە پێشەوا گومڕاکاندا، وە پێشەوا لە :

١/ خەیردا دەبێت : ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾

٢/ لە شەڕدا دەبێت : ﴿ وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ ﴾

**(وقع عليهم السيف لم يُرفع) :** هەر ئەمە بوو روویدا، لە کوشتنی ئیمامی عوسمانەوە تاوەکو ئەمڕۆ .

**(وحتى تَعبدَ فئامٌ من أمتي الأوثان) :** تاوەکو چەند کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم بت دەپەرستن .

**(كذَابون ثلاثون) :** ئەمە لە رووی زۆرییەوەیە یان لە رووی حەصرەوە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکەی (النساء) : ﴿ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ ﴾

**دووەم :** تەفسیری ئایەتەکەی (المائدة) : ﴿ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَۚ ﴾

**سێیەم :** تەفسیری ئایەتەکەی (الكهف) : ﴿ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا ﴾

چونکە کاتێ ئوممەتەکانی پێشوو بتیان پەرست، ئەوا لەم ئوممەتەشدا بت پەرست پەیدا دەبێت).

**چوارەم :** ئەویش گرنگترینیانە، ئایە مانای باوەڕهێنان بە بت و سیحر و تاغوت چییە ؟ لەم جێگایەدا ئایە مەبەستی باوەڕهێنانە بە دڵ ؟ یان کۆك بوونە لە گەڵ خاوەنەکانیاندا و زانینی پووچەڵ بوونیەتی ؟

١/ ئەگەر لە گەڵ خاوەنەکانیاندا کۆك بوو و باوەڕی وا بوو کە دروست و راستن، ئەوە کافر دەبێت .

٢/ ئەگەر لە گەڵ خاوەنەکانیاندا کۆك بوو و باوەڕی وا نەبوو کە دروست و راستن، ئەوە کافر نابێت .

**پێنجەم :** ئەو قسەیەیان کە دەڵێن : رێگای ئەو بێباوەڕانەی کە کوفری خۆیان دەزانن لە ئیمانداران راستترە ( واتە ئەم قسەیە لە خۆیدا کوفر و هەڵگەڕانەوەیە لەبەر پێشخستنی کوفر بەسەر ئیماندا) .

**شەشەم :** ئەویش مەبەستە لە ناونیشانەکە کەوا ئەمە دەبێت روو بدات لەم ئوممەتەدا هەر وەکو باسکرا لە فەرموودەکەی (أبو سعيد) (ئەمەش وریاکردنەوە لە خۆ دەگرێت) .

**حەوتەم :** ئاگادار کردنەوە بە راشکاوی کەوا روو دەدات – مەبەستم بت پەرستی– لەم ئوممەتەدا و لە ناو کۆمەڵێکی زۆردا .

**هەشتەم :** سەیر لەوەدایە دەرچوونی کەسانێك کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن، وەکو (المختار) هەرچەندە خۆی شایەتمانی دەهێنا، وە بە راشکاوی دانی بەوەدا دەنا کە خۆی یەکێکە لەم ئوممەتە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەقە و قورئان حەقە و تیایدا هاتووە کەوا (محمد) کۆتا پێغەمبەرە(ﷺ)، وە لە گەڵ ئەوەشدا باوەڕ بە هەموو ئەمانە دەکات لە گەڵ ئەو دژ بە یەکە روونە، وە (مختار) لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵاندا دەرچوون، وە خەڵکێك شوێنی کەوتن (مختار کوڕی أبي عبيد الثقفي).

**نۆیەم :** موژدەی ئەوەی تێدایە : کەوا حەق بە یەکجاری لە ناو ناچێت هەروەکو چۆن لە پێشدا لەناودەچوو، بەڵکو بەردەوام کۆمەڵێك لەم ئوممەتە لەسەر حەقن (لەم ئوممەتەدا زاڵ و سەرکەوتوون تاکو رۆژی قیامەت).

**دەیەم :** نیشانە گەورەکە لەوەدایە، هەرچەندە ئەوان کەمن کەچی هەر کەسێك پشتیان لێ بکات و لە گەڵیاندا جیاواز بێت ئەوا هەرگیز زیانیان پێ ناگەیەنێت .

**یازدەیەم :** ئەمە مەرجێکە تاکو نزیك بوونەوەی هەستانی قیامەتە .

**دوازدەیەم:** چەند ئایەتێکی مەزنی تێدایە، لەوانە: هەواڵدانی بەوەی کە خوای گەورە رۆژهەڵات و رۆژئاوای بۆ راخستووە، وە هەواڵی داوە دەربارەی مانای ئەوە، ئەوەی ئەو فەرمووی روویدا بە جیاواز لە گەڵ باکوور و باشووردا، وە هەواڵدانی بەوەی هەردوو گەنجینەکەی پێدراوە، وە هەواڵدانی بە وەڵامدانەوەی دوعاکەی بۆ ئوممەتەکەی لە دوو شتدا، وە هەواڵدانی بەوەی سێیەم دوعای وەڵام نەدراوەتەوە، وە هەواڵی داوە کە جەنگ روو دەدات، وە ئەو جەنگە ئەگەر روویدا بەرز نابێتەوە

(کۆتـایی پێنایـەت)، وە هـەواڵی داوە هەنـدێکیان هەنـدێکی تـر لـە نـاو دەبـەن، وە هەندێکیان هەندەکەی تر بە دیل و ئەسیر دەبەن، وە لە ئوممەتەکەی ترساوە کـەوا توشـی پێشـەوایانی گـومڕا بـن، و هــەواڵی داوە بــە دەرکــەوتنی چــەند کەسـێك بانگەشەی پێغەمبەرایـەتی دەکـەن لـەم ئوممەتـەدا، وە هـەواڵی داوە بـە مانـەوەی کۆمـەڵی ڕزگـار بـوو، وە هـەموو ئەمانـە ڕوویـداوە، هـەروەکو چـۆن هـەواڵی داوە، هەرچەندە هەر یەکێك لەوانە زۆر ئەستەمە عەقڵ بۆی بچێت .

**سیازدەیەم :** ترسی لە ئوممەتەکەی حەصر کردووە لە پێشەوایانی گومڕایی .

**چواردەیەم :** وریاکردنەوە لە مانای بت پەرستی ( تەنها تایبـەت نییـە بـە کرنـۆش و سوجدە بردن بۆیان بەڵکو شوێنکەوتنی گومڕاکانیش دەگرێتەوە) .

## تاقیکردنەوەی هەردوو بەشی ( چوارەم و پێنجەم ) ( ٥ بەشە )

**پرسیاری یەکەم :** ناونیشانی بەشەکانی ئەم دوو بەشە بنووسە و پەیوەندی هەر بەشە بە کتێبەکەوە .

| بەش | ناونیشانی بەشەکە | هۆی هێنانەوەی بەشەکە لە لایەن نوسەرەوە |
| --- | --- | --- |
| یەکەم | | |
| دووەم | | |
| سێیەم | | |
| چوارەم | | |
| پێنجەم | | |

**پرسیاری دووەم :** نیشانەی (×) لە جێگای گونجاودا دابنێ یان بۆشاییەکە پڕ بکەرەوە:

١/ زیادەڕەوی لە پیاوچاکاندا بنەمای شیرکە لە کۆن و تازەدا : (راستە – هەڵەیە) .

٢/ زیادەڕەوی واتە : ............. وە لە خراپەکانی : ............................

٣/ توشی فیتنەبوون بە گۆڕەکانەوە وەکو تووشی فیتنەبوون بە بتەکانە بەڵکو توندتر :

( **راستە** **هەڵەیە** )

٤/ رازاندنەوەی گۆڕەکان و داگیرساندی چرا و هاوشێوەی و گەچکردنی و نوسین لەسەری و دروستکردنی قوببە لەسەری و داپۆشینی بە پەردە و هەستان بە خزمەتکردنی ئەوانەی سەردانی دەکەن و پارەدان بەوانەی خزمەتی دەکەن :

(واجیبە – حەرامە)

٥/ نوسەر دەڵێت : سەردانی گۆڕی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە باشترین کردارەکانە :

( **راستە** **هەڵەیە** )

٦/بە دواداچوونی شوێنەوارەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) :

موستەحەببە تەفصیلی تێدایە حەرامە

٧/ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ترسی لە سەر ئوممەتەکەی حەصر کردووە لە : ..............

٨/ موناسەبەتی هێنانەوەی نوسەر بۆ سێ ئایەتەکە لە ژێر بەشی :

ئەو بەڵگانەی هاتوون کەوا ئەم ئوممەتە بت دەپەرستن ؟

هیچ موناسەبەتێکی نییە روون نابێتەوە ئیللا بە فەرموودەکە نەبێت

هەڵەی هەندێ لە نوسخەکانە

٩/ خەڵکی بەرانبەر بە پیاوچاکان بوونەتە چەند بەشەوە :

دوو لا و ناوەندێك زیادەڕەو و کورتڕەو

١٠/ خۆشویستنی پیاوچاکان بە دوعاکردن بۆیان و لادانی لەکە و گومانەکانە لەسەریان وەرگرتنی زانیاری لێیانەوە دەبێت : **( ڕاستە هەڵەیە )**

١١/ زیادەڕەوی لە پیاوچاکاندا تەنها هۆکار نییە بۆ کوفر بەڵام ترسناکترین هۆکارەکانە :

**( ڕاستە هەڵەیە )**

١٢/ ئایە زیادەڕەوی دەچێتە ناو پەرستنەکانەوە : بەڵێ نەخێر

١٣/ ئەگەر بەندە خواپەرستی بە بیر نەیەتەوە ئیللا بە بینینی شەبەحی پیاوچاکان نەبێت، ئەو ئەم پەرستنە نوقصانە یان بوونی نییە : **( ڕاستە هەڵەیە )**

١٤/ (عبدالله ورسوله) ڕاستترین و شەریفترین وەصفە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) :

**( ڕاستە هەڵەیە )**

١٥/ (الإطراء) بریتییە لە ............... نمونەش لەسەری : ..........................

١٦/ (لا تُطْرُوني) هەموو ئەو زیادەڕەوانە دەگرێتەوە کە وەکو زیادەڕەوی گاورەکانە و ئەوەی لەوان کەمترە : **( ڕاستە هەڵەیە )**

١٧/ زیادەڕەوی روو دەدات لە :

ستایشدا پەرستندا کرداردا هەموو ئەوانەی باسکرا

١٨/ (المتنطعون) کێن ؟ ................................................

١٩/ (أهلكَ) مەبەست لێی لەناوچوونی : دینە جەستەکانە هەموو ئەوەی باسکرا

٢٠/ دینی خوای گەورە لە نێوان کەسانێکی زیادەڕەو و کەسانێکی کورترەو دایە :

**( ڕاستە هەڵەیە )**

٢١/ (التنطع) روو دەدات لە : قسەکردندا کردارەکاندا هەموو ئەوەی باسکرا

٢٢/ هەموو ئەم ئوممەتە کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کەوا حوسێن یەك سەری هەیە بەڵام لە واقیعدا زیاتر لە پێنج سەری هەیە : ( **راستە هەڵەیە** )

٢٣/ یەکەم شیرك لەسەر زەویدا لە قەومی کێدا روویدا ؟ ئادەم نووح ئیبراهیم

٢٤/ یەکەم شت لە دینی پێغەمبەراندا گۆڕدرا بریتی بوو لە شیرك، وە هۆکارەکەی زیادەڕەوی بوو لە پیاوچاکان : ( **راستە هەڵەیە** )

٢٥/ هەرکەسێ بیەوێ دینەکەی خۆی بە بیدعە بە هێز بکاتەوە ئەوا زیانەکەی لە قازانجەکەی زۆرترە : ( **راستە هەڵەیە** )

٢٦/ هەموو شتێك بکرێتە جەژن، هەموو هەفتەیەك یان ساڵێك دووبارە ببێتەوە و شەرعی نەبێت ئەوا :

بیدعەیە دروستە سوننەتە

٢٧/ بیدعەکان هۆکاری کوفرن : راستە هەڵەیە، چونکە کوفر بە خوای گەورە هۆکاری زۆرە

٢٨/ هۆکاری بزربوونی زانست و زانیاری مردنی زانایان

بێ ئاگایی پشت کردن لێی سەرقاڵبوون بە دونیاوە هەموو ئەوانەی باسکرا

٢٩/ سەردان کردنی گۆڕەکان :

شەرعییە بیدعەیە شیرکە هەموو ئەوانەی باسکرا

٣٠/ ئەو سەردانەی کە مەبەست لێی قازانجە بە مردووەکان و پەند وەرگرتنە لێی بیدعەیە :( **راستە هەڵەیە** ) وە ئەو سەردانەی کە مەبەست لێی قازانجە بە مردووەکان شەرعییە : ( **راستە هەڵەیە** )

٣١/ هەر شتێك هۆکار بێت بۆ ئەوەی ببێتە رێگر لە خەڵکی بۆ دینەکەیان پێ دەڵێن :

فیتنە بیدعە خورافات

٣٢/ مەبەست لە : **(لعنة الله على اليهود)** : دوعاکردنە لێیان

هەواڵدانە بەوەی خوای گەورە لەعنەتی لێکردوون ئیحتیمالی هەردوو ماناکەی هەیە

٣٣/ گۆڕەکان بکرێنە مزگەوت : بە سوجدە بردن لەسەری

دروست کردنی مزگەوت لەسەری        هەموو ئەوەی باسکرا

٣٤ / ریوایەتی (خُشي) واتە ئەوەی ترساوە : پێغەمبەری خوایە(ﷺ)    هاوەڵانە

٣٥/ گۆڕەکەی بەرز نەکراوەتەوە چونکە :

١/ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوە ترسا گۆڕەکەی بکرێتە بتێك و بپەرسترێت.

٢/ هاوەڵان لەوە ترسان گۆڕەکەی بکرێتە بتێك .

٣/ هەموو پێغەمبەرێك لەو شوێنەدا دەنێژرێت کە گیانی دەکێشرێت.

٤/ هەمووی ئەوەی باسکرا

٣٦/ (أُبرزَ قَبْرُهُ) واتە : ...................................................

٣٧/ حوکمی وتنی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) (حبیب الله)یە چییە؟ :

دروستە    کەمکردنەوەی حەقەکەیەتی    موستەحەببە

٣٨/ وتنی : ئیبراهیم (خلیل الله)یە و محمد (ﷺ) (حبیب الله)یە :

دروستە    موستەحەببە    دروست نییە

٣٩/ (الخلة) بۆ هیچ کەس نەسەلمێنراوە ئیللا بۆ :

ئیبراهیم    ئیبراهیم و محمد    ئیبراهیم و محمد و جگە لەوان

٤٠/ هەرکەسێك مزگەوتێکی لەسەر گۆڕێك دروست کرد :

گۆڕەکەی دەردەکرێت    مزگەوتەکە دەروخێنرێت و گۆڕەکە دەهێڵرێتەوە .

٤١/ دروست نییە نوێژ بکرێت :

لەسەر گۆڕەکان    بەرەو گۆڕەکان    لە ناو گۆڕەکان    هەمووی

٤٢/ خەڵکی جیاوازن لە :    خەیردا    شەڕدا    هەمووی

٤٣/ خراپترین کەس ئەو کەسانەن کە :  قیامەت هەڵدەستێ و هێشتا ئەوان زیندوون .

ئەوانەی قەبرەکان دەکەنە مزگەوت    هەمووی

٤٤/ پێویستە دوور بکەوینەوە لە :  شیرك    وەسیلەکانی    هەمووی

٤٥/ صەدەقەکردن لای گۆڕەکاندا ئاساییە، چونکە ئەوەی نەهی لێکراوە تەنها نوێژە :

(راستە     **هەڵەیە**)

٤٦/ خۆشوبهاندن بە بێباوەڕان تاوانێکی گەورەیە :

ئەگەر مەبەست لێی شەبهاندن بوو     ئەگەر مەبەستی بێت یان مەبەستی نەبێت.

٤٧/ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری کردوینەتەوە لەوەی گۆڕەکان بکرێنە مزگەوت :

لە ژیانیدا     پێش مردنی بە پێنج رۆژ     لە میانی قسەکانید ا     هەمووی

٤٨/ باشترین لە ئیمان و کردار لە سەرووی باشترینە لە نەسەب و رەچەڵەکدا :

(راستە     **هەڵەیە**)

٤٩/ **(لا تجعلْ قبري وثناً)** : وەڵامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) درایەوە

حیکمەتی خوای گەورە جگە لەوەی دەوویست

٥٠/ سەردانی کردنی ئافرەتان بۆ گۆڕستان لە تاوانە گەورەکانە : (**راستە**     **هەڵەیە**)

٥١/ پێغەمبەری خوا (ﷺ) : تەوحیدی پاراستووە

هەموو رێگایەك بەرەو شیرك بڕوات دایخستووە     هەمووی

٥٢/ **(بیوتکم قبوراً)** واتە :

مردووی تیادا مەنێژن     وازمەهێنن لە نوێژکردن تێیدا     هەمووی

٥٣/ سەردانی گۆڕی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە هۆی هۆکارێکەوە دەبێت و کۆچوباری بۆ ئامادە ناکرێت و بەردەوام ناچینە سەر گۆڕەکەی :     (**راستە**     **هەڵەیە**)

٥٤/ صەڵاواتدان و سەلامکردن لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) : لای گۆڕەکەی دەبێت، بۆیە وەصێت بەو کەسانە دەکرێت سەردانی مەدینە دەکەن سەلامی لێ بکەن

لە هەر کوێیەك بێت ( تۆ و ئەو کەسەی لە ئەندەلوسە وەکو یەکن)

٥٥/ **(قبري عيداً)** واتە : ..........................................................

٥٦/ نابێت شیرك لەم ئوممەتەدا روو بدات، چونکە لێی پارێزراوە : (**راستە**     **هەڵەیە**)

٥٧/ ﴿ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ هەموو کتێبەکەیان پێ نەدراوە بەڵکو لێی مەحروم بوون بە هۆی سەرپێچییەوە :     (راستە     **هەڵەیە**)

٥٨/ زانست و زانیاری خاوەنەکەی لە سەرپێچی ناپارێزێت : (راستە — **هەڵەیە**)

٥٩/ ئایە مەیمون و بەرازەکان پاشماوەی ئەوانەی شێوە و شکلیان گۆڕدرا (ممسوخ) ؟

بەڵێ        نەخێر

٦٠/ زیادەڕەوی لەسەر گۆڕەکان هەرچەندە کەم بێت ئەوا سەردەکێشێ بۆ لە خۆی گەورەتر : (**راستە**        **هەڵەیە** )

٦١/ نزیکە لەوەی هیچ سەرپێچییەك لەم ئوممەتەدا نەبینی ئیللا بنەماکەی لە ئوممەتەکانی پێشوودا بوونی هەبووە : (**راستە**        **هەڵەیە** )

٦٢/ ئەم ئوممەتە کاتێك دووبەرەکی تێکەوت و هەندێکیان ئەوانی تریان بە هەلاکەتدا برد، ئەوا خوای گەورە دوژمنێکی لە جگە لە خۆیان زاڵ کرد بە سەریاندا :

(**راستە**        **هەڵەیە** )

٦٣/ پێشەوا : پێشەوا دەبێت لە :   تەنها لە خەیردا        لە خەیر و شەڕدا بە یەکەوە

٦٤/ مەزنترین شت مرۆڤ لێی بترسێت تووشی ئەم ئوممەتە بێت :

پێشەوایانی خراپەکاری        شوێنکەوتنی سوننەتەکانی جولەکە و گاوڕەکان .

٦٥/ وەڵامی دوو دوعای پێغەمبەری خوا(ﷺ) درایەوە ئەوانیش

١/......................... ......................

٢/.............. وە وەڵامی سێەم نەدرایەوە کە ئەویش : ......................

## شەشەم : کردارە شەیتانییەکان ( حەوت بەشە )

### ٢٤/ بەشی ئەو بەڵگانەی لە سەر جادوو ( سیحر ) هاتوون .

جادوو (سیحر) دروست نابێت و ناکرێت ئیللا لە ڕێگای شیرکەوە نەبێت، جا شەیتانەکان خزمەتی مرۆڤەکان ناکەن ئیللا لەبەر بەرژەوەندییەك نەبێت، کە ئەویش سەر لێشێوانی بەنی ئادەمە و وایان لێ بکەن شیرك و سەرپێچی ئەنجام بدەن .

### بەڵگەی یەکەم و دووەم :

١/ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖۚ ﴾

٢/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ ﴾

عومەر فەرمویەتی: (الجبت : سیحر و جادووە، والطاغوت : شەیتانە)، وە جابر فەرموویەتی: (الطواغیت : ئەو کاهینانەن کە شەیتانەکان دەهاتن بۆ لایان، وە لە هەموو گەڕەکێکدا دانەیەك هەبوو).

- (ٱشۡتَرَىٰهُ) واتە : فێری بووە .
- (الطاغوت : شەیتانە) لە باسی تەفسیر کردنە بە نمونەوە،چونکە (طاغوت) لە شەیتان گشتگیرترە .

## ئایە پشکەکە بە گشتی لە دەست دەدات یان هەندێکی ؟

**رای یەکـــــــەم :** ئایەتـــەکان کــە هەڕەشەیان تێدایە بە ڕێیان دەخەین هــەروەکو چــۆن هــاتوون، وە ســوور نــابین لەســەر کۆکردنــەوەی لــە گــەڵ ئایەتەکانی بەڵێن دان بە لێخۆشبوون، بــۆ ئــەوەی لەســەنگ و بــەهای کــەم نەکرێتەوە، بە بەڵگەی ئـەو ئایەتـە کــە دەفــەرموێت : ﴿ وَمَا نُرۡسِلُ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّا تَخۡوِيفٗا ٥٩ ﴾ چونکە خوای گەورە هێناویەتییەوە لەبەر ترسان لەو کارە و دوور کەوتنـەوە و تۆقان لێی.

**رای دووەم :** ئایەتەکان کە هەڕەشـەیان لـە خـۆ گرتـــووە دەیانخەینـــە پـــاڵ ئـــەو ئایەتانـــەی لێخۆشبوون و لێبـوردنی لـە خـۆ گرتـووە، ئـەو کاتە نـەمانی پشـکەکە وردەکاری تێدا بـە دی دەکرێت :

**هــەمووی نــامێنێ :** ئەگـــــەر هــــاتوو ســیحرەکە بــە هــۆی بـــــــەکارهێنانی شەیتانەکانەوە بوو.

**هەندێکی نــامێنێ :** ئەگـــــەر هــــاتوو ســیحرەکە بــە هــۆی بـــەکارهێنانی دەواو دەرمانەوە بوو .

## بەڵگەی سێیەم :

لە (ابو هريرة)وە ریوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی : (اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ ». قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ(ﷺ) وَمَا هُنَّ ؟ قَالَ : « الشِّرْكُ بِاللَّهِ وَالسِّحْرُ وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلا بِالْحَقِّ وَأَكْلُ الرِّبَا وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ).واتە : دوور بکەونەوە لە حەوت بە هەلاکەت بەرەکە. وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانە چین ؟ فەرمووی : هاوەڵبڕیاردان بۆ خوا و سیحر و کوشتنی ئەو نەفسەی خوای گەورە کوشتنی حەرام کردووە ئـیللا بە حەقی خۆی نەبێت و خـواردنی ڕیبـا و خـواردنی سـەروەتو سـامانی هـەتیوان و هەڵاتن لە ڕۆژی ڕووبەڕوو بوونەوەدا و تۆمەتبارکردنی ئافرەتانی ئیمانداراني بێ ئاگا بە زینا (واتە : بوختیانیان بۆ بکرێت) .

**(اجْتَنِبُوا) :** واتە : وازی لێ بهێنن و لێی دوور بکەونەوە، بە شێوەیەك تۆ لە لایەك بێت و ئەویش لە لایەکەی تر .

**(السَّبْعَ) :** ئەم ژمارەیە مەبەست لێی (حەصر) نییە، چونکە چەندین تاوانی تر هەن کە ئەوانیش بە هەلاکەت بەرن .

**(وَأَكْلُ الرِّبَا) :** واتە بیبات، جا ئیتر ئەگەر بیخوات یان بیدات بە راخەرێك و رایخات یان جگە لەوانە، وە سوو (الربا) بریتییە لە زیادەیەك لە گرێبەستێکدا دەکرێت کە پێویست تیایادا یەکسانبوونە، وە دواخستنێکە لە گرێبەستێکدا لە نێوان شتەکاندا کەوا پێویست تیایدا وەرگرتنی دەست بە دەستە، ئەویش دابەش دەبێتە دوو بەشەوە : **یەکەم :** سووی زیادە . **دووەم :** سووی دواخستن .

**(وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ) :** وە (الیتیم) هەتیو : ئەو کەسەیە کە باوکی مردووە لە پێش ئەوەی بالغ بوو بێت، نێر بێت یان مێ .

**(وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ) :** هەڵاتن لە رۆژی روبەرووبونەوەدا لە کاتی جەنگدا لە گەڵ بێباوەڕاندا .

**(وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ) :** تۆمەتبارکردنی ئافرەتێکی ئازادی ئیماندار بە زینا .

(وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ) ئەویش چوار جۆرە :

**ئیماندار :** لەبەر ئیمانەکەی .

**کەسی (زیممی) :** ئەو کەسانەیە کە لە نێوان ئێمە و ئەواندا زیممەیەك هەیە و ئەوانیش سەرانە دەدەن.

**کەسی (موعاهید) :** لە نێوان ئێمە و ئەواندا پەیمانێك هەیە کەوا لە گەڵیاندا نەجەنگین و ئەوانیش لە گەڵماندا نەجەنگن

**کەسی (المستأمن) :** لە نێوان ئێمە و ئەواندا ئەمان هەیە لەبەر بوونی بازرگانی یان بۆ ئەوەی لە ئیسلام تێبگەن .

**(إلا بالحقّ) ئەویش سێ دانەیە :**




**وپشتكردن لە دوژمن لە سێ شوێن و جێگادا دروستە :**




**بەڵگەی چوارەم تا حەوتەم :**

٤/ وە لە (جندب) ەوە هاتووە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) كەوا فەرموویەتی: ( حد الساحر ضربه بالسيف ) واتە : حەددی كەسی ساحیر بریتییە لە لێدانی بە شمشێر (رواه الترمذي وقال : الصحيح أنه موقوف).

٥/ لە (صحيح البخاري) دا هاتووە لە (بجالة)ی كوڕی(عبدة)وە فەرموویەتی: عومەری كوڕی خەتتاب نوسراوێكی نووسی كەوا : (اقْتُلُوا كُلَّ سَاحِرٍ و ساحرة، قال : فَقَتَلْنَا ثَلَاثَ سَوَاحِرَ) واتە : هەموو ساحیرێكی پیاو یان ئافرەت بكوژن دەڵێت : ئێمەش سێ ساحیرمان كوشت .

٦/ له (حفصة) ەوە بـە (صـحيح) ڕیوایـەت کـراوە کـەوا : (أنها أمرت بقتل جارية لها سحرتها فَقُتِلَتْ) واتـە : فـەرمانی کـرد بەکوشـتنی کەنیزەیـەکی خـۆی کـە سـیحری لێکردبوو بۆیە کوژرا ).

٧/ هەروەها بە (صحيح)ی لە (جندب)ەوە ڕیوایەت کراوە . (قال احمد : عن ثلاثة من اصحاب النبي (ﷺ) واتە : لـە سـێ هاوەڵـەوە لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) هاتووە) ئەوانیش بریتین لە : (عمر و حفصة و جندب)

## حوکمی جادووباز چییە ؟

**ڕای یەکـــــــەم :** ( محمـدی کـوڕی عبـــــدالوهاب) : جـادوو هـەمووی کـــــوفرە، وە جادووبـــــازیش دەکوژرێـت بـە ڕەهـــــایی، وە تەوبەکەشـی لای خوایە .

**ڕای دووەم :** پێشەوا شافعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، هەر ئـەم ڕایەش شەیخ (ابن عثيمين) بە پەسەندی زانیوە (دوو جۆرە):

**جادووی شەیتانەکان :** بکەرەکـەی لـە دین هەڵگەڕاوەتـەوە داوای لـێ دەکرێـت تەوبـە بکـات، ئەگـەر تەوبەی کرد ئەوا دەیکوژین وەکو حـەددێك چـونکە موسـڵمانە، وە ئەگـەر تەوبـەی نـەکرد ئـەوا دەیکوژین وەکو کەسێکی لـە دین هەڵگەڕاوەی بێباوەڕە .

**جـادووی دەوا و دەرمـان :** حـــوکمی بکەرەکـــەی حـــوکمی کەســـی ستەمکاری (الصائل)، وە دەکوژرێت وەکو حـەددێك چـــونکە کەســـێکی موسڵمانە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (البقرة): ﴿ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ ﴾

**دووەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (النساء): ﴿ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ ﴾

**سێیەم :** تەفسیری وشەی (الجبت و الطاغوت)، وە جیاوازی نێوانیان، (الجبت : هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە خەیری تیادا نییە وەکو سیحر و جگە لە سیحر، وە (الطاغوت ): بریتیە لە هەموو ئەوەی بەندە لە سنوری خۆی پێی دەردەچێت لە پەرستراوێك یان شوێنکەوتەکراوێك (چاولێکراوێك) یان گوێرایەڵی کراوێك .

**چوارەم :** تاغوت جاری وا هەیە رەنگە لە جنۆکە بێت، وە رەنگە لە مرۆڤەکان بێت ( ئەگەر تاغوت بە رەهایی باس کرا ئەوا مەبەست لێی شەیتانی جنۆکەیە و کەسی (کاهین) شەیتانی مرۆڤە .

**پێنجەم :** زانینی حەوت بە هەلاکەت بەرەکە کە تایبەت کراون بە نەهی .

**شەشەم :** جادووباز کوفر دەکات .

**حەوتەم :** دەکوژرێت و داوای تەوبەی لێ ناکرێت ( چونکە حەدد ئەگەر گەیشتە پێشەوا ئەوا داوای تەوبە لە خاوەنەکەی ناکرێت، بەڵکو لە هەموو حاڵەتێکدا دەکوژرێت، بەڵام کوفر ئەوا داوای تەوبە لە خاوەنەکەی دەکرێت) .

**هەشتەم :** ئەم کارە لە ناو موسڵماناندا هەبووە لە سەردەمی ئیمامی عومەردا، ئەی چۆنە لە پاش سەردەمی ئەو ؟

ئەو رایەی کە دەڵێت : کوشتنی جادووباز لە لایەن کاربەدەستانەوە کۆکە لە گەڵ بنەما شەرعییەکاندا، چونکە ئەوان هەوڵ دەدەن فەساد و خراپەکاری لەزەویدا بڵاو بکەنەوە، وە خراپەکاری و فەسادی ئەوان لە گەورەترین خراپەکارییەکانە، بۆیە کوشتنیان واجیبە لەسەر کاربەدەستان، وە دروست نییە بۆ پێشەوا کەوا دوابکەوێت لە کوشتنیاندا، چونکە ئەوانە ئەگەر وازیان لێ بهێنرێت ئەوا فەساد لەسەر خۆیان و جگە لە خۆیان بڵاو دەکەنەوە، وە ئەگەر کوژران ئەوا خەڵکی لە خراپەیان سەلامەت دەبن، وە خەڵکیش سەرزەنشت دەکرێت و عیبرەت وەردەگرن لە سیحر دوور دەکەونەوە.

## ٢٥/ بەشی ڕوونکردنەوەی هەندێك لە جۆرەکانی جادوو

پاش ئەوەی باسی جادووی کرد، ئەمجار هەندێ لە جۆرەکانی ڕوون کردەوە، بۆ ئەوەی بزانیت سیحر چەند جۆرێکە تاوەکو لێی دوور بکەویتەوە .

### بەڵگەی یەکەم تا پێنجەم :

١. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (إِنَّ الْعِيَافَةَ وَالطَّرْقَ وَالطِّيَرَةَ مِنَ الْجِبْتِ) واتە: بە دڵنیاییەوە هەڵدانی باڵندە و لێدانی خەتی بەخت و شوومی جۆرێکن لە سیحر )) . (عوف) فەرموویەتی : (العيافة واتە : هەڵدانی باڵندەیە، وە (الطرق) واتە : لەسەر زەوی خەتیان دەکێشا (بە مەبەستی بەخت گرتنەوە) وە (الجبت) حەسەنی بەصری فەرموویەتی : دەنگ و ئاوازی شەیتانە، ( إسناده جيد، ولأبي داود والنسائي وابن حبان في (صحيحه) المسند منه ).

٢. لە (ابن عباس)ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:ـ (( من اقتبس شعبة من النجوم، فقد اقتبس شعبة من السحر، زاد ما زاد )) (رواه أبو داود بإسناد صحيح) واتە: هەرکەسێك بەشێك لە ئەستێرەناسی فێربێت و وەرگرێت ئەوا بەشێك لە سیحری وەرگرتووە و فێربووە، وە ئەگەر زیاتری وەرگرت ئەوا زیاتر سیحری وەرگرتووە ) .

٣. وە (النسائي) ڕیوایەتی کردووە لە فەرموودەی (أبو هريرة)وە : (مَنْ عَقَدَ عُقْدَةً ثُمَّ نَفَثَ فِيهَا فَقَدْ سَحَرَ، وَمَنْ سَحَرَ فَقَدْ أَشْرَكَ، وَمَنْ تَعَلَّقَ شَيْئاً وُكِلَ إِلَيْهِ) واتە : هەرکەسێك گرێیەك ببەستێت ئەمجار تفی پێدا بکات ئەوا سیحری کردووە، وە هەرکەسێك سیحر بکات ئەوا شیرکی کردووە، وە هەرکەسێك شتێك هەڵواسێت ئەوا کاروباری دەدرێتە دەستی ئەوەی هەڵیواسیوە) .

٤. لە (ابن مسعود)ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (أَلَا هل أُنَبِّئُكُمْ مَا الْعَضْهُ ؟ هِيَ النَّمِيمَةُ، الْقَالَةُ بَيْنَ النَّاسِ) (رواه مسلم) واتە : ئایە پێتان

بلێم (العضه) چییه ؟ بریتییه لە دووزمانی و قسه هێنان و بردن لە نێوان خەڵکیدا).

٥. وە لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتووه لە (ابن عمر)ەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (إن من البیان لسحراً) واتە: لە ڕەوانبێژی و فەصاحەتدا سیحر هەیە –بیستنەکان سیحراوی دەکات–).

- (الْعِیَافَةَ) : هەڵدانی باڵندە لەبەر ڕەشبینی یان گەشبینی، بەشێکە لە شوومی و ڕەشبینی (تطیر) بە کردار .
- (وَالطَّرْقَ) : لەسەر لم خەت دەکێشن بە مەبەستی سیحرو کەهانەت .
- (وَالطِّیَرَةَ) : بریتییه لە ڕەشبینی بە شتێکی زانراوەوە، ئیتر ئەگەر بینراو بێت یان بیستراو، کاتی بێت یان شوێنی .
- (رنَّة الشیطان) : واتە وەحی شەیتان، ئەمە لە وەحی و پڕکردنەوەی شەیتانەوەیە.
- (العضه) : بە مانای بڕین و جیاکردنەوە دێت، وە بۆیە لە باس و بابەتی سیحرەوە هێناویەتییەوە، بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کەوا جیاکردنەوە ئامانجی هەموو کەسێکی دوو زمان و ساحیرە، وە کەسی دوو زمان لە کەسی ساحیر زیاتر تێك دەدات و ئاشووب دەگێڕێت .




**(البيان) :** بریتییە لەو فەصاحەت و ڕەوانبێژییە تەواوە کە زاڵ دەبێت بەسەر عەقڵەکاندا و دەبێتە هۆی گۆڕینی بیرۆکەکان، ئەویش دابەش دەبێتە دوو بەشەوە :

١. **ویستراو :** مەبەست لێی سەلماندنی حەقە و پوچەڵکردنەوەی باتڵە (ناحەقییە).

٢. **نەویستراو :** مەبەست لێی ڕەدد کردنەوەی حەقە و سەلماندنی باتڵ و ناحەقییە.

- ئایە ڕەوانبێژی و فەصاحەت چی پەیوەندییەکی بە سیحرەوە هەیە ؟ چونکە ڕەوانبێژی ناڕەوا و سیحر هەردوو بەشدارن لە هەڵگەڕانەوەی ڕاستییەکاندا .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** هەڵدانی باڵندە و خەت کێشان لەسەر زەوی (بە مەبەستی بەخت گرتنەوە) و شوومی و رەشبینی، جۆرێکن لە جۆرەکانی سیحر.

**دووەم :** تەفسیری وشەی (الْعِيَافَةَ وَالطَّرْق) .

**سێیەم :** ئەستێرەناسی جۆرێکە لە جۆرەکانی سیحر (علم التاثير) .

**چوارەم :** گرێدان لە گەڵ تفکردندا جۆرێکە لەوانە .

**پێنجەم :** دوو زمانی لە نێوان خەڵکیدا جۆرێکە لەوانە (چونکە دووبەرەکی دروست دەکات وەکو سیحر) .

**شەشەم :** هەندێ لە فەصاحەت و رەوانبێژییەکان لەوانەیە . (چونکە کەسی رەوانبێژ رەنگە هەندێ جار ویستەکان دادەمرکێنێتەوە یان هەڵی دەگێرسێنێت ).

## ٢٦/ بەشی : ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی فاڵچی و کەهانەت و نمونەی ئەوانە .

ئەمە باشترین رێزبەندییە، لە پاش ئەوەی سیحر و هەندێ لە جۆرەکانی روون کردەوە ئەمجار ئەوەتا بۆت روون دەکاتەوە کەوا (کاهین و ئەستێرەناس و فاڵچی کێیە؟ وە حوکمی چوون بۆ لایان چییە؟ وە چۆنییەتی رۆیشتن بۆ لایان .

## بەڵگەی یەکەم تا چوارەم

١. ئیمامی موسلیم ریوایەتی کردووە لە هەندێ لە خێزانەکانی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من أتى عرَّافا فسأله عن شيء فصدَّقه،لم تقبلْ له صلاةٌ أربعين يوماً) واتە: هەر کەسێ بڕوات بۆ لای فاڵچییەك و پرسیاری لێ بکات و باوەڕی پێ بکات، ئەوا بۆ ماوەی چل شەو نوێژەکەی لێ وەرناگیرێت).

٢. وە لە (أبو هريرة)وە هاتووە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرموویەتی : ((من أتى كاهنا فصدَّقهُ بما يقول، فقد كفر بما أُنزل على مُحَّمَّد (ﷺ)) واتە: هەر کەسێ بڕوات بۆ لای کاهینێك (فاڵچییەك) و باوەڕی بە قسەکانی کرد، ئەوا کوفری کردووە بەو قورئانەی دابەزیوەتە سەر محمد(ﷺ)) .

٣. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (من أتى عرافا أو كاهنا فصدقه بما يقول فقد كفر بما أنزل على مُحَّمَّد(ﷺ)) (رواه الأربعة والحاكم وقال : صحيح على شرطهما) واتە: هەر کەسێ بڕوات بۆ لای فاڵچییەك یان کاهینێك و باوەڕی بە قسەکانی کرد، ئەوا کوفری کردووە بەو قورئانەی دابەزیوەتە سەر محمد(ﷺ).

٤. ولأبي يعلى بسند جيد عن ابن مسعود مثله موقوفا . واتە : وە (أبو يعلى) ریوایەتی کردووە بە سەنەدێکی (جيد) لە (ابن مسعود)ەوە بە (موقوف)ی واتە : قسەی (ابن مسعود) خۆیەتی.

(مَنْ أتى) : چوون بە دانیشتن دەبێت لە گەڵیاندا، یان بە پەیوەندی کردن پێیانەوە، یان بە ناردنی کەسێك بۆ لایان، یان بە نامەیەك، یان تەماشاکردنی کەناڵەکانیان، یان ڕۆیشتنە ناو ماڵپەڕەکانیانەوە، یان کڕینی گۆڤارەکانیان بە تایبەتی ئەوانەی بورجەکانی تیادایە، یان بیستنی ئەوەی دەیڵێن، ئەمەش خراپەکارییەکی گەورەی تیادایە .

(لم تقبلْ له صلاةٌ) : ئەو پاداشتەی کە لە ئەنجامی نوێژەکەیدا دەستی کەوت بەرانبەر بوویەوە لە گەڵ خراپەکەدا، بۆیە لە دەستی دا ( ڕۆیشتن بۆ لایان بە بێ ئەوەی باوەڕیان پێ بکات ).

(فقد كفر بما أُنزل على مُحَّمَّد(ﷺ)) واتە بە قورئان، کە ئەو ئایەتەی تێدایە : ﴿ قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ ﴾ جا ئەو کەسەی باوەڕ بە کاهین و فاڵچی دەکات لە زانینی غەیبدا، لە کاتێکدا دەزانێت کەوا هیچ کەسێك غەیب نازانێت تەنها خوا نەبێت، ئەوا کەسێکی بێباوەڕە (کافرە) کوفرێکی گەورەی

کردووە، وە ئەگەر کەسێکی نەزان بوو باوەڕی وا نەبوو کەوا قورئان درۆی تیادایـە، ئەوا کوفرەکەی کوفرێکی بچووکە، وە ڕەنگە باوەڕ پێکردنەکەی لەو کاتەدا نـەبێت، بەڵکو باوەڕ پێکردنەکەی لە پاش ئەوە دەبێت ئەگەر شتێك ڕوو بدات .

**(عرّافاً) :** ناوێکی گشتگیرە، بۆ کاهین و ئەستێرەناس و فالچی و لەو جۆرانە بە کـار دەهێنرێت، ئەوانەی بۆ زانینی غەیب چەند پێشەکییەك بە کـار دەهێـنن و دەیکەنـە بەڵگە، بۆیە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە بانگەشەی ئەو کارانە دەکەن .

## بەڵگەی پێنجەم :

لە (عمران بن حصين)ەوە ڕیوایەت کـراوە لـە پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) : ((ليس مِنَّا من تَطيَّرَ أو تُطُيِّرَ له، أو تَكهَّنَ أو تُكُهِّنَ له، أو سَحَرَ أو سُحِرَ له، ومن أتى كاهناً فصدَّقهُ بما يقول، فقد كفر بما أنزل على مُحَمَّد(ﷺ)) (رواه البزار بإسناد جيد) .

واتە: لە ئێمە نییە هەرکەسێ باڵندە هەڵدات یان باڵندەی بۆ هەڵدرێت (بە مەبەسـتی ئەنجامدان یان ئەنجام نەدانی کارێك) یان فاڵ بکات یان فالچی فاڵی بۆ بکـات، یـان جـادوو بکـات یـان جـادووی بـۆ بکرێـت، وە هـەر کەسـێ بـڕوات بـۆ لای کاهینێـك و بـاوەڕی بـە قسـەکانی کـرد ئـەوا کـوفری کـردووە بـەو قورئانـەی دابەزیوەتـە سـەر محمد(ﷺ).

## بەڵگەی شەشەم :

هەروەها (الطبراني) لـە (الأوسـط)دا ڕیوایـەتی کـردووە بـە سـەنەدێکی (حسـن) لـە فەرموودەی (ابن عباس)ەوە، بە بێ ئەو بەشەی کە دەفەرموێت : (ومن أتى ....) تا کۆتایی.

ئیمامی (البغوي) فەرموویەتی : (العرَّاف : ئەو کەسەیە کە بانگەشەی زانـینی چـەند کارێك دەکات بە چەند پێشەکییەك کـە دەیکاتـە بەڵگـە لـە سـەر شـتە دزراوەکـە و جێگای شتە بزرەکە و نمونەی ئەوانە) وە دەڵێن : ئەوە کاهینە، وە کـاهینیش ئـەو

کەسەیە کە هەواڵ دەدات لەسەر شتە غەیبییەکان لە داهاتوودا، وە دەڵێن : ئەو کەسەیە کە هەواڵ دەدات دەربارەی ئەوەی لە ناخەکاندا هەیە .

(أبو العباس ابن تيمية) دەڵێت : العرَّاف : ناوێکە بە کار دەهێنرێت بۆ کاهین و ئەستێرەناس و فاڵچی و نمونەی ئەوانە، لەو کەسانەی کە قسە دەکەن دەربارەی زانینی بابەتەکان بەم ڕێگایانە .

**(من تَطيَّرَ) :** هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە باڵندە هەڵدەدەن، باڵندە هەڵدەدەن بۆ خۆیان و بۆ جگە لە خۆیان .

**(أو تُطُيِّرَ له) :** واتە فەرمان دەدات باڵندەی بۆ هەڵبدرێت، یان رازی دەبێت بۆ بکرێت .

**(سُحِرَ له) :** چونکە هەندێ کەس بەو کەسانە دەڵێن کە شکایەت دەکەن لە مێردەکانیان: من سیحرت بۆ دەکەم و تۆ هیچ ناکەیت، گومانی وایە کە هیچی لەسەر نییە .

## بەڵگەی حەوتەم:

(إبن عباس) — دربارەی ئەو کەسانەی (أباجاد) دەنوسن و تەماشای ئەستێرەکان دەکەن – فەرموویەتی : **(ما أرى من فعل ذلك له عند الله من خلاق)** واتە : ئەو کەسەی ئەو کارە دەکات نابینم لای خوای گەورە هیچ پشکێکی هەبێت) .

(أباجاد : دانانی ژمارەیە بۆ هەر پیتێك وەك : أ = ١، ب = ٢، ج = ٣، د = ٤ .... هتد)

**فێربوونی ( أباجاد ) دابەش دەبێتە دوو بەشەوە :**

١. **دروستە :** دروستە فێری ببین بۆ ژماردنی رستەکان و نمونەی ئەوانە، وە بەردەوام زاناکان مێژووی پێ تۆمار دەکەن .

٢. **حەرام ( قەدەغەکراو ) :** وای لێ بکات پەیوەستی بکات بە ڕێڕەوی ئەستێرەکان و جوڵان و دەرکەوتن و ئاوابوونیان .

**حوكمی پرسیاركردن له فاڵچی و هاوشێوەی :**

**پرسیارێكی ئاسایی :** یەكێكە لە تاوانە گەورەكان، بەبەڵگەی ئەو فەرموودەی كە دەفەرموێت : (لم تقبل له صلاةٌ أربعين يوماً)

**پرسیار كردن و باوەڕ پێكردن :** كوفری گەورەیە، چونكە بە درۆ خستنەوەی قورئانە .

**پرسیاركردن بە مەبەستی تاقیكردنەوەی :** دروستە، بۆ ئەوەی ڕاست و درۆی بزانێت، نەك بۆ ئەوەی قسەكانی وەرگرێت، بە مەرجێك شایستەی ئەو شوێنە بێت .

**پرسیاركردن بە مەبەستی بێ دەسەڵاتی و بە درۆ خستنەوەی :** داواكراو و واجیبە، بە مەرجێك كەسی پرسیار كەر شایستەی ئەو جێگەیە بێت .

**لە نیشانەكان جادووباز ( ساحیر )**

١. جیاوازە لە گەڵ مەرجەكانی دروستی روقیەی شەرعیدا .
٢. گرێدان لە گەڵ تف پیاكردندا .
٣. نوسینی چەند پیتێكی بچڕبچڕ و قسەی نەزانراو .
٤. جیاكردنەوەو بەیەك گەیاندن (سۆزداری).
٥. تەماشاكردنی ئەستێرەكان (علم التاثير) .
٦. خوێندنەوەی ناودەست و فنجان .
٧. بۆ نمونە پرسیاری ناوی دایك دەكات .
٨. بانگەشەی زانینی غەیب دەكات .
٩. فەرمان بە نەخۆشەكە بكات بە سەرپێچی كردنی شەرع وەكو وازهێنان لە نوێژ یان وازهێنان لە وتنی (بسم الله) لە كاتی سەربڕیندا .
١٠. نەخۆشەكە پەیوەست بكاتە خۆیەوە نەك خوای گەورە .
١١. ئەو یەكێكە لە ئەولیای شەیتان .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** لە دڵێکدا باوەڕهێنان بە کاهین و ئیمان هێنان بە قورئان کۆ نابێتەوە (ئەمەش گەورەترین کوفرە)

**دووەم :** وتنی بە ڕاشکاوی کەوا ئەو کارە کوفرە .

**سێیەم :** باسی ئەو کەسەی کە کەهانەتی بۆ دەکرێت (واتە : ئەویش وەکو کەسی کاهینەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی بەرییە).

**چوارەم :** باسی ئەو کەسەی کە باڵندەی بۆ هەڵدەدرێت –(تطيُّر)ی بۆ دەکرێت– .

**پێنجەم :** باسی ئەو کەسەی جادووی بۆ دەکرێت (هەرکەسێ داوا بکات ئەو کارەی بۆ بکرێت ئەوا وەکو ئەوانە لە سزادا) .

**شەشەم :** باسی ئەو کەسەی فێری (أباجاد) دەبێت (ئەمەش وردەکاری تێدایە).

**حەوتەم :** باسی جیاوازی لە نێوان کاهین و فاڵچیدا .

## ٢٧/ بەشی : ئەو بەڵگانەی دەربارەی نوشرە (بەتاڵ کردنەوەی سیحر) هاتوون .

ئەمەش بەڵگەی ڕێك و پێکی ڕێزبەندییە، لە پاش ئەوەی باسی جادووی بۆ کردین ئەمجار دەیەوێت باسی چۆنییەتی چارەسەرەکەی بکات، گومانیشی تێدا نییە کە چارەسەرکردنی سیحر لەو کەسەی سیحری لێ کراوە بە ڕێگایەکی شەرعی و دروست ئەوا فەزڵێکی گەورەیە بۆ ئەو کەسانەی لە پێناوی خوای گەورەدا دەیکەن.

### بەڵگەی یەکەم :

لە (جابر)ەوە ڕیوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسیاری لێ کرا دەربارەی (النُشرة) فەرمووی : (هي من عمل الشيطان) واتە : ئەوە لە کار و کردەوەی شەیتانە) .

## بەڵگەی دووەم :

وە دەڵێت : پرسیار کرا لە ئیمامی ئەحمەد دەربارەی نوشرە، فەرمووی : **( ابن مسعود يكره هذه كلَّه)** واتە : ابن مسعود هەموو ئەو کارانەی پێ حەرام بووە) .

- **(النشرة) :** ئەوەی کە لەسەردەمی نەفامیدا زانراو بوو، وە هەر لە سەردەمی نەفامیدا بە کاریان دەهێنا .
- **(من عمل الشيطان) :** دانە پاڵ شەیتان نابوتترین و ناشرینترین وەصفە بۆ ئەوەی خەڵکی لێی هەڵبێت .
- **(يكره ذلك) :** کەراهەت لای ئەوانە پێشین مەبەست لێی حەرام بوونە .
- **(يكره هذه كلَّه) :** مەبەستی ئەو نوشرەیە کە لە کار و کرداری شەیتانە، کە ئەویش نوشرەیە بە سیحر .

## بەڵگەی سێیەم :

لە (بوخاری)دا هاتووە لە (قتادە)وە دەڵێت : بە (ابن المسیب)م گوت : **(رَجُلٌ بِهِ طِبٌّ أَوْ يُؤَخَّذُ عَنْ امْرَأَتِهِ أَيُحَلُّ عَنْهُ أَوْ يُنَشَّرُ ؟ قَالَ : لَا بَأْسَ بِهِ، إِنَّمَا يُرِيدُونَ بِهِ الْإِصْلَاحَ، فَأَمَّا مَا يَنْفَعُ النَّاسَ فَلَمْ يُنْهَ عَنْهُ)** واتە : پیاوێك سیحری لێکراوە یان بەستراوە بەرانبەر بە خێزانەکەی، ئایە دروستە سیحرەکەی بۆ بەتاڵ بکرێتەوە ؟ (ابن المسیب) فەرمووی : ئاساییە، چونکە ئەوان ئەو کارە دەکەن لەبەر چاکسازی، ئەوەی سوودی هەبێت نەهی لێ نەکراوە) .

- **(طِبٌّ) :** واتە : سیحر، گومانیشی تێدا نییە کە (طِبّ) چارەسەری نەخۆشییە، بەڵام بە سیحر دەگوترێت (طِبّ) لەبەر گەشبینی، هەروەکو چۆن بە کەسێك پێوەدرا بێت دەڵێن : (سلیم) وە بە شکاوێك دەڵێن : (جبیر) .
- **(يُؤَخَّذُ عَنْ امْرَأَتِهِ) :** واتە : دەبەسترێت و ناتوانێت لە گەڵ خێزانەکەیدا جووت بێت، لە کاتێکدا هیچی نییە، ئەوەش جۆرێکە لە سیحر .

## بەڵگەی چوارەم :

له (الحسن)ەوه ریوایەت کراوه کەوا فەرموویەتی : **(لا يحلُّ السحرَ إلا ساحرٌ)** واتـه : ( هیچ کەسێك سیحر بەتاڵ ناکاتەوه ئیللا ساحیر نەبێت) .

ابن القیم – رەحمەتی خوای لێ بێـت– فەرموویـەتی : **نوشـره :** بریتییـه لـه بـەتاڵ کردنەوەی سیحر له کەسی سیحر لێکراوه، ئەویش دوو جۆره :

**یەکێکیان :** بەتاڵ کردنەوەی به سیحرێکی وەکو خۆی، ئەوەش له کار و کـردەوەی شەیتانه، هەر ئەمەش مانای قسەکەی (الحسن) ە، جا ئـەو کەسـەی کـه نوشـرەکه دەکات و ئەوەشی بۆی دەکرێت، خۆیان له شـەیتان نزیـك دەکەنـەوه بـەوەی پێـی خۆشه، بۆیه کاریگەرییەکەی لەسەر کەسی سیحر لێکراو بەتاڵ دەکاتەوه .

**دووەم :** نوشره کردن به روقیەی شەرعی و خوێندنـەوەی (المعـوذات) و دوعاکـان و دەوا حەڵاڵ و دروستەکان، ئەوا ئەم کاره دروسته .

### چۆن وەڵامی ئەو کەسانه دەدەینەوه که دەڵێن : سیحر تەنها به سیحر بەتـاڵ دەبێتەوه ؟

١. ئـەوه جیـاوازه لـه گـەڵ قورئـان وسـوننەت و ئـەوەی هـاوەڵان و پێشـینی ئـەم ئوممەتەی لەسەر بووه .
٢. لاواز کردنی تێدایه به چارەسەر کردن به قورئان و ئەو دوعایانەی له سـوننەتی پێغەمبەرەوه(ﷺ) هاتوون .
٣. به هێز کردنی سیحر و ساحیرانی تێدایه و زاڵبوونیان لای عەوامی خەڵکی .
٤. لادانی تێدا به دی دەکرێت لەو دڵنیاییـەی کـه بریتییـه لـه چارەسـەر کـردن بـه قورئان و ئەو دوعایانەی هاتوون، بۆ گومان بردن بـەوەی کـه چارەسـەر کـردن تەنها به سیحر دەبێت.
٥. دەبێ ئەو کەسەی نوشرەکه دەکات و ئەوەشی بۆی دەکرێت خۆیان له شەیتان نزیك بکەنەوه بەوەی پێی خۆشه، بۆ ئەوەی سیحرەکه پووچەڵ ببێتەوه .

٦. ئەو کەسەی سیحری لێکراوە ئەگەر ئارام بگرێت ئەوا پاداشتی بەهەشتە، هەروەکو لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) هاتووە .

٧. بەتاڵ کردنەوەی سیحر بە سیحر دەبێتە هۆی ئەوەی کەسی سیحرلێکراو سیحرێك بە سەر سیحرەکەیدا زیاتر ببێت .

٨. پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیحری لێکرا، کەچی بە سیحر چارەسەری خۆی نەکرد بەڵکو بە روقیەی شەرعی .

**مەسەلەکان :**

**یەکەم :** نەهیکردن لە نوشرە .

**دووەم :** جیاوازی لە نێوان ئەوەی نەهی لێکراوە و ئەوەی رێگەی پێدراوە، کە هیچ ئیشکالێك ناهێڵێ.

(ئەمە لەسەر قسەی ئەوانەی دەڵێن : دروستە سیحر چارەسەر بکرێت بە روقیە و (معوذات) و دەوا و دوعا، وە قسەی ئەوانەی کە رێگرن لە چارەسەر کردنی سیحر بە سیحر، والله أعلم)

## ٢٨/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی شوومی و رەشبینی (التطیر) هاتوون.

شوومی و رەشبینی بە هۆی بیستنی یان بینینی شتەکانەوە (تطیُّر) لە گەڵ تەوحیددا ناکۆك و جیاوازە :

١. چونکە ئەو کەسەی شوومی و رەشبینی (تطیُّر) دەکات پشت بەستنی بە خوای گەورە بچڕاندووە، وە پشتی بە جگە لە خوا بەستووە .

٢. چونکە خۆی پەیوەست کردووە بە شتێکەوە کە بوون و حەقیقەتی نییە، بەڵکو ئەوە خەیاڵ و گومانێکە، وە تەوحیدیش بریتییە لە پەرستن و پەناگرتن .

٣. (التطیُّر) : لە شەرعدا بریتییە لە شوومی و رەشبینی کردن بە شتێکی بینراوەوە یان بیستراوەوە یان کاتێکی زانراو یان شوێنێکی زانراو .

٤. **بینراو** : وەکو ئەوەی باڵندەیەك دەبینیّ ڕەشبین دەبێت بەرانبەری چونکە ناشرینە یان ڕەشە .

٥. **بیستراو** : وەکو ئەوەی کەسێك دەیەوێت کاریّ بکات، لەو کاتەدا کەسێك بە کەسێك دەڵێت : ئەی خەسارەتمەند، ئەمیش ڕەشبین دەبێت بەو وشەیە .

٦. **زانراو** : وەکو شوومی و ڕەشبینی بە هەندیّ ڕۆژەوە یان مانگەوە یان ساڵەوە یان بە هەندیّ جێگاو شوێنەوە .

**بەڵگەی یەکەم و دووەم :**

١- خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾

٢- خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ ﴾

- (طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ): واتە ئەوەی تووشیان دەبێت لە قات و قڕی و گرانی تەنها لە خواوەیە، چونکە ئەو تەقدیری کردووە و هیچ پەیوەندی بە موسا و قەومەکەیەوە نییە، بەڵکو کارەکە وا دەخوازێت کەوا ئەوان هۆکاری خەیر و بەرەکەتن .
- (طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ) : واتە لە گەڵ ئێوەدایە، ئەوەی بەسەرتاندا دێت بە هۆی خۆتان و کردەوەکانتانەوەیە، تەنها خۆتان هۆکاری ئەوەن .

هیچ دژ بەیەکێك لە نێوان ئەو دوو ئایەتەدا نییە : بەڵگەیە **یەکەم :** بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا تەنها خوای گەورە تەقدیری شتەکان دەکات، وە **دووەم :** هۆکارەکەی ڕوون دەکاتەوە، کە ئەویش لە خۆیانەوەیە، جا لە ڕاستیدا شوومی و ڕەشبینیەکەیان لە گەڵ خۆیاندایەو پەیوەستە بە خۆیانەوە .

## بەڵگەی سێیەم و چوارەم :

٣/ لە (أبو هريرة)ەوە ریوایەت کراوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەوا فەرموویەتی : (لا عدوى، ولا طيرة، ولا هامة، ولا صفر) واتە :نە عەدوا کاریگەری هەیە (واتە : تەنینەوەی نەخۆشی) و نە شوومی و ڕەشبینی و نە بینینی بایەقوش و نە مانگی سەفەر شوومە).

٤/ لە هەردوو کتێبی (صحيح)دا هاتووە لە (ئەنەس) ەوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( لا عدوى ولا طيرة و يعجبني الفأل) قالوا : وما الفأل ؟ قال: (الكلمة الطيبة) .واتە : نە تەنینەوەی نەخۆشی هەیە و نە شوومی و ڕەشبینی و (فأل)م پێ خۆشە . وتیان : (فأل) چییە ؟ فەرمووی : وشەی باش و گەشبین .

- **(لا عدوى) :** دەیەوێ ئەو بیروباوەڕەی سەردەمی نەفامی پووچەڵ بکاتەوە کەوا نەخۆشی خودی خۆی کاریگەری هەیە، یان مانای ئەوەیە : هیچ تەنینەوەی نەخۆشییەك -(عدوى)یەك- خودی خۆی کاریگەری نییە، بەڵکو هۆکاری گواستنەوەی نەخۆشییە بە ئیزنی خوای گەورە .
- **(ولا هامة) :** (بایەقوش) باڵندەیەکە لە کوندە پەپوو دەچێت، یان هەر خۆی کوندە پەپووە ڕەشبینی پێوە دەکەن .
- **(ولا صفر) :** مەبەست لێی، یان :

١/ مانگیە سەفەرە، کە ئەو کات عەرەب ڕەشبینیان پێوە دەکرد، بە تایبەتی لە هاوسەرگیریدا .

٢/ یان نەخۆشی سك ئێشییە کە تووشی وشتر دەبێت، وە لە وشترێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ وشترێکی تر.

٣/ یان مەبەست لێی دواخستنە، حورمەتی مانگی (محرم)یان دوا دەخست بۆ مانگی (صفر)، تاوەکو لە مانگی (محرم)دا بجەنگن .

- **(لا نوء) :** جێگەو پێگەی مانگە، هەموو پێگەیەك ئەستێرەیەکی هەیە، جا ئەو کات عەرەب ڕەشبینیان پێوە دەکردو بە شوومیان دەزانی، دەیانگوت ئەو

ئەستێرەیە شوومە و هیچ خەیری پێوە نییە، بە پێچەوانەوە هەندێکیان دەیانگوت : ئەو ئەستێرەیە خەیر و چاکەی پێوەیە.

- **(ولا غول) :** (نە دێویش کاریگەری هەیە) ئەگەر عەرەب سەفەریان بکردایە ئەوا شەیتانەکان دەچوونە دڵیانەوە پڕ ترسیان دەکرد، بۆیە دەیانبینی بێ تاقەت دەبوون و دوودڵ دەبوون لە چوون بۆ ئەو جێگایەی دەیانەوێ بۆی بچن .

ئەوەی پیغەمبەری خوا (ﷺ) نەفی لێکردووە کاریگەرێکەیەتی، وە مەبەست لە نەفیکردنی نەفیکردنی بوونی نییە، وە کەسی موسڵمان دەچێت بۆ ئەو جێگەیەی کە دەیەوێت بە سنگێکی فراوانەوە و بە پشت بەستن بە خوای گەورە، وە گومانی خراپ بە خوای خۆت مەبە .

- هیچ دژ بەیەکێك لە نێوان ئەم دەقانە و ئەو فەرموودەیەدا نیە کە دەفەرموێت : **(إن كان الشؤمُ في شيءٍ.....)** واتە : ئەگەر شوومی و ڕەشبینی لە شتێکدا هەبوایە ئەوا ...) چونکە :

١. ئەم فەرموودەیە لە جۆری (متشابه)ـە وە ئەو دەقانەی کە دەربارەی زەمکردنی شوومی و ڕەشبینی هاتوون کەوا کارێکی شیرکە لە جۆری (محكم)ـەکانە .
٢. شوومی و ڕەشبینی (الطيرة) هەمووی زەمکراوە، ئەوەی بە دەستهێنانی قازانجەکان و دوور خستنەوەی زەرەرەکانی بە دەستە تەنها خوایە .
٣. دروستە کەسی موسڵمان لە قەدەری خوا هەڵبێت بۆ قەدەری خوا وەکو دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە، بە شووم و ڕەشبینی نازانێت .
٤. ڕەشبینی و شوومی لە فەرموودەکەدا ئەوەیە کە کەسەکە ڕەشبینی پێوە بکات، نەك ئەو کەسەی پشت بە خوا دەبەستێ و ڕەشبینی ناکات .
٥. هەرکەسێ لە شتێك بترسێت جگە لە خوا ئەوا ئەو شتە زاڵ دەبێت بە سەریدا، هەروەکو ئەوەی هەرکەسێ لە گەڵ خوای گەورەدا کەسێکی تری خۆش بوێت ئەوا بە ئەو کەسە سزا دەدرێت، وە هەرکەسێ لە گەڵ خوای گەورەدا تکا لە کەسێکی تر بکات ئەوا لە لایەن ئەوەوە شەرمەزار دەکرێت . ( ابن القيم باسی کردووە) .

## بەڵگەی پێنجەم :

لە (أبو داود) بە سەنەدێکی (صحیح) هاتووە لە (عقبە بن عامر)ەوە فەرمویەتی : باسی شوومی و رەشبینی کرا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ)، فەرمووی : (( أحسنها : الفأل، ولا تردُّ مسلما، فإذا رأى أحدكم ما يكره فليقل : ( اللهم لا يأتي بالحسنات إلا أنت، ولا يدفع السيئات إلا أنت، ولا حول ولا قوة إلا بك ) واتە : باشترینیان وشەی باش و گەشبینە، وە کەسی موسڵمان ناگێڕێتەوە، جا یەکێ لە ئێوە شتێکی بینی پێی ناخۆش بوو ئەوا با بڵێت : ( پەروەردگار .. لە لایەن هیچ کەسێکەوە چاکە بە دەست نایەت تەنها لای تۆوە نەبێت، وە هیچ کەسێك خراپە ناگێڕێتەوە تەنها تۆ نەبێت، وە هیچ هێز و توانایەك نییە تەنها بە تۆ نەبێت )).

### جیاوازی لە نێوان وشەی چاك (فأل) و شوومی و رەشبینی (تطیُّر)

| وشەی چاك ( فأل ) | شوومی و رەشبینی ( تطیُّر ) |
|---|---|
| هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە مرۆڤ چست و چالاك دەکات بۆ ئەنجامدانی شتێکی باش لە وتە و کردار، چ ببینراو بێت یان بیستراو. | شوومی و رەشبینی بە بینراوەوە یان بیستراوەوە یان کات و شوێنێکی زانراو. |
| پشت بەستن بە خوای گەورە زیاد دەکات | پشت بەستن بە خوای گەورە لاواز دەکات |
| کارێکی موستەحەببە | ١/شیرکی بچووکە ئەگەر وایزانی هۆکارە.<br>٢/شیرکی گەورەیە ئەگەر وایزانی خودی خۆی کاریگەری هەیە. |
| گومانی باشی بە خوای گەورەی تیادایە | گومانی خراپی بە خوای گەورەی تیادایە |
| ئەمە حاڵی کەسی یەکتاپەرستێکە و یەکتاپەرستی جێبەجێ کردبێت. | ئەمە حاڵی کەسی بێباوەڕو دووڕووە |
| بە بێ مەبەست و (تکلف) پەیدا دەبێت | رەنگە بە مەبەستەوە پەیدا بێت وەکو هەڵدانی باڵندە (العیافة) |

| | |
|---|---|
| وات لێناکات بگەڕێیتەوە یان بڕۆیت، وە پشت بەوە نابەستێت کە بینیویەتی یان بیستویەتی بەڵام دڵخۆش و چالاکی دەکات. | وات لێدەکات کە بڕۆیت یان بگەڕێیتەوە، بەوەی کە پشت دەبەستێت بەوەی بینیویەتی یان ئەوەی بیستویەتی و هۆکارە بۆ ئەنجامدانی کارەکەی. |
| وات لێدەکات پەیوەست بیت بە خواوە | وات لێدەکات پەیوەست بیت بەوەی ڕەشبینی پێوە کردووە |

- **نمونەی ( ١ ) :** کەسێك ویستی ژن بهێنێ کاتێ پرسیاری کرد ناوی کچەکە چییە : وتیان : (هناء)ە، بۆیە ڕۆیشت بۆ ئەو هاوسەرگیرییە، یەکێکیتر پرسیاری کرد وتیان ناوی (صخرة)یە ئەویش گەڕایەوە، ئەمە هەردوو لەبەشی شوومی و ڕەشبینییە (التطيُّر)ە، چونکە (التطير) : ئەوەیە کە بتخاتە سەر ڕێگاکەو بەردەوامت کات یان بتگێڕێتەوە .
- **نمونەی ( ٢ ) :** کەسێك پرسیاری ناوی کچێکی کرد لە پاش ئەوەی بەردەوام بوو، کاتێ زانی ناوی (سعاد)ە پێی دڵخۆش بوو، ئەمە لە باسی وشەی گەشبینییە (الفأل)ە، چونکە هۆکار نەبوو بۆ بەردەوامبوونی یان وازلێهێنانی، بەڵکو دڵخۆش بوو لە پاش ئەوەی بەردەوام بوو لە کارەکە.
- هەندێ کەس قورئانی پیرۆز دەکاتەوە بە مەبەستی گەشبینی، ئەگەر باسی ئاگری بینی ئەوا پێی ڕەشبین دەبێت، وە ئەگەر باسی بەهەشتی بینی دەڵێت : ئەمە وشەیەکی گەشبینییە (فأل)ێکی باشە، ئەمە هەروەکو کاری سەردەمی نەفامییە کە تیروپشکیان دەکرد (استقسام بالأزلام).
- استقسام بالأزلام چییە ؟ لە سەردەمی نەفامیدا سێ داریان دەهێنا لە سەر یەکێکی دەیاننوسی : (بیکە) و لە سەر یەکێکیان دەیاننوسی : (مەیکە) و لە سەر ئەویتر هیچیان نەدەنوسی، ئەگەر بیانویستایە کارێك بکەن ئەوا تیرو پشکیان بۆ دەکرد لە نێوان ئەو سێ دارەدا، جا ئەگەر ئەو دارە دەرچوایە کە نوسراوە (بیکە) کارەکەیان دەکرد و ئەگەر ئەوە دەرچوایە کە نوسراوە

(مەیکە) کارەکەیان نەدەکرد و ئەگەر ئەویتر دەرچوایە ئەوا تیروپشکەکەیان دووبارە دەکردەوە .

- **(عقبة بن عامر) :** هەڵەیە و ناوە تەواوەکە (عروة بن عامر)ە .
- **(ولا تردُّ مسلماً) :** وا تێدەگەین لەم دەستەواژە کەوا هەرکەسێ (الطيرة)کەی بیگێڕێتەوە لە ئەنجامدانی کارەکەی، ئەوە کەسێکی موسڵمان نییە .
- **(ولا قوّة إلا بك) :** پیتی (باء)ەکە لێرەدا یان :
- ١/ بە مانای (في) دێت . ٢/ یان بۆ پەناگرتنە (الاستعانة). ٣/ یان بۆ هۆکارە (السببية)

**بەشەکانی خەڵکی دەربارەی شوومی و ڕەشبینی (الطيرة):**

| لە کارەکەی نایگێڕێتەوە و بەردەوام دەبێتو پشت بە خوا دەبەستێت، ئەمە حاڵی کەسی یەکتاپەرستە، ئەمەش ئەصڵ و بنەمایە . | واز لە کارەکەی دەهێنێ و ولامی (الطيرة)کە دەداتەوە، شیرکی بچووکە ئەگەر وایزانی هۆکارە و شیرکی گەورەیە ئەگەر وایزانی خودی خۆی کاریگەری هەیە . | بەردەوام دەبێت بەڵام خەم و دڵەڕاوکە دایدەگرێت، ترسی هەیە لە کاریگەری ئەوەی (التطيُّر)ی پێوە کردووە، ئەمەش تاوانە . |
|---|---|---|

## بەڵگەی شەشەم تا هەشتەم :

٦/ لە ئیبن مەسعودەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( **الطيرة شرك، الطيرة شرك، وما منَّا إلا، ولكنَّ الله يذهبه بالتوكل** ) (رواه أبو داود والترمذي وصححه وجعل آخره من قول ابن مسعود) واتە : شوومی و ڕەشبینی شیرکە، شوومی و ڕەشبینی شیرکە، هەریەکێك لە ئێمە ئیللا.. – مەبەستی ئیللا تووشی دەبێت – بەڵام خوای گەورە بە پشت بەستن بە خۆی دووری دەکاتەوە).

٧/ لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە (ابن عمرو)ەوە – ڕەزای خوای لێ بێت–، لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) : ( **من ردته الطيرة عن حاجته فقد اشرك** ) **قالوا: فما كفارة ذلك ؟ قال : أن تقول : اللهم لا خير إلا خيرك، ولا طير إلا طيرك، ولا إله غيرك** ) واتە : هەرکەسێك (طيرة)ەکە بیگێڕێتەوە لە کارەکەی ئەوا شیرکی کردووە، فەرموویان : کەفارەتەکەی چییە ؟ فەرمووی : بڵێت : ئەی خودایە .. هیچ خەیرو چاکەیەك لە هیچ شتێکەوە نییە تەنها ئەوە نەبێت کە لە لای خۆتەوە دێت، و ڕەشبین نیم بەرانبەر شتێك تەنها ئەوە نەبێت خۆت بە خراپت داناوە، وە جگە لە تۆ هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت) .

٨/ هەر لە (أحمد)ەوە ڕیوایەت کراوە لە فەرموودەی (الفضل بن العباس)ەوە : **(إنما الطيرة ما أمضاك أو ردك)** واتە : بە ڕاستی شوومی و ڕەشبینی ئەوەیە کە دەبێتە هۆی بەردەوامیت یان گێڕانەوەت لە کارەکەت)) .

**(وما منَّا إلا)** : هیچ کەسێك نییە لە ئێمە ئیللا .. –ڕەشبینی دەکات–، ئەمەش لە بەشی وازهێنانە لەو وشانە کە وتنی جوان نییە، وە دوور کەوتنەوە لە وشەی شیرکی، وە جێ بەجێکردنی تەوحیدە لە وشەکانیشدا، هەرچەندە ئەوەی کوفر بگێڕێتەوە کافر نابێت .

**پەناگرتن (التوكل)** : بریتییە لە ڕاستی پشت بەستن بە خوای گەورە لە بەدەست هێنانی قازانجەکەکان و دوورکەوتنەوە لە زەرەرەکان لەگەڵ بوونی سیقە پێی و ئەنجامدانی ئەو هۆکارانەی خوای گەورە کردوویەتییە هۆکار .

## چارەسەری رەشبینی و شوومی (التطيُّر) چییە ؟

١- بە جێبەجێکردنی تەوحید، چونکە پەناگرتن بە خوا (التطيُّر) لادەبات و نایهێڵێ، وە سینگی فراوان دەبێت .

٢- وتنی ئەو دوعایەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) هاتووە کە دەفەرموێت : (( اللهم لا خير ......)).

٣- گەشبین دەبێت بە خەیر و چاکە و رەشبینی بە مێشکی خۆیدا ناهێنێ .

٤- ئەوەی بەرژەوەندی تێدایە، بێ ئومێد و شەکەت مەبە لە یەکەم هەوڵداندا، بەڵکو چەند جارێك دووبارەی بکەرەوە تاوەکو خوای گەورە بۆت ئاسان دەکات.

## جیاوازی لە نێوان ( تیروپشك ) و ( استقسام بالازلام )

| تیروپشك | استقسام بالازلام ( لە پێشدا مانەکەیمان روون کردەوە ) |
|---|---|
| حوکمی ئەم کارە دروستە | یەکێکە لە تاوانە گەورەکان، ئەویش بەشێکە لە قومار |
| مەبەستێکی شەرعی دەست دەکەوێت | مەبەستی شەرعی لێ بە دەست نایەت |
| بە کار دەهێنرێت بۆ دیاری کردنی ئەو کەسەی حەقی هەیە لە نێوان چەند کەسێکدا هەموویان هەمان حەقیان ناتوانین یەکێکیان دیاری بکەین . | بەکار دەهێنرێت بۆ جیاکرنەوەی چاکە لە خراپە وە لە بانگەشەی زانینی غەیب دەچێت بە پشت بەستن بە شانس و بەخت. |
| کاری یەکتاپەرستانە | کاری هاوبەشدارانە (موشریکەکانە) |
| بۆ نموونە : تیرووپشك کردن بۆ ریزی یەکەم و بانگدان | هەڵبژاردنی کارێك بە فرێدانی پارەی ئاسن یان ژماردنی (واتە: پارەیەکی ئاسن فرێ دەدات ئەگەر دیوی نوسینەکە دەرچوو کارەکەی دەکات و ئەگەر دیوی وێنەکە دەرچوو کارەکەی ناکات) . |
| دیاری کردنی خاوەن حەقێك لە شتێکدا کە ناکرێت دابەش بکرێت. | دیاریکردنی ئەوەی حەقی خۆی نییە و دابەشکردنیش دەکرێت . |

## مەسەلەکان:

**یەکـەم :** وریاکردنـەوە لـەو ئایەتـەی کـە دەفـەرموێت: ﴿ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾ لە گەڵ ئەو ئایەتەی : ﴿ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ ﴾ (هیچ دژ بە یەکی تێدا نییە).

**دووەم :** نەفیکردنی تەنینەوەی نەخۆشی (عـەدوا) ( واتـە کاریگـەربوونی بـە خـودی خۆی نەك ئەوەی هۆکار بێت بۆ کاریگەر بوون).

**سێیەم :** نەفیکردنی شوومی و رەشبینی (الطـيرة) (نـەفیکردنی کاریگـەربوونی نـەك نەفیکردنی بوونی)

**چوارەم :** نەفیکردنی کاریگەری بایەقوش، (الهامة) بریتییە لە باڵندەی بووم یـان لـە هاوشێوەی .

**پێنجەم :** نەفیکردنی (سەفەر) (کاتەکان هیچ کاریگەریان بە شتەکان و بە تەقدیری خوای گەورەوە نییە، جا سەفەریش وەکو ئەو کاتەکانی ترە چاکە و خراپـەی تێـدا تەقدیر کراوە، هەندێ کەس ئەگـەر لـە شـتێك ببێتـەوە و تـەواوی بکـات لـە مـانگی سەفەردا ئەو بەروارە دەنوسێت و دەڵێت : لە مانگی سەفەری پڕ خەیردا تەواو بوو، ئەمەش لە بەشی چارەسەر کردنی بیدعەیە بە بیدعە، وە لەبەشـی چارەسـەرکردنی نەفامی بە نەفامی، چونکە ئەو نە مانگی خەیرە و نە مانگی خراپە و شەڕە.

**شەشـــەم :** وشــەی چـاك و گەشــبین (فــأل) بەشــێك نییــە لــەوە بــەڵکو شــتێکی موستەحەببە .

**حەوتەم :** تەفسیری وشەی چاك و گەشبین (فأل) : هەموو ئـەو شـتانەیە کـە مـرۆڤ چست و چالاك دەکاتەوە لە ئەنجامدانی کاری چاکە .

هەشتەم : ئەوەی بەسەر دڵدا دێت هەرچەندە پێی ناخۆش بێت، بە پشت بەستن بە خوای گەورە نامێنێ .

**نۆیەم :** ئەگەر کەسێك ئەوەی لە خۆیدا بینی ئـەم زیکـرە دەڵێـت : (( اللهم لا خير إلا خيرك .....)) .

**دەیەم :** ڕوونکردنەوەی ئەوەی کەوا بە شووم زانینی شتەکان (الطيرة) شـیرکە ( بـە **کورتی :** ئەگەر باوەڕی وا بوو خودی خۆی کاریگەری هەیە ئـەوا شـیرکی گەورەیـە، وە ئەگەر باوەڕی وابوو کە هۆکارە ئەوە شیرکی بچووکە ).

**یازدەیەم :** تەفسیری شوومی و ڕەشـبینی (الطـيرة)ی نەویسـتراو ( ئـەوەی وات لـێ بکات بڕۆیت بۆ کارەکە یان بتگێڕێتەوە) .

## ٢٩/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی ئەستێرەناسی ( التنجيم ) هاتوون.

نەیفەرموو : (بەشێکە لە شیرك) چونکە بابەتەکە وردەکاری تێدایە : زانستی (تأثير) و زانستی (تسيير) هەیە، لە پێشدا باسکرا.

### بەڵگەی یەکەم تا سێیەم :

١- ئیمـامی بوخـاری لـە (صـحیح)ەکەیدا ڕیوایـەتی کـردووە و دەفـەرموێت : قـەتادە فەرموویـــەتی : (( خلـق الله هـذه النجـوم لـثلاث : زينـة للسـماء ورجومـاً للشـياطين وعلامات يهتدى بها، فمن تأوَّلَ فيها غير ذلك، أخطأ وأضاع نصيبه وتكلف ما لا علم به)) واتە : خوای گەورە ئەستێرەکانی بۆ سێ مەبەسـت دروسـت کـردووە : بـۆ ڕازاندنـەوەی ئاسـمانی دونیـا و ڕەجمکردنـی شـەیتانەکان و وەکـو نیشـانەیەك لاکان و ڕێگاکانی پـێ بدۆزرێتەوە، جا هەرکەسێك بانگەشەی جگە لەمانە بکات، ئەوا هەڵەی کردووە و پشـکی خـۆی بـزر کـردووە و تـەکلیفی زیـاتری لـە خـۆی کردووە لە شتێکدا کە هیچ زانیاری دەربارەی نییە-مەبەستی غەیبە-).

٢- قەتادە فێربـوونی جێگـە و پێگـەی مـانگی پـێ حـەرام بـووە، وە (ابـن عيينـة) ڕوخسەتی پێ نەداوە، (حَرب) لە هەردووکیانەوە گێڕاویەتییەوە.

٣- ئەحمەدو ئیسحاق بۆ فێربوونی جێگەو پێگەی مانگ ڕوخصەتیان داوە .

- هـــەموو ئـــەو زانایانـــەی پێشـــین کـــە فێربـــوونی ئەستێرەناســـی (جێگـــای ئەستێرەکانیان) بە حەرام زانیوە مەبەستیان زانستی (التأثير)ە.
- وە هـــەموو ئـــەو زانایانـــەی پێشـــین کـــە فێربـــوونی ئەستێرەناســـی (جێگـــای ئەستێرەکانیان) بە دروست زانیوە مەبەستیان زانستی (التسيير)ە.

## بەڵگەی چوارەم :

لە (أبو موسى)وە ریوایەت کراوە و فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :
( ثلاثة لا يدخلون الجنة : مدمن الخمر وقاطع الرحم ومصدق بالسحر ) (رواه أحمد وابن حبان في صحيحه) واتە : سێ کۆمەڵ ناچنە بەهەشتەوە : ئەوەی ئالوودەی عارەق خواردن بووە، ئەوەی پەیوەندی خزمایەتی بچراندووە و ئەوەی باوەڕ بە سیحر دەکات ).

**(لا يدخلون الجنة) :** ئەمە لەو فەرموودانەن کە هەڕەشەیان تێدایە کەوا بە ڕێی دەخەین هەروەکو چۆن هاتووە، وە دژیەك نین لە گەڵ ئەو فەرموودانەی تر کە موژدەیان تێدایە، ئەمەش ڕەوانبێژترە لە قەدەغەو یاساغکردن .

**(مُدمن الخمر) :** ئەوەی کە مەی دەخواتەوە بە زۆری و ئالوودەی بوون، وە (خمر) یش (مەی) هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە عەقڵ دادەپۆشێت لە ڕووی لەززەت و خۆشییەوە .

(وقاطع الرحم) : مەبەست لە (رحم) بریتییە لە خزمە نزیکەکان، وە چۆنییەتی گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی شەرع دیاری نەکردووە بەڵکو دەگەڕێینەوە بۆ عورف و عادەت، بە مەرجێ لە گەڵ شەرعدا جیاواز نەبێت .

**(ومُصدِّق بالسحر) :** ئەمە بەڵگەی بابەتەکەیە، ئەوەی تێدا ڕوون دەبێتەوە کەوا زانستی ئەستێرەناسی (التنجيم) بەشێکە لە سیحر .

### بەشێك لە باسی تاوانە گەورەکان :

**پێناسەی تاوانە گەورەکان (الكبيرة) :** شێخ الاسلام – ڕەحمەتی خوای لێبێت–
**پێناسەی کردووە و فەرموویەتی :** ( هەموو ئەو تاوانانەیە کە سزایەکی تایبەتی بۆ دیاری کراوە) وەکو لەعنەت لێکردن یان تووڕەبوون یان دەرکردن و دوورخستنەوە یان بەریبوون لەوەی ئەنجامی دەدات، یان ئەو یەکێکە لە بێباوەڕان یان موشریکەکان، یان یەکێك نییە لە ئیمانداران، یان بە نابوتترین ئاژاڵن شوبهێنراوە...

**حوکمی ئەو کەسەی ئە نجامی دەدات :** کەسێکی ئیمانداره لەبەر ئیمانەکەی و کەسێکی (فاسق)ە لە بەر ئەنجامدانی تاوانە گەورەکە، لە ژێر ویستی خوادایە، ئەگەر ویستی لێبێت سزای دەدات و ئەگەر ویستی لیّ بێت لێی خۆش دەبێت .

ئایە تاوانە گەورەکان ژمێردراون یان سنووردارن ؟ سنووردارە بە پێی پێناسەکەی پێشوو، وە ژمێردراو نییە .

ئایە تاوانە گەورەکان گەورەترن یان شیرکی بچووك ؟ سەرپێچییەکان بەم ریزبەندییە دەست پیّ دەکات : تاوانە بچووکەکان، ئەمجار تاوانە گەورەکان، ئەمجار شیرکی بچووك، ئەمجار شیرکی گەورە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ وە ابن مسعود فەرموویەتی : (لأن أحلف بالله كاذباً خيرٌ من أن أحلف بغيره صادقاً) واتە : ئەگەر سوێند بە خوا بخۆم لە کاتێکدا تێیدا درۆزن بم باشترە لەوەی سوێند بخۆم بە جگە لە خوا و تێیدا راستگۆ بم) وە سوێند خواردن بە خوا بە درۆوە یەکێکە لە تاوانە گەورەکان بەڵام سوێند خواردن بە جگە لە خوای گەورە هەرچەندە راستگۆ بێت تیایدا شیرکی بچووکە .

ئایە تاوانە گەورەکان بە کردەوەی چاکە پاك دەبێتەوە یان پێویستی بە تەوبە هەیە ؟ پێویستی بە تەوبەیە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێت : (النائحة إذا لم تتب قبل موتها ..... ) واتە : ئەو ژنەی دەلاوێتەوە لەسەر مردوو ئەگەر پێش مردنی تەوبە نەکات .......) وە فەرموودەی : (اذا...اجتُنبت الكبائر...) واتە : بە مەرجیّ لە تاوانە گەورەکان دوور کەوتبێتەوە) .

ئایە دروستە تەوبە بکات لە هەندێکی و تەوبە نەکات لە هەندێکی ؟ بەڵیّ تەوبە دروستە لە هەندێکی بکرێت و لە هەندێکی نەکرێت، لە گەڵ زەرورەتی وازهێنان لە هەموو سەرپێچییەکان .

ئەو کەسەی تاوانە گەورەکان ئەنجام دەدات ئێمە خۆشمان بوێت یان رقمان لێ ببێتەوە ؟بە ئەندازەی ئیمانەکەی خۆشمان دەوێت و بە ئەندازەی تاوانەکانی رقمان لێی دەبێتەوە، وە لە کاتی ئەنجامدانی تاوانە گەورەکەدا لە گەڵیدا دانانیشین .
ئایە تاوانە گەورەکان جیاوازن لە گەورەیی و گەورەتردا ؟ بەڵێ جیاوازیان هەیە، بە بەڵگەی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێت : (ألا أنبئكم بأكبر الكبائر....) واتە: ئایە هەواڵتان پێ بدەم دەربارەی گەورەترین تاوانە گەورەکان ....).
ئەو کەسەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدات ناوی دەنێین چی ؟ ئەو کەسێکی ئیماندارە لەبەر ئیمانەکەی و کەسێکی (فاسق)ـە لەبەر تاوانە گەورەکەی، ئەو کەسێکی ئیمانداری کەم ئیمانە، وەکو گرووی مورجیئە نالێین : ئیماندارێکە و ئیمانەکەی تەواوە، هەروەها وەکو خەواریج نالێین : کەسێکی کافرە .

**مەسەلەکان :**

**یەکەم :** حیکمەت لە دروستکردنی ئەستێرکان ( رازاندنەوەی ئاسمانەکان – رەجم پێکردنی شەیتانەکان – نیشانەن)
**دووەم :** وەڵامی ئەو کەسانەی باوەڕیان بە جگە لەوانە هەیە (علم التأثير).
**سێیەم :** باسکردنی ئەو جیاوازیانەی دەربارەی فێربوونی ئەستێرەناسی هاتوون .
**چوارەم :** باسی ئەو هەڕەشانەی هاتوون دەربارەی ئەو کەسانەی باوەڕیان بە سیحر هەیە هەرچەندە بزانێت کە شتێکی پووچەڵ و نارەوایە .

**٣٠ / بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی باوەڕبوون بەوەی کەوا ئەستێرەکان هۆکاری بارانن هاتوون .**

**١/ شیرکی گەورە :** داوا لە ئەستێرەکان بکات بەوەی باران ببارێنێت، یان باوەڕی وابێت کەوا ئەو کارەکان دەکات و پێویستییەکان جێ بە جێ دەکات .
**٢/ شیرکی بچوک :** باوەڕی وابێت کەوا ئەوانە هۆکارن، وە خوای گەورە خۆی بکەرو دروستکارە.

## بەڵگەی یەکەم و دووەم :

١/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾

٢/ لە (ابو مالك الاشعري) یەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (أربع في أمتي من أمر الجاهلية، لا يتركونهن: الفخر بالاحساب، و الطعن في الانساب، والاستسقاء بالنجوم، والنياحة) واتە : چوار –ئاکار– لە ئوممەتەکەمدا هەن لە کاروباری –سەردەمی– نەفامین وازی لێ ناهێنن : شانازی کردن بە رەچەڵەکەوەو تانەدان لە نەژادو داوای بارانکردن لە رێگەی ئەستێرەکانەوە– باوەڕبوون بەوەی کەوا ئەوان هۆکارن– و شیوەنکردن ) .

وە فەرموویەتی : ((النائحة إذا لم تتب قبل موتها تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطران ودرع من جرب )) واتە : ئەو ژنەی دەلاوێتەوە لەسەر مردوو ئەگەر پێش مردنی تەوبە نەکات لە رۆژی قیامەتدا کە زیندوو دەکرێتەوە، کراسێکی قەتران و گەڕی لەشی دادەپۆشێت وەك زرێپۆشی لە بەردا بێت )) .

(وَتَجۡعَلُونَ): بە درۆی دەخەنەوە کەوا ئەوە لە لایەن خوداوە بێت، ئەوەتا دەیدەنە پاڵ جگە لە ئەو لە پەیدابون و رودانیدا.

(أربع) : ئەمە بۆ (حەصر) نییە، چونکە شتی تریش هەن بەشدارن لە گەڵیدا، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ ئەوە دەڵێت لەبەر (حەصر) کردنی زانستەکانە و کۆ کردنەوە و دابەشکردنی و ژماردنی، چونکە ئەوە تێگەیشتنەکە نزیکتر دەکاتەوە و لەبەرکردنەکە جێگیر دەکات .

(الجاهلية) : سەردەمی پێش رەوانەکردنی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، مەبەستیش نابوتکردن و هەڵاتنە لێی، چونکە هەمووی نەفامی و نابووتە .

(لا يتركونهن) : ئەمە هەواڵدان و وریاکردنەوەیە، نەك دانپێدانان.

(الفخر بالاحساب) : واتە خۆی بە گەورەو مەزن دەزانێت بەوەی خاوەن شەرەف و پلە وپایەیە، لە راستیدا شانازی کردن بە تەقواوە دەبێت کە رێگرە لە خۆبەزل

زانین و فیززلی، وە هەر کاتێك نیعمەتەکانی خوای گەورە زۆرتر بوون بە سەریەوە ئەوا خۆبەکەم زانینی بەرانبەر حەق و خەڵکی زیاتر دەبێت .

**(و الطعن في الانساب) :** ئەصڵ و بنەمای کەسەکە عەیبدار دەکات، وەکو ئەوەی بڵێت : تۆ کوڕی دەباغچیت (پێستە خۆشکەر) .

**(والاستسقاء بالنجوم) :** ئەمە شاهید و بەڵگەی بابەتەکەیە، واتە باران بدرێتە پاڵ ئەستێرەکان .

**(والنياحة) :** بەرزکردنەوەی دەنگ بە مردنی کەسێك بە مەبەستی شیوەن کردن .

**(تقام) :** لە گۆڕەکەی راست دەبێتەوە، **(سربال) :** پۆشاکێکی شۆڕ و درێژ (قطران) : واتە : زفت یان مسی تواوە، (جرب) : گەڕبوون : نەخۆشییەکە توشی پێست ئەبێت، هەر شتێك لێی بدات ئازاری دەگاتێ، واتە : هەموو پێستەکەی توشی نەخۆشی گەڕی دەبێت وەکو ئەوەی قەڵغانێك بە جەستەیەوە بێت، وە ئەگەر قەتران و گەڕی بە یەکەوە بن ئەوا بەڵاکە زیاتر و زۆرتر دەبێت، وە حیکمەتیش لەوەدا ئەوەیە کە موصیبەتەکەی بە ئارام گرتن دانەپۆشی ئەوا بەمە داپۆشرا، چونکە سزا لە جۆر و جنسی کارەکەیە .

**رۆژی قیامەت بەم ناوەوە ناونراوە لەبەر هەستانی :**

| خەڵکی : ﴿ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ | شایەتەکان : ﴿ وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴾ | تەرازووەکان : ﴿ وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾ |
| --- | --- | --- |

## بەڵگەی سێیەم و چوارەم :

٣/ لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتووە لە (زید بن خالد)ەوە دەفەرموێت : ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی بەیانی لە(حدیبیة) بۆ کردین لە پاش بارانێك شەو باریبوو، جا کە لە لەنوێژەکەی بووەوە رووی لە خەڵکی کرد و فەرمووی: (هل تدرون ماذا قال ربكم ؟) قالوا : الله ورسوله (ﷺ) أعلم، قال : (قال : أَصْبَحَ من عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ، فَأَمَّا من قال : مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ، فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ، وَأَمَّا من قال: مطرنا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ) واتە : ئایە دەزانن پەروەردگارتان چی فەرموو ؟ فەرموویان : خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) زاناترن، فەرمووی : خوای گەورە فەرمووی : هەندێ لە بەندەکانم باوەڕدار بوون بە من و هەندێك بێباوەڕ، جا ئەو کەسەی وتی : بە فەزڵ و رەحمەتی خوای گەورە بارانمان بۆ باری ئەوا ئیماندارە بە من و بێ باوەڕە بە ئەستێرە، بەڵام هەرکەسێ وتی : بە هۆی فلان ئەستێرەوە بارانمان بۆ باری، ئەوا بێباوەڕە بە من و باوەڕدارە بە ئەستێرەکان).

٤/ لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتووە لە (ابن عباس) ەوە –ڕەزای خوای لێ بێت– دەڵێت: (هەندێکیان وتیان : ئەستێرەی فلان و فلان ڕاستی کرد، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند : ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ ﴾ تاکو ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت : ﴿ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾.

- (فَلَآ) : (لا) بۆ ئاگاداركردنەوەیە، واتە : وریابە، سوێند بێ بە جێگای ئەستێرەکان .
- سوودی سوێندخواردنی خوای گەورە : (هەرچەندە ئەو ڕاستگۆیە و پێویستی بە سوێندخواردن نییە) :

١. ئەمە شێوازێکی زمانی عەرەبییە، بۆ دووپاتکردنەوەی شتەکانە بە سوێندخواردن .

٢. کەسی ئیماندار یەقین و دڵنیایی زیاد دەکات، وە هیچ ڕێگرییەك نییە بۆ دووپاتکردنەوەی زیاتر کە دەبێتە هۆی زیادبوونی یەقین و دڵنیایی بەندە .
٣. خوای گەورە سوێند دەخوات بە شتی مەزن کە دەلالەت دەکات لەسەر کەمالی توانا و مەزنی و زانستی خوای گەورە .
٤. ورياكردنەوە بە حاڵی ئەوەی سوێندی لەسەر دەخوات، چونکە خوای گەورە سوێند بە شتی مەزن دەخوات .
٥. بایەخدان بەوەی سوێندی لەسەر خواردووە، وە ئەوەش شایەنی بایەخدان و سەلماندنە .

- ﴿ كَرِيمٌ ﴾ : مانای : ١/ قەشەنگ و باش و جوان، چونکە قورئان هیچ شتێك لەو چاکتر نییە، ٢/ بە زۆری دەبەخشێت، خەیر و خۆشی دەبەخشێت لە کاروباری دونیایی و دینی و جەستەیی و ئەوەی پەیوەندی بە دڵەوەیە .
- ﴿ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨ ﴾ : یا مەبەستی (اللوح المحفوظ)ـە یان ئەو دەفتر و نامانەی ها بە دەستی فریشتەکانەوە .
- ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ٧٩ ﴾ : فریشتەکان، ئەمەش ئاماژەی ئەوەی تێدایە کەوا هەرکەسێ دڵی پاك ببێتەوە لە سەرپێچی ئەوا زیاتر لە قورئان تێدەگات .
- ﴿ تَنزِيلٌ ﴾ : بەڵگەی ئەوەی تێدایە:

١. قورئان بۆ هەموو خەڵکی دابەزیوە و پەیامەکە گشتگیرە .
٢. لە پەروەردگاریانەوە دابەزێنراوە، جا ئەگەر وابێت ئەو داوەرە لە نێوانیاندا و دادوەرو حاکمە بە سەریانەوە .
٣. دابەزینی قورئانی پیرۆز لە کەمالی پەروەردگارێتی خوایە، کەوابوو قورئان ڕەحمەت و میهرەبانییە بۆ هەموو بەندەکان .
٤. قورئان کەلامی خوایە و دابەزێنراوە و دروستکراو نییە .

- ﴿ مُّدۡهِنُونَ ﴾ : دەترسن، نابێت بترسن، پێویستە ئەو کەسەی قورئانی پێیە ئاشکرای بکات و بانگەوازی بۆ بکات .
- ﴿ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ۝٨٢ ﴾ : لە جیاتی ئەوەی شوکرانە بژێری بن کەچی بە درۆی دەخنەوە، ئەمەش کارێکی نەفامییە .

**مەسەلەکان :**

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (الواقعة) : ﴿ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ۝٨٢ ﴾.

**دووەم :** باسی ئەو چوار شتەی کە لە ئاکار و رەوشتی سەردەمی نەفامییە : (شانازی کردن بە رەچەڵەکەوە، تانەدان لە بنەما و رەچەڵەکەی یەکتر، چاوەڕوان و داوای باران لە رێگای ئەستێرەکانەوە، شیوەن کردن )

**سێیەم :** باسی کوفر لە هەندێکی ادا ( داوای باران لە ئەستێرەکان و تانەدان و شیوەن کردن) .

**چوارەم :** هەندێ کوفر هەن خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرناکات (وەکو داواکردنی باران بە هۆی ئەستێرەوە، ئەوا هەندێکی کوفرە و خاوەنەکەی لە ئیسلام دەردەکات و هەندێکی کوفر نییە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرناکات).

**پێنجەم :** مەبەست لەو فەرموودەیە : (أصبح من عبادي مؤمن بي وكافر) بە هۆی دابەزینی نیعمەتەکانەوە (ئەوەی پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەگەر نیعمەتێك لە نیعمەتەکانی دەستکەوت ئەوا نەیگێڕێتەوە بۆ هۆکارەکەی و لە خوای گەورە دایماڵێ (دووری بکاتەوە).

**شەشەم :** تێگەیشتن و ئاگاداربوون لە ئیمان لەم جێگەدا ( بەوەی دەدرێتە پاڵ فەزڵ و رەحمەتی خوای گەورەوە) .

**حەوتەم :** تێگەیشتن و ئاگاداربوون لە کوفر لەم جێگەدا ( بەوەی دەدرێتە پاڵ ئەستێرەکان) .

**هەشتەم :** تێگەیشتن و ئاگاداربوون لە ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت **:** (لقد صدق نوء كذا وكذا) (واتە : بە جێبەجێکردن و بەڵێنەکەی ) .

**نۆیەم :** باسکردنی مەسەلەکان لە لایەن زاناوە بۆ قوتابی لە ڕێگای پرسیارەوە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە : (أتدرون ماذا قال ربكم؟) (ئەمەش وا دەکات بەرانبەر بیرو هۆشی لای بێت، ئەمەش بەڵگەی جوان پەروەردەکردنی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)

**دەیەم :** هەڕەشەدان لەو ئافرەتەی شیوەن دەکات، (کراسێکی قەتران و گەڕی لەشی دادەپۆشێت وەك زرێپۆشی لە بەردا بێت) .

## تاقیکردنەوەی بەشی شەشەم ( حەوت بەش )

**پ١/ جیاوازی چییە لە نێوان ئەمانە خوارەوە :**

| وشەی چاك (فأل) | شوومی و رەشبینی (تطيُّر) |
|---|---|
| ١/ ................................... | ١/ ................................... |
| ٢/ ................................... | ٢/ ................................... |
| ٣/ ................................... | ٣/ ................................... |

تیرویشك          الاستقسام بالازلام ( لە پێشدا مانەکەیمان روون کردەوە)

١. ................................   ................................

٢. ................................   ................................

٣. ................................   ................................

**پ٢/ نیشانەی ( × ) لە جێگایە شیاودا دابنێ، یان دەستەواژەکە تەواو بکە :**

١/ لە نیشانەکانی جادووباز :

١/.............. ٢/.............. ٣/.................. ٤/.............. ٥/..............

٢/ تەفسیر کردنی تاغوت بە شەیتان لە لایەن عومەرەوە تەفسیرکردنە بە نمونە :

**راستە          هەڵەیە**

٣/ (ٱشۡتَرَىٰهُ ) واتە : ........................ ( مِنۡ خَلَٰقٖ) واتە : ...................

٤/ **(اجتنبوا)** لە وشەی (اتركوا) رەوانبێژترە، چونکە وشەی (الاجتناب) مانای وازهێنانە لەگەڵ دوورکەوتنەوە :   **راستە          هەڵەیە**

٥/ **(السبع الموبقات)** ژمارە لێرەدا :   حەصر لەخۆ دەگرێت     حەصر لە خۆ ناگرێت

٦/ ئایە ژمارەکە لە دەقەکاندا مەبەستدارە یان نا ؟ ..............................

٧/ بۆ باسی دەکات و کەچی مەبەستدار نییە ؟ ................................

٨/ئەو نەفسەی خوای گەورە کوشتنی حەرام کردووە : (سێ جۆرە       چوار جۆرە)

ئەوەی حەرام کراوە :    (خواردنی سووە (ریبا)        تایبەت نییە بە خواردنی).

٩/ هەتیو ئەو کەسەیە : ( باوکی دایکی ) مردووە، کوڕ بێت یان کچ، (لە پێش لە پاش ) بالغبوونی .

١٠ / مەبەست لە خۆپارێزەکان (المحصنات) :

ئازادەکانە ئەوانەی خۆیان لە زینا پاراستووە

١١/ پێویستە لەسەر کاربەدەستان جادووبازەکان بکوژن : بە بێ ئەوەی داوایان تەوبەیان لێ بکەن لەپاش ئەوەی داوای تەوبەکردنیان لێ دەکەن

١٢/ (الجبت) بریتییە لە :

جادوو هەموو ئەوانەی خەیری تێدا نییە وەکو جادوو و جگە لە جادوو

١٣/ تاغوت : شەیتانە ئەوەی بەندە لە سنووری خۆی پێی دەردەچێت لە هەموو پەرستراوێك و شوێنکەوتەکراوێك و گوێڕایەڵکراوێك .

١٤/ هەڵدانی باڵندە (العیافة) بەشێکە لە جۆرەکانی شوومی و ڕەشبینی (التطیُّر) :

**راستە هەڵەیە**

١٥/ هەرکەسێك بەشێك لە ئەستێرەناسی فێربێت ئەوا بەشێك لە جادوو فێربووە :

**راستە هەڵەیە**

١٦/ حاڵەتەکانی فەلەك پەیوەندیان بە ڕوداوەکانی سەر زەوییەوە : هەیە نییە

١٧/ بەشەکانی ئەستێرەناسی : ١/ ................. وەحوکمەکەی : ..................

٢/ .................وەحوکمەکەی : ..................

١٨/ مەبەست لە هێنانەوەی باسی دوو زمانی (نەمیمە) لە گەڵ جادوودا :

هەڵەی چاپە چونکە هەردووکیان جیادەکەنەوە

١٩/ (إنَّ من البيان لسحراً) : بۆ مەدحکردنە بۆ زەمکردنە

بۆ ڕوونکردنەوەی واقیعە و ئەمجار تەماشای شوێنەوارییەکەی دەکرێت .

٢٠/ کەسی فاڵچی (عەرراف) : کاهینە ناوێکی گشتییە

٢١/ باسی کاهینەکانی کردووە بە مەبەستی ڕوونکردنەوە :

ئەوان کێن چۆنییەتی چوون بۆ لایان حوکمەکەی هەموو ئەوانەی باسکرا

٢٢/ فێربوونی (اباجاد) دابەش دەبێت بۆ :

دوو بەش          یەك بەشە بە بەڵگەی فەرموودەکەی (ابن عباس)

٢٣/ هەرکەسێ باوەڕی بە کاهین کرد و دانی نا بەوەدا کەوا هیچ کەسێك غەیب نازانێت تەنها خوا نەبێت ئەوا کوفری کردووە بە کوفرێکی :     گەورە     بچووك

٢٤/ ئافرەتێك بە ئافرەتێکی تر دەڵێت :

جادوو بۆ پیاوەکەت بکە و تۆیش هیچت لەسەر نییە :

هەردوکیان هاوبەشن لە جادووەکەدا          دووەم هیچی لەسەر نییە

٢٥/ پیاوێك تووشی (طِبّ) بووە، واتە :

سیحر لە رووی گەشبینیەوە ئەو ناوەیان ناوە          چارەسەری نەخۆشی

٢٦/ دەقەکان و قسەی زانا پێشینەکان دەلالەت دەکەن بۆ ئەوەی کەوا سیحر بە سیحر :

هەڵدەوشێتەوە          هەڵناوەشێتەوە

٢٧/ سیحر هەڵدەوشێتەوە بە :          کەڵەشاخ     خوێندنەوەی (آیة الكرسي)

دوعاکردن وەکو: (رب الناس اذهب البأس ... )          هەموو ئەوانەی باسکرا

٢٨/ هەڵوەشانەوەی سیحر (نوشره) دەکرێتە دوو بەشەوە :

١/ .................................. ٢/.............................................

٢٩/ شوومی و رەشبینی (تطيُّر)ی ئالو فیرعەون پووچەڵ بوویەوە بە بەڵگەی ئەم ئایەتە:

﴿ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ ﴾          ﴿ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ ﴾

٣٠/ شوومی و رەشبینی (تطيُّر) لە گەڵ تەوحیددا جیاوازە چونکە ئەو کەسەی دەیکات : پشت بەستنی بە خوای گەورە بچراندووە و پشتی بە جگە لە ئەو بەستووە

خۆی پەیوەست کردووە بە شتێکەوە کە حەقیقەتی نییە          هەموو ئەنانەی باسکرا

٣١/ ﴿ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ ﴾ ئەمە قسەی :     گوندنشینەکانە          پێغەمبەرانە

٣٢/ ﴿ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ واتە : ...................................

﴿ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ ﴾ واتە : ...........................................

٣٣/ گواستنەوەی نەخۆشی بە ئیزنی خوا لە :

نەخۆشی هەستپێکراوەکاندایە        مەعنەوی و رەوشتیەکاندایە        هەمووی

٣٤/ (لا عدوى و طيرة ولا هامة ولا صفر) ئەم فەرموودەیە نەفیکردنی چی تێدایە ؟:

بوونی        کاریگەری

٣٥/ (لا عدوى) واتە : ....................، ئایە ئەم فەرموودەیە جیاوازە لە گەڵ فەرموودەی (فِر من المجذوم) ؟ ..................................................

٣٦/ چۆن کۆ دەکەیتەوە لە نێوان فەرموودەی (لا طيرة) و فەرموودەی (لا شؤم إلا في ثلاث) ؟ ..................................................

٣٧/ (لا هامة) واتە : .................... (لا صفر) واتە: ...........................

٣٨/(وما منَّا إلا) واتە: ...................... ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ..................

٣٩/ (لا نوء) واتە : .................... (لا غول) واتە: ...........................

٤٠/ وتنی (صفر الخير) واتە سەفەری پڕ خەیر :

دروستە    گەشبینی    لە باس و بابەتی چارەسەر کردنی بیدعەیە بە بیدعە

٤١/ مەبەست لە (زجر الطير) ئازاردانییەتی :        **راستە**        **هەڵەیە**

٤٢/ عەرەب بۆ خۆیان چەند زانیارییەکی خەیاڵاویان ئامادە کردبوو وەکو (طيرة و زجر و عيافة و رقية)، وە چەندین درۆیان رێك خستبوو، وە لە نێو خەڵکدا بڵاویان کردبووەوە، لەوەی کە گوایە دێو لە سەفەرەکەیاندا رێی پێ گردوون، وە دەرچوونی باڵندەیەك لە خوێنی کەسی کوژراو کە پێی دەڵێن (الهامة) وە گفتوگۆ کردنیان لە گەڵ جنۆکەدا و جگە لەوانە :        **راستە**        **هەڵەیە**

٤٣/ وتنی (خەیرە إن شاء الله ) لە کاتێکدا گوێت لە دەنگی گوێدرێژ یان سەگ دەبێت:

دروستە        دروست نییە

٤٤/ وتنی (ئەم ئەستێرەیە ئەستێرەی بەختەوەریە)        دروستە        دروست نییە

٤٥/ (فأل) بریتییە لە : تەنها وتنی وشەیەکی باشە    هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە مرۆڤ چالاك دەکاتەوە بۆ کاری چاك لە وتن و کرداری بینراو یان بیستراو .

٤٦/ ئەگەر کەسێك شوومی و رەشبینی (تطیُّر)ی کرد و بەردەوام بوو لە کارەکەی بەڵام بە دڵەڕاوکێ و خەمەوە و لە کاریگەری ئەوەی رەشبینی (تطیُّر)ی پێکردووە دەترسێت، ئەم کارە (دروستە شیرکی بچووکە تاوانە) وە ئەگەر رەشبینی (تطیُّر)ی کرد و وازی لە کارەکەی هێنا و دەستی لێ هەڵگرت (شیرکی بچووکە شیرکی گەورەیە) .

٤٧/ شوومی و رشبینی (طـیرة) ی نەویستراوە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە (طیرة) هەیە ویستراوە . **راستە هەڵەیە**

٤٨/ رق لێبوون لە هەندێ ژمارە و جێگا و رێگا :

دروستە لە باسی شوومی و رەشبینییە(تطیُّر)ە

٤٩/ ویستی ژن بهێنێ، بۆیە رۆیشت گوڵێکی هێنا گڵایەکی لێکردەوە وتی ژن دەهێنم و گەڵایەکی تری کردەوە وتی ژن ناهێنم ئەم کارە لە باس و بابەتی :

گەشبینییە شوومی و رەشبینییە (تطیُّر)ە

٥٠/ دوودڵ بوو بۆ سەفەرەکەی، قورئانەکەی کردەوە ئایەتی رەحمەتی بەرچاو کەوت بۆیە بەردەوام بوو و رۆیشت .

گەشبینییە شوومی و رەشبینییە (تطیُّر)ە

٥١/ خۆی یەکلا کردبووەوە بۆ سەفەرکەی و لەرێگادا بیستی کەسێك بەویتر دەڵێت : (موفق) ئەمیش زیاتر چست وچالاك بوو، ئەمە لە باس و بابەتی : گەشبینییە شوومی و رەشبینییە (تطیُّر)ە

٥٢/ شوومی و رەشبینی (تطیُّر) هات بە دڵیدا و کەچی ئەو (تطیُّر)ە نەیگێرایەوە و دوودڵی نەکرد : تاوانبارە هیچی لەسەر نییە

٥٣/ شوومی و رەشبینی (طیرة) ی لە ناخی خۆیدا بە دی کرد، بەڵام لەسەر کارەکەی خۆی بەردەوام بوو و گوێی پێ نەدا : شیرکی ئەنجام داوە شیرکی ئەنجام نەداوە

٥٤/ خوای گەورە هەندێ نەخۆشی کردووەتە هۆکاری تەنینەوە و گواستنەوەی :

**راستە هەڵەیە**

٥٥/ هەرکەسێ لە شتێك بترسێت جگە لە خوا ئەوا زاڵ دەبێت بە سەریدا، ئەمە سزای ئەو کەسەیە شوومی و رەشبینی (تطيُّر) دەکات .    **راستە**        **هەڵەیە**

٥٦/ وتنی ( خوای گەورە لە خراپەی پێکەنین بمانپارێزێ) لە پاش پێکەنینێکی زۆر :

دروستە        دروست نییە

٥٧/ ئیستیخارەی کرد و خەوت، لە خەوەکەیدا شتێکی بینی و رایچەڵەکان، بۆیە ئەوەی ئیستیخارەی بۆ کردبوو وازی لێهێنا .

شوومی و رەشبینی (تطيُّر)ە            ئەنجامی ئیستیخارەکەیە

٥٨/ لە نێوان ئەنجامدانی دوو کاردا دوودڵە :

دەپاڕێتەوە        راوێژ دەکات        ئیستیخارە دەکات        تیروپشك دەکات لە نێوانیاندا

یەکەم و دووەم وە ئەگەر نیەتی بوو یەکێکیان بکات ئەمجار ئیستیخارە دەکات

هەموو ئەوانەی باسکرا

٥٩/ ئیستیخارەی کرد و سەفەری کرد، ئەمجار کراسەکەی لە رێگادا دڕا، بۆیە وازی هێنا لەسەفەرەکەی : شوومی و رەشبینی (تطيُّر)ە   ئەنجامی ئیستیخارەکەیە.

٦٠/ ئیستیخارەکردن لەپاش ئەوە دێ کە دەیەوێت کارێك بکات بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە ( في هذا الأمر)        **راستە**   **هەڵەیە**

٦١/ لەو کارەی ئیستیخارەی بۆی کردبوو گەڕایەوە تەنها بە هۆی هۆکارێکی هەستپێکراوەوە یان شەرعییەوە :        **راستە**   **هەڵەیە**

٦٢/ باوەڕی وایە کە ئەستێرە هۆکاری بارانە و خوای گەورە بکەرە :

راستە      شیرکی بچووکە

٦٣/ باوەڕبوون بە ئەستێرەکانی سەردەمی نەفامی نەماوە، ئێستا دابەزینی پاڵەپەستۆ پەیدا بووە:        **راستە**        **هەڵەیە**

٦٤/ بە خۆرەکە دەڵێت : (ددانی من ببە و ددانی بووکەکەم بدەرێ) :

دروستە        شیرکە

٦٥/ دەکرێت لە نێوان جیاوازی زانایاندا کۆ بکەینەوە دەربارەی فێربوونی جێگاکانی مانگ، هەروەکو لە باسی نوشرەدا کۆمان کردەوە : **راستە** **هەڵەیە**

٦٦/ ئەو نیشانانەی کە رێنوییان پێ دەکرێت :

زەمینییە ئاسوییە هەموو ئەوانەی باسکرا

٦٧/ (الرَّحِم) بریتین لە : خزمە نزیکەکان خزمی هاوسەرەکان

٦٨/ جادوو (سیحر) کاریگەری لەسەر دڵی کەسەکان دەبێت بە شێوەیەك دار دەکاتە ئاڵتون : **راستە** **هەڵەیە**

٦٩/ ئەو فەرموودانەی کە هەرەشە ئامێز لە خۆ دەگرێت هەروەکو خۆیان بەرێیان دەخەین هەروەکو چۆن هاتوون، وە بە دەقەکانی تر کە بە رواڵەت دژ بە یەکن بەرانبەر بە یەکیان ناکەینەوە ( مەبەستمان فەرموودەکانی بەڵێن و موژدە) ئەمەش کاریگەر ترە بۆ قەدەغەکراوەکە : **راستە** **هەڵەیە**

٧٠/ رەنگە هەندێ جار لە دەقەکاندا باسی ژمارە بکرێت لە باسی حەصری زانستەکان و کۆ کردنەوە و دابەشکردن و ژماردنی، چونکە تێگەیشتنەکە نزیکتر دەکاتەوە و زیاتر جێگیر دەبێت لای کەسەکە : **راستە** **هەڵەیە**

٧١/ مەبەست لە دانە پاڵی هەر کارێك بۆ سەردەمی نەفامی :

دوورکەوتنەوەیە لێی ئەوە کارێکی نەفامی و گێلییە هەموو ئەوانەی باسکرا

٧٢/ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵ دەدات دەربارەی هەندێ شت روودەدات، مەبەستی ئەوە نییە کە کارێکی دروستە، وەکو ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت : (لا يتركونهنَّ...) **راستە** **هەڵەیە**

٧٣/ تاوانە گەورەکان بە کردەوەی چاك پاك نابێتەوە بۆیە پێویستە تەوبەی لێ بکرێت : **راستە** **هەڵەیە**

٧٤/ قورئانی پیرۆز مانای ئەوەیە کە :

بەخشندەیە قەشەنگ و جوان و باشە هەموو ئەوانەی باسکرا

٧٥/ مەبەست لە پاکەکان (المُطهَّرون) :

فریشتەکانە      هیچ کەسێك دەست لە قورئان نادات ئیللا کەسی پاك نەبێت .

**پرسیاری سێیەم :** بۆشاییەکانی خوارەوە بەم وشانە پڕ بکەرەوە :

(کەسی موعاهید , کەسی زیممی , الجبت , کەسی (المستأمن) , الطیرة , تاوانە گەورەکان , روونکردنەوە (البیان) , الطرق , العراف , العیافة , العضه)

١. ....................لە نێوان ئێمە و ئەودا پەیمانێك هەیە لەبەر بازرگانی یان بۆ ئەوەی فێری ئیسلام بێت.

٢. ....................لم بە کار دەهێنن بە مەبەستی سیحر و کەهانەت.

٣. ....................لە نێوان ئێمە و ئەواندا پەیمان هەیە نە جەنگمان لە گەڵدا بکەن و نە جەنگیان لە گەڵدا بکەین.

٤. ....................لە نێوان ئێمە و ئەودا زیمەتێك هەیە لە گەڵ پێدانی سەرانە.

٥. ....................بڕین و جیاکردنەوە.

٦. ............ فەصاحەتێکی تەواوە کە زاڵ دەبێت بەسەر عەقڵەکاندا و بیرۆکەکان دەگۆڕێت.

٧. ..............ناوێکی گشتگیرە بۆ کاهین و ئەستێرەناس و فاڵچی و نمونەی ئەوانە.

٨. ............ هەموو ئەو تاوانانە دەگرێتەوە کە سزایەکی تایبەتی لەسەرە.

٩. ............ هەڵدانی باڵندە بۆ رەشبینی یان گەشبینی لە گەڵ (تطیُّر) بە کردار.

١٠. ............ رەشبینی بە شتێکی بینراو بێت یان بیستراو , شوێنی بێت یان کاتی

١١. ............ هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە هیچ خەیری تێدا نییە وەکو سیحرو جگە لەوانە

## حەوتەم : کردارەکانی دڵ ( نۆ بەشە )

٣١/ بەشی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت : ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە.



### بەشەکانی خۆشەویستی ( المحبة )

**خۆشویستن لە گەڵ خوادا :** ئەمەش شیرکی گەورەیە .

**خۆشویستن لەبەر خوا :** ئەمەش واجیبە، بەڵکو لە تۆکمەترین

- ئەو کردارانەی کە خوای گەورە پێی رازییە، ئەویش بریتیە لە هەموو ئەوەی شەرع هێناویەتی وەکو تەوحید .
- ئەو بکەرانەی کاری پێ دەکەن، وەکو پێغەمبەران و نێردراوان و فریشتەکان و هاوەڵان و هەموو یەکتاپەرستێك .
- ئەو کاتانەی کە خوای گەورە خۆشی دەوێت، بۆ نمونە شەوی قەدر و کۆتا سێ یەکی هەموو شەوێك .
- ئەو شوێنانەی کە خوای گەورە خۆشی دەوێت، وەکو شاری مەککە و شاری مەدینە.

**خۆشویستنێکی سروشتی :** ئەمەش دروستە وەکو خۆشویستنی منداڵ .

## بەڵگەی دووەم و سێیەم :

٢/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿قُلۡ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ وَإِخۡوَٰنُكُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ وَعَشِيرَتُكُمۡ وَأَمۡوَٰلٌ ٱقۡتَرَفۡتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٞ تَخۡشَوۡنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرۡضَوۡنَهَآ أَحَبَّ إِلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ...﴾

٣/ لە (ئەنەس)ەوە ریوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ﴿لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من ولده ووالده والناس أجمعين﴾ (رواه البخاري ومسلم) واتە : هیچ یەکێك لە ئێوە ئیمانی کامل نابێت تاوەکو منی خۆشتر نەوێت لە منداڵەکەی و لە باوکی و لە هەموو خەڵکی).

- ﴿ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ...﴾ : خۆشویستنی ئەوانە خۆشویستنی پەرستن نییە بەڵام ئەگەر زاڵ بوو بە سەر خۆشویستنی خوادا ئەوا دەبێتە هۆی سزا لە لایەن خوای گەورەوە .
- ﴿لا يؤمن أحدكم﴾ : ئەوەی نەفی کراوە کەماڵی ئیمانە واجیبەکەیە، ئیللا مەگەر دڵەکە خۆشەویستی خوای تێدا نەبێت.

## حاڵەتەکانی نەفی شتەکان :



- هۆی هێنانەوەی فەرموودەکە لێرەدا دیارو ئاشکرایە، چونکە خۆشویستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خۆشویستنی خوایە، وە خۆشویستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبەر چەند شتێك دەبێت :

١. چونکە ئەو پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، جا ئەگەر خوای گەورەت لە هەموو کەس زیاتر خۆشدەوێت ئەوا دەبێت پێغەمبەرەکەیت(ﷺ) لە هەموو کەس زیاتر خۆش بوێت .

٢. چونکە هەستاوە بە خواپەرستی و گەیاندنی پەیامەکەی خوا .

٣. چونکە خوای گەورە ئەو هەموو ئاکار و رەوشتە جوان و کردارە چاکەی پێ بەخشیوە .

٤. چونکە ئەو هۆکاری هیدایەتدان و فێرکردن و رینموویی کردنی تۆیە .

٥. لەبەر ئەو هەموو ئارامییەی لە پێناوی گەیاندنی پەیامەکەی خوادا گرتی.

٦. چونکە بە هەموو تێکۆشانی و سامان و نەفسی خۆی هەوڵیدا بۆ بەرزکردنەوەی وشەی (اللە) .

**چۆن پێغەمبەری خوامان( ﷺ ) خۆش دەوێت لە پاش وەفات کردنی ؟**

بە فێربوونی سوننەتەکانی و کارکردن پێی و بانگەوازکردن بۆی و بەرگری کردن لێی و پێشخستنی قسەی ئەو بەسەر قسەی هەموو کەسێکدا لە خەڵکی و دەست گرتن بە رێبازەکەیەوە .

## خەڵکی لە باسی خۆشویستن لە گەڵ خوادا بوونەتە چوار بەشەوە :

| خوای گەورەی خۆشدەوێت و لە گەڵیدا هیچ کەسێکی تری خۆش ناوێت، ئەمەش ئیخلاصە. | هاوتاکانی خۆشدەوێت بە خۆشویستنێکی یەکسان لە گەڵ خۆشەویستی خوادا، ئەمەش شیرکی گەورەیە. | هاوتاکانی خۆشدەوێت زیاتر لە خۆشویستنی خوا، ئەمەش شیرکی گەورەیە . | هاوتاکانی خۆشدەوێت و بە هیچ شێوەیەك خوای گەورەی خۆش ناوێت، ئەمەش لە مەزنترین و گەورەترین جۆری شیرکە . |
|---|---|---|---|

## بەڵگەی چوارەم تا شەشەم

٤. لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتووە لە (ئەنەس)ەوە کەوا فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلاوَةَ الإِيمانِ : أنْ يَكُونَ الله وَرَسُولُهُ (ﷺ)أحَبُّ إلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُما، وأنْ يُحِبَّ المَرْءَ لا يُحِبُّهُ إلا لله، وأنْ يَكْرَهَ أنْ يَعُودَ فِي الكُفْرِ بَعْدَ إذْ أنْقَذَهُ الله مِنْهُ، كما يَكْرَهُ أنْ يُلْقَى فِي النَّارِ) وفي رواية : (لا يجد أحدٌ حلاوة الإيمان حتى ...) تا کۆتایی) واتە: سێ ئاکار هەن لە هەر کەسێکدا هەبن تامی شیرینی ئیمان دەچێژێت : خوا و پێغەمبەری خوای(ﷺ) لە هەموو کەسێك زیاتر خۆش بوێت، وە هەر کەسێکی خۆش بوێت تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت، وە پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە سەر کوفر لەپاش ئەوەی خوای گەورەی رزگاری کرد لێی هەروەکو چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە ) وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە : ( هیچ کەسێك تامی شیرینی ئیمان ناچێژێ تاکو...)

٥. لە (عبدالله بن عباس)ەوە ریوایەت کراوەو دەفەرموێت : (من أحَبَّ في اللهِ، وأبغَضَ في اللهِ، ووالى في اللهِ، وعادى في اللهِ، فإنّما تُنالُ ولايةُ اللهِ بذلك، ولن يجد عبدٌ طعم الإيمان – وإن كثرت صلاته وصومه – حتى يكون كذلك، وقد صارَت عامَّةُ مُؤاخاة الناسِ على أمرِ الدُّنيا، وذلك لا يُجدي على أهله شيئاً) رواه ابن جرير

واتە : هەرکەسێ خۆشویستنی لەبەر خوا بوو، رق لێبوونی لەبەر خوا بوو، دۆستایەتی لەبەر خوا بوو، وە دوژمنایەتی لەبەر خوا بوو، جا ویلایەت بەو شتانە بە دەست دێت، وە هیچ بەندەیەکی خوا تامی ئیمان ناچێژێ تاوەکو وا نەبێت – هەرچەندە نوێژ و رۆژووی زۆر بێت – وای لێهاتووە برایەتی زۆربەی خەڵکی لەبەر دونیایە، ئەوەش سوود بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت).

٦. دەربارەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت : ﴿وَتَقَطَّعَتۡ بِهِمُ ٱلۡأَسۡبَابُ﴾ ئیبن عەبباس دەفەرموێت : خۆشەویستی .

**خۆشەویستی بە پێی ئەوەی خواپەرستییە :**

**خواپەرستییە لە زاتی خۆیدا :**

خۆشەویستی پەرستن بۆ هیچ کەسێك نابێت تەنها بۆ خوا نەبێت، کە ملکەچبوون و بە مەزن زانین واجیب دەکات، ئەوەش جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و دوور کەوتنەوە لە نەهی لێکراوەکان لە خۆ دەگرێت .

**لە خودی خۆیدا پەرستن نییە :**

**خۆشەویستی بۆ خوا و لەبەر خوا :** وەکو خۆشویستنی پێغەمبەران .

**خۆشەویستی بەزەیی و میهرەبانی :** وەکو خۆشویستنی منداڵ و بچووکەکان .

**خۆشویستنی شکۆمەندی و بە مەزن زانین :** وەکو خۆشویستنی باوك و مامۆستا.

**خۆشویستنی سروشتی :** وەکو خۆشویستنی خواردن و خواردنەوە .

- شەریفترین جۆر جۆری یەکەمە، بەڵام ئەوانیتر لە بەشی ڕێگەپێدراو و حەلاڵن، ئیللا مەگەر شتێکی پێوە گرێ بدرێت کە پەرستن لە خۆ بگرێت ئەوا ئەو کاتە دەبێتە عیبادەت .
- **(حلاوة الإيمان) :** ئەوەی لە دڵ و ناخی خۆیدا بە دی دەکات لە دڵئارامی و سینگ فراوانی و پشوودان .
- **(مَنْ أحبَّ في الله) :** ئەوەی خوای گەورە رقی لێی بێت ئەمیش رقی لێی دەبێت و ئەوەی خوای گەورە خۆشی بوێت ئەمیش خۆشی دەوێت .
- **(وَتَقَطَّعَتْ) :** هەموو ئەوەی موشریکەکان دڵیان پێ خۆش کردبوو و خۆیان پێوە پەیوەست کردبوو بچڕا و نەما.

**ویلایەت (دۆستایەتی) :**



## مەسەلەکان :

**یەکــەم :** تەفســیری ئایەتەکــەی ســورەتی (البقــرة) : ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا ﴾

**دووەم :** تەفســیری ئایەتەکــەی ســورەتی (الــبراءة) : ﴿ قُلۡ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ ﴾

سێیەم : واجیب بوونی پێشخستنی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر نەفس و کەس و کار و ساماندا .

**چوارەم :** نەفی ئیمان بەڵگەی دەرچوون لە ئیسلام نییە (ئیللا مەگەر دڵەکە بە تەواوەتی خاڵی بێت لە خۆشویستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، گومانیشی تێدا نییە ئەمەش نەفی ئەصڵی ئیمانە)

**پێنجەم :** ئیمان تامێکی شیرینی هەیە رەنگە مرۆڤ تامی بکات و رەنگە تامی نەکات .

**شەشەم :** باسی چوار کردارەکەی دڵ، کە هیچ کەسێك ویلایەت و دۆستایەتی خوای دەست ناکەوێت ئیللا بەو چوارە نەبێت، وە هیچ کەسێك تامی شیرینی ئیمان ناکات ئیللا بەو چوارە نەبێت (خۆشویستنی لەبەر خوا بوو، رقلێبوونی لەبەر خوا بوو، دۆستایەتی لەبەر خوا بوو، وە دوژمنایەتی لەبەر خوا بوو).

**حەوتــەم :** تێگەیشتنی هاوەڵان بۆ واقیعەکە کەوا زۆربەی برایەتی لەبەر دونیایە ( ئەمە لەسەردەمی ئەواندا وابووە، ئەی ئاخۆ سەردەمی ئێمە چۆن بێت ؟)

**هەشــتەم :** تەفســیری ئایــەتی : ﴿ وَتَقَطَّعَتۡ بِهِمُ ٱلۡأَسۡبَابُ ﴾ وەکو: خۆشەویستی و هۆکارەکانی تر.

**نۆیــەم :** هەنـدێ لـە موشـریکەکان هـەن خـوای گـەورەیان زۆر خۆشـدەوێت (ئەوەی موسڵمانان لەوان زیاترە کەوا خۆشویستنیان بـۆ خـوای گـەورە لـەوان زۆرترە بۆ بتەکانیان).

**دەیەم :** هەرەشە لەو کەسانە کەوا ئەو هەشت شـتە خۆشەویسـتر بێـت لای لـە دینی خوا.

**یازدەهـەم :** هەرکەسـێك هاوتایـەکی خـۆش بوێـت کـەوا خۆشەویسـتییەکەی یەکسان بێت لە گەڵ خۆشەویستی خوادا، ئەوا شیرکی گەورەی ئەنجامداوە .

**٣٢/ بەشی ئایەتی** ﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ **ئایەتەکە** .

نوسەر –ڕەحمەتی خـوای لێبێـت– بەشـی ترسـی لـەپاش بەشـی خۆشویسـتن هێناوە، چونکە پەرستنی خودا لە سەر دوو شت بنیات نراوە :

**خۆشویستن :** و بەوەش گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکان ڕوو ئەدات .

**ترس :** بەوەش دوورکەوتنەوە لە نەهی لێکراوەکان ڕوو ئەدات.

**بەشەکانی ترس :**

**ترسی (نهێنی) پەرستن و خۆزەبوون کردن و بـە مـەزن دانـان و ملکـەچ بـوون :** ئەنجامـدان و دەربـڕینی بـۆ جگە لـەخودا شـیرکی گەورەیـە، وە خـــەڵکیش لـــەم باســـەدا دوو لا و نێوەندێکن.

**ترســـی سروشـــتی و جیبیلـــی (ڕێگە پێدراوە) :** ﴿ فَخَرَجَ مِنۡهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ﴾، جـا ئەگـەر ببێتـە هـۆی وازهێنان لە واجبێك یـان ئەنجامـدانی کارێکی حەرام، ئەوا حەرامە.

- ﴿يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ﴾ : شەیتان هەموو ئەو کەسانە دەترسێنێت کە ئەیانەوێت واجبێك ئەنجام بدەن.
- ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ﴾ : بەڵکو بەردەوام بن لەوەی فەرمانم پێکردوون و واجیبم کردووە لەسەرتان لە جیهادکردن لە پێناوی خوادا و لەوان مەترسن، وە ئەگەر خودا لەگەڵ مرۆڤدا بێت، ئەوا کەس نایبەزێنێت.

**بەڵگەی دووەم :**

ئایەتی ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾.

- ﴿مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ : خودای گەورە زۆر جار باوەڕبوون بەخۆی ئەبەستێتەوە بەباوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی، لەبەر ئەوەی ئیمان هێنان بەخوای گەورە ڕەجا و تکای خاوەنەکەی بە هێز دەکات و ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایی ترسی خاوەنەکەی بە هێز دەکات .
- ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ : واتە بەشێوەیەکی لایەق ئەنجامی داوە بەبێ کەم و کورتی، ئەنجامدانیشی دوو جۆرە:

١. ئەنجامدانێکی واجیب : تەنها واجیبەکان ئەنجام دەدات لە مەرجەکان و ئەرکانەکان و واجیباتەکان.

٢. ئەنجامدانێکی موستەحەب : لە واجیبەکە زیاتر ئەکات و واجب و موستەحەبەکان ئەنجام دەدات.

- ﴿وَلَمۡ يَخۡشَ﴾ : (خشية) ئەو ترسەیە کە بنیاتنراوە لەسەر زانینی مەزنی و کەمالی دەسەڵاتی ئەوەی لێی ئەترسیت، و جیاوازی نێوان (خشية) و (خوف) ئەوەیە کە :

١- (خشية) ناسین و زانینی ئەوەی لێی ئەترسیت و حاڵەتەکەی بەڵام (خوف) ڕەنگە لە نەزانەوە بێت.

٢- (خشية) بەهۆی مەزنی ئەوەی لێی دەترسێت بەڵام (خوف) بەهۆی لاوازی ترساوەکەوەیە.

- ﴿فَعَسَىٰٓ﴾ : ئیبن عەبباس ئەفەرموێت : وشەی (عسى) لە خوای گەورەوە جێ بە جێکردنی واجیبە، وە بە شێوازی (الترجي) تکاکردن هاتووە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە خۆی بایی نەبێت بەوەی خۆی ئەم وەصفەی بە دەست هێناوە .

**بەشەکانی ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکان و دژەکەشی وێرانکردنیەتی، ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَآۚ﴾:**

**ئاوەدان کردنەوەیەکی حسی (هەستپێکراو) :** بە بنیات نان و فەرش و خاوێنی و نۆژەنکردنەوەی، ودژەکەشی ڕووخاندنی حسییە، بە وێرانکردن و ڕووخاندنی.

**ئاوەدان کردنەوەیەکی مەعنەوی :** بەنوێژکردن و زیکرکردن و خوێندنەوەی قورئان، وە دژەکەشی ڕووخاندنی مەعنەوی وەکو ئەوەی مزگەوتەکان بکرێنە شوێنی شیرك و بیدعە.

## بەڵگەی سێیەم :

ئایەتی ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ﴾ .

- ئاشکرایە کە مرۆڤەکان لە عەزابی خوا هەڵدێن، بۆیە فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن، جا ئەم کەسە فیتنەی خەڵکی وەکو عەزابی خوا لێکردووە، لە ئازاردانیان هەڵدێت بەوەی ئارەزووەکانیان جێ بە جێ بکات ئەمەش ئەو فیتنەیەی وەکو عەزاب لێ کردووە، جا وای لێدێت لێیان ئەترسێت وەکو چۆن لەخوا دەترسێت، چونکە عەزابی ئەوانی وەکو عەزابی خوا لێکردووە، بۆیە لێی هەڵهات بەڕازی بوون بە فەرمانەکانیان.
- لەو ئایەتەدا ئاگادارکردنەوەیەك هەیە لەوەی کە مرۆڤ پێچەوانەی ئەوە بڵێت لە دڵیدایە.

## بەڵگەی چوارەم :

لە (ابو سعيد الخدری)یەوە هاتووە ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی : ((إنّ مِنْ ضَعْفِ اليَقِينِ أنْ تُرْضِيَ الناسَ بِسَخطِ الله، وأنْ تَحْمَدَهمْ على رِزْقِ الله، وأنْ تَذُمَّهُمْ على ما لَمْ يُؤْتِكَ الله، إنَّ رِزقَ الله لا يَجُرُّهُ حِرْصُ حَرِيصٍ، ولا يَرُدُّهُ كَرَاهِيَةُ كارِهِ)) . واتە : لە لاوازی یەقین ئەوەیە کە خەڵکی ڕازی بکەیت هەرچەندە تووڕە بوونی خوای تێدا بێت، وە سوپاسگوزاریان بیت لەسەر رزقی خوای گەورە، وە زەمیان بکەیت لەسەر ئەوەی خوای گەورە پێی نەبەخشیویت، باش بزانە کەوا رزقی خوای گەورە هەرگیز بە دەست نایەت بە سووربوونی ئەوانەی سووردەبن و ڕەد ناکرێتەوە بە بێزار بوونی ئەوانەی پێیان ناخۆشە ))

- ((أنْ تُرْضِيَ الناسَ)) : بەترسان لێیان لەخودا زیاتر و ئامۆژگاری نەکردنیان.
- ((وأنْ تَحْمَدَهمْ)) : هەموو سوپاسگوزاریەك بۆ ئەوان بێت بە لە بیرکردنی ئەنجامدەرەکەی کە خودایە.
- ((وأنْ تَذُمَّهُمْ)) : چونکە ئەگەر خوا بڕیاری ئەوە بدات ئەوا هۆکارەکان دروست ئەبن، واجبیش ڕازی بوونە.

## بەڵگەی پێنجەم :

لە دایکە عائیشەوە ڕیوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی : ((من التمس رضا الله بسخط الناس رضي الله عنه وأرضى عنه الناس، ومن التمس رضا الناس بسخط الله، سخط الله عليه وأسخط عليه الناس)) واتە : هەرکەسێ بە دوای ڕازی بوونی خوادا بگەڕێت هەرچەندە تووڕە بوونی خەڵکی تێدا بێت، ئەوا خوای گەورە لێی ڕازی دەبێت و واش دەکات خەڵکی لێی ڕازی بێت، وە هەرکەسێ بە دوای ڕازی بوونی خەڵکیدا بگەڕێت هەرچەندە تووڕەبوونی خوای تێدا بێت، ئەوا خوای گەورە لێی تووڕە دەبێت و خەڵکیشی لێ تووڕە دەکات. ابن حبان لە (صحيح)ەکەیدا ڕیوایەتی کردووە.)) .

- ((مَنِ الْتَمَسَ)) : ترسان لێیان تاکو لێی ڕازی بن، جا ترسی ئەوانی پێش ترسی خوا خستووە.

### سوود بە دەست هاتووەکانی فەرموودەکە :

١. واجیب بوونی داواکردنی ئەوەی خودا لێی ڕازییە هەرچەندە خەڵکیش تووڕە بن، چونکە قازانج و زیان بە دەستی خودایە.
٢. دروست نییە خوای گەورە لە خۆی تووڕە بکات لە پێناوی ڕازی کردنی خەڵکیدا جا ئەگەر کەسەکە هەر کەسێك بێت .
٣. سەلماندنی ڕازی بوون و تووڕەبوون بۆ خودا بە حەقیقەت، بەڵام بەبێ لێکچواندن بە دروستکراوەکان.

## مەسەلەکان:

**یەکـەم :** تەفسـیری ئایەتەکـەی (آل عمـران): ﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ ﴾ .

**دووەم :** تەفسیری ئایەتەکەی (براءة) : ﴿ إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ ﴾

**سـێیەم :** تەفسـیری ئایەتەکـەی (العنکبـوت) : ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ ﴾

**چوارەم :** یەقین لاواز دەبێت و بەهێزیش دەبێت.

**پێنجەم :** نیشـانی لاوازی یـەقین، لەوانـەش ئـەم سـێ خاڵەیـە: (خـەڵکی ڕازی بکەیت بە تووڕە بوونی خوا، سوپاسی ئەوان بکەیت لەسـەر ڕزق و ڕۆزی خـوا، و لۆمەی ئەوان بکەیت لەسەر ئەوەی کەخودا پێی نەداویت).

**شەشەم :** ترسان لە خودا بە دڵسۆزی یەکێکە لە فەرزەکان.

**حەوتەم :** باسکردنی پاداشتی ئـەوەی ئـەنجامی دەدات ((ئـەوا خـوای گـەورە لێی ڕازی دەبێت و واش دەکات خەڵکی لێی ڕازی بێت)).

**هەشتەم :** باسکردنی سـزای ئـەوەی وازی لێـدێنێت ((ئـەوا خـوای گـەورە لێـی تووڕە دەبێت و خەڵکیشی لێ تووڕە دەکات)).

## ٣٣/ بەشی ئایەتی : ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ٢٣﴾

- دوای خۆشویستن و ترس نوسەر –ڕەحمەتی خوای لێبێت– ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کەوا بەدەستهێنانی داواکراو و لابردنی خراپە نابێت ئیللا بە پشتبەستن (توكل) نەبێ، وە پەرستن جێبەجێ نابێت بەبێ پشتبەستن و ئەوەش بەرزترین پلەو مەقامە، و ئەبێت مرۆڤ لە هەموو کاروبارێکیدا هاوەڵی بێت.
- ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ﴾ : پێشخستنی مەعمولەکە سوودی حەصرە دەگەیەنێت، وە بەڵگەی ئەوەی تێدا بە دی دەکرێت کەوا کەمالی ئیمان بوونی نامێنێت لە کاتی نەمان و نەبوونی پشتبەستندا (التوكل)، ئیللا مەگەر پشتبەستنەکە بە تەواوەتی لەسەر جگە لەخودا بێت، ئەو کاتە دەبێتە شیرکی گەورە.

**پشتبەستن (توكل) : بریتییە لە پشتبەستنێکی ڕاست بە خودا لە گەڵ بوونی متمانە پێی و گرتنە بەری هۆکارە دروستەکان، جا بێگومان پێویستە پشتبەستنێکی ڕاستگۆیانە و ڕاستەقینە هەبێت لە گەڵ ئەنجامدانی هۆکارە ڕێگە پێدراوەکان، وە بەشەکانی :**

| ڕادەستکردنی هەموو کارەکان بۆ لای خودا، و باوەڕهێنان بەوەی کە بە دەستهێنانی قازانج و لابردنی زیان بەدەستی ئەوە، جا ئەمە ئەنجامدانی بۆ جگە لە خوا شیرکی گەورەیە. | پشت بەستن بە زیندوویەك لە گەڵ بوونی جۆری هەژاری نواندن، جا ئەمە شیرکی بچووکە، وەکو ئەو کەسەی لە ڕزقەکەیدا پشت بە کەسێك ئەبەستێت لەگەڵ هەژاری نواندن بۆ لای . | **الوكالە (وەکالەت) :** دروست نییە بوترێت : پشتم بە فلان بەستووە، یان :پشتم بەخودا بەست پاشان بە فلان، بەڵکو ئەوترێت : فلانم کردە وەکیل یان کارەکەم ڕادەستی کرد، وە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەکارە تایبەتی و گشتیەکانیدا وەکالەتی کردووە. |
|---|---|---|

## بەڵگەی دووەم و سێیەم :

٢/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣ ﴾.

٣/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾

- مرۆڤ ئیماندار ئەبێت هەرچەندە ئەم صیفەتانەشی تێدا نەبێت، بەڵام رەهای ئیمانی لە گەڵدایە.
- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ : هیچ پشت و پەنات نییە جگە لە (الله) و پشت و پەنای شوێنکەوتوانت لە ئیمانداران تەنها (الله) یە ، جا هەمووتان پشتی پێببەستن، تۆ و ئەوانەشی شوێنت کەوتوون.

**خوای گەورە لەم ئایەتە و ئایەتەکانی دوای ئەوە باسی پێنج وەصفی ئیمانی تەواوی کردووە:**

| | |
|---|---|
| ﴿إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ | واتە : ترسا، چونکە مەزنی خوا لەو دڵەدا هەیە، جا نیشانەی ئیمان ئەوەیە کە ئەگەر بە خوای گەورەی یاد بخرێتەوە ئەترسێت. |
| ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا﴾ | واتە : لەبەر بەڕاست دانان و ملکەچ بوون، وە بەڵگەی ئەوەشی تێدایە کە مرۆڤ ڕەنگە زیاتر سوود ببێنیت لە خوێندنەوەی کەسانی تر وەك لە خوێندنەوەی خۆی . |
| ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ | واتە : پشت بە خودا ئەبەستن نەك بە جگە لە ئەو، لە گەڵ ئەوەشدا کار بە هۆکارەکان ئەکەن، وە ئەمەش شاهیدەکەیە. |
| ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ | واتە : بە تەواوەتی و ڕاستی ئەنجامی دەدەن، نوێژ (اسم جنس)ـە فەرزەکان و سوننەتەکانیش ئەگرێتەوە. |
| ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ | ستایشی ئەوانەی تێدایە کە بەشێکی ماڵەکەیان بەخشیوە و ئەوانەی هەموو ماڵەکەیان بەخشیوە، وە ئەوانەی هەموو ماڵەکەیان دەبەخشن ئەو ستایشە دەیانگرێتەوە ئەگەر پشت بەخودا ببەستن . |

## بەڵگەی چوارەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ﴾

- کارە گرانەکانی لە کۆڵ دەکاتەوەو کاری بۆ ئاسان ئەکات، و ئەگەر هەندێك زیانی پێبگات ئەوا خوای گەورەی بەسە، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەورەی ئەو کەسانەیە پشت بە خوا دەبەستن، لەگەڵ ئەوەشدا ئازاری تووش دەهات بەڵام زەرەر و زیانی پێ نەدەگەیشت .
- جا ئایەتەکە مانای ئەوە ئەگەیەنێت کە هەرکەس پشت بە جگە لەخودا ببەستێت سەرشۆڕ و ریسوا ئەبێت و خودا وازی لێ دەهێنێت.

## بەڵگەی پێنجەم :

ئیبن عەبباس ریوایەتی کردووە و دەفەرموێت : (حسبنا الله ونعم الوكيل) قالها ابراهيم حين ألقي في النار، و قالها محمد (ﷺ) حين قال له الناس : ﴿ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ ﴾ واتە : عبداللە ی کوڕی عەبباس دەڵێت : ( خودای گەورەمان بەسەو هەر ئەویش باشترین کەسە پشتی پێ ببەستین) ئەم وتەیە ئیبراهیم فەرمووی کاتێك هاویشتیانە ناو ئاگرەوەو موحەممەد (ﷺ) فەرمووی کاتێ خەڵکی پێی گوت : ﴿ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ ﴾ رواه البخاري.

ئەم چیرۆکە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، کاتێ (أبو سفیان) لە جەنگی ئوحود بووەوە ویستی بگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی بۆ ئەوەی لە ناویان بەرێت بە عەقڵی خۆی، بۆیە بە کۆمەڵێکدا گەیشت، بەوانی وت : بۆ کوێ دەڕۆن ؟ وتیان : دەچین بۆ مەدینە، وتی : هەواڵ بە محمد (ﷺ) و هاوەڵانی بدەن کەوا ئێمە دەگەڕێینەوە لایان و لە ناویان دەبەین، بۆیە ئەو کۆمەڵە کەسە کە گەیشتنە مەدینە، هەواڵەکەیان بەوان گەیاند، پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی وتیان : ﴿حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ﴾ بە حەفتا سوارەوە دەرچوون، تاکو گەیشتنە (حمراء الأسد) ئەمجار (أبو سفیان) لە بڕیارەکەی پاشگەز بوویەوە و گەڕایەوە بۆ مەککە، ئەمەش بەڵگەی پشتگیری کردنی خوای گەورەیە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و ئیمانداران، چونکە پشتیان بە ئەو بەست .

## ئاگادارییەك :

ئەو باسەی کە دەکرێت کەوا ئیبن عەبباس لە بەنی ئیسرائیلەوە ریوایەت دەکات قسەیەکی بەناوبانگە لەلای زانایانی موستەلەحی فەرموودە (مصطلح الحدیث) ، بەڵام ئەمە قسەی تێدایە، چونکە ئیبن عەبباس لەو کەسانەیە کە ڕەتی ئەکاتەوە لە بەنی ئیسرائیلەوە ڕیوایەت بکرێت.

ئایە ئەو هەواڵانەی لە بەنی ئیسرائیلەوە هاتوون باوەڕی پێ بکەین یان نا ؟

١. باوەڕی پێ دەکەین ئەگەر لە شەرعەکەماندا هاتبێت کە ڕاستە.

٢. باوەڕی پێ ناکەین ئەگەر لە شەرعەکەماندا هاتبێت کە درۆیە.

٣. ڕائەوەستین لەسەری ئەگەر لەشەرعەکەماندا بەڕاست دانان یان بەدرۆ دانان دەربارەی نەهاتبێت.

## مەسەلەکان:

**یەکەم :** پشتبەستن بەخودا یەکێکە لە فەرزکراوەکان (چونکە خوای گەورە ئیمانی بەوەوە پەیوەست کردووە).

**دووەم :** یەکێکە لە مەرجەکانی ئیمان.

**سێیەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی ئەنفال : ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ .

**چوارەم :** تەفسیری ئایەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ﴾.

**پێنجەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (الطلاق) : ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ﴾.

**شەشەم :** مەزنی و گەورەیی ئەم وشەیە، وە ئەوە قسەی (ئیبراهیم و محمد(ﷺ)) بووە لە کاتی تەنگانەدا.

(وە لە بابەتەکە زیادکردنی ئیمانیشی تێدایە، وە پێویستە لە کاتی تەنگانەدا مرۆڤ پشت بەخودا ببەستێت، لەگەڵ ئەنجامدانی هۆکارەکان و شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئیماندا هۆکارێکە بۆ ئەوەی بەندە خودای گەورەی بەس بێت).

**( ٣٤ ) بەشی ئایەتی :** ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾

- ئەم بەشە ئەمانە ئەگرێتەوە : تەئمین بوون لە مەکری خوای گەورە و بێ ئومێدبوون لە ڕەحمەتی خوای گەورە، و هەردووکیان دوو لای بەرامبەر و دژ بە یەکن، وە دەیەوێ بە ئەو کەسە بڵێت کە بەرەو لای خوا دەڕوات کەوا ترس و ڕەجا (تکا) لە خۆیدا کۆ بکاتەوە، وە چەند سوودێك لەم ئایەتە ئەبینین :

١. وریابوون لەو نیعمەتانەی خوای گەورە دەیرێژێتە سەر بەندەکەیدا نەوەك ئەوە پەلکێشکردن (استدراج) بێت .

٢. حەرامی تەئمین بوون لە مەکری خوا .

**بەڵگەی دووەم :**

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿قَالَ وَمَن يَقۡنَطُ مِن رَّحۡمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ﴾

- **ماناکەی :** واتە هیچ کەسێك لە ڕەحمەتی خودا بێ هیوا نابێت مەگەر کەسێك هیدایەتی لە دەست دابێت، ئەو ونبووەی کە نازانێت چی پێویستە لەسەری بەرانبەر بە خوا، لە گەڵ ئەوەشدا خوای گەورە غیرەتەکەی نزیکە، وە بێ هیوابوونیش دروست نییە چونکە گومانی خراپ بردنە بە خودا چونکە :

١. تانەدانە لە توانای خوای گەورە، چونکە هەرکەسێك بزانێت کە خودا هەموو شتێکی لە توانادایە، ئەوا هیچ شتێك بە دوور نازانێت ئەگەر بیەوێ ئەنجامی بدات.

٢. تانەدانە لە ڕەحمەتی خوای گەورە، چونکە هەرکەسێك بزانێت کە خودا میهرەبانە ئەوا بە دووری نازانێت خودا ڕەحمی لێ بکات.

## بەڵگەی سێیەم و چوارەم:

٣/ لە (ابن عباس)ەوە ڕیوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری لێکرا دەربارەی تاوانە گەورەکان؟ ئەویش فەرمووی : (الشرك بالله، واليأس من روح الله، والامن من مكر الله ) واتە : هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوای گەورە و بێ ئومێدی لە ڕەحمەتی خوا و تەئمین بوون لە مەکری خوای گەورە ) .

٤/ وە لە (ئیبن مەسعود)ەوە ڕیوایەت کراوە کەوا فەرموویەتی: (أكبر الكبائر : الاشراك بالله، والامن من مكر الله، والقنوط من رحمة الله، واليأس من روح الله) (رواه عبدالرزاق) واتە : گەورەترین تاوانە گەورەکان بریتین لە : هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوای گەورە و تەئمین بوون لە مەکری خوا و بێ ئومێدی لە لە ڕەحمەتی خوا و بێ هیوایی لە ڕەحمەتی خوا ) .

- ((الشرك بالله)) : مەبەست لێی شیرکی گەورە و بچووکە، وە شیرکی بچوك لە تاوانە گەورەکان گەورەترە.
- ((والامن من مكر الله )) : بە شێوەیەك کە سەرپێچی خوا بکات هەرچەندە نیعمەتەکان بەردەوامن بەسەریەوە .
- ((والقنوط من رحمة الله )) : ڕەحمەتی خودا بە دوور بزانێت و بەدەستهێنانی داواکراو بە دوور بزانێت.
- (( واليأس من روح الله)) : لابردن و نەمانی مەینەتییەکان بەدوور بزانێت.

## کورتەی باسەکە :

ئـەو کەسـەی بـەرەو لای خـوای گـەورە دەڕوات دوو شـت دەبنـە کۆسـپ لـە ڕێگاکەیدا، ئەوانیش تەئمین بوونە لە مەکری خوای گەورە و بێ ئومێد بوون لە ڕەحمەتەکەی، جا ئەگەر تووشی نارەحەتییەك بوو یان ئەوەی پێی خۆشە لـە دەستی دەرچوو، دەبیینی –ئەگەر ڕەحمەتی خوای گەورەی پێ نەگات– ئەوا بێ ئومێدی زاڵ دەبێت بە سەریدا فەرحانی و ڕزگار بـوون بـە دوور دەزانێـت و هۆکارەکان ناگرێتە بەر، وە مەبەست لە تەئمین بوون لـە مـەکری خـوا ئـەوەی دەبیینین بەردەوامە لەسەر ئەنجام دانـی تاوانـەکان و هەرچـەندە نیعمەتـەکان بەردەوامن بەسەرییەوە، وە باوەڕی وایە کەوا ئەو لەسەر حەقە بۆیە بـەردەوام دەبێـت لەسـەر ناحەقییەکـەی، گومانیشـی تێـدا نییـە ئەمـە پەلکێشـکردنە (ئیستدراجە) .

## مەسەلەکان:

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (الاعراف) : ﴿أَفَأَمِنُوا۟ مَكْرَ ٱللَّهِ﴾ .

**دووەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (الحجر) : ﴿قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ﴾ .

**سێیەم :** توندی هەڕەشـە لەسـەر ئـەو کەسـەی کـە تەئمینـە لـە مـەکری خـوای گەورە (بەوەی یەکێکە لە تاوانە گەورەکان).

**چوارەم :** توندی هەڕەشە لە بێ هیوا بوون لەڕەحمەتی خودا.

## ( ٣٥ ) بەشی : ( لە باوەڕهێنان بە خوا : ئارامگرتنە لەسەر قەدەرەکانی خوای گەورە )

### بەشەکانی ئارام گرتن سێ دانەن :

| ئارامگرتن لەسەر ئەنجامدانی ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە، ئەمەش ئارامگرتن لەسەر فەرمانەکان ئەگرێتەوە وەکو نوێژ و ڕۆژوو. | ئارامگرتن لەسەر وازهێنان لەوەی خوای گەورە نەهی لێ کردووە، وەکو خۆ دورخستنەوە لە شیرك و هەموو حەرامکراوەکان. | ئارامگرتن لەسەر ئەوەی خوای گەورە تەقدیری لەسەر کردووە لەموصیبەتەکان، وەکو مردنی کەسێکی نزیك. |
| --- | --- | --- |

ئارامگرتنی لەسەر گوێڕایەڵی پێش خستووە چونکە ملکەچ بوون و کردار لە خۆ دەگرێت، پاشان ئارامگرتن لەسەر ئەنجام نەدانی تاوان چونکە وازهێنانی تێدایە، ئەمجار ئارامگرتن لەسەر قەدەرەکان چونکە هۆکارەکەی بەهەڵبژاردنی بەندە خۆی نییە، بەڵام بە پێی ئەوەی کە پێوەی پەیوەستە ئەوا ڕەنگە ئارامگرتن لەسەر ئەنجام نەدانی تاوان سەختتر بێت لەسەر مرۆڤ وەك لە ئارامگرتن لەسەر ئەنجامدانی گوێڕایەڵی.

## بەشەکانی خەڵکی لەکاتی تووشبونی موصیبەتدا چوارن :

| تووڕەبوو (متسخط) (یەکێکە لە تاوانە گەورەکان، بەرەو کوفر ئەبیات) بەدڵ (تووڕە ئەبێت) و بەزمان (دوعای وەیل و واوەیلا دەکات) و بە ئەندامەکان (لە خۆدەدات و کراس دادەڕێت و پرچی دەرنێت). | ئارامگر (بە کۆدەنگی هەموو زانایان واجیبە) بەدڵ و بەزمان و بەئەندامەکان، جا ئەوە لەسەری قورسە و رقی لێیەتی بەڵام بەرگەی ئەگرێت و ئارامی لەسەر ئەگرێت. | ڕازی بوون (موستەحەبە) لەبەر تەواوی ڕازی بوونی بەخودای خۆی، لای ئەو نیعمەت و دژەکەی وەکو یەکە، تەماشای دەکات وەکو ئەوەی قەزایەکە لە لایەن خوداوە. | سوپاسگوزارە (بەرزترین پلەیە) وای ئەبینێت کە بۆ لێخۆشبوونی تاوانەکانی و زیادکردنی چاکەکانی و ئیمانەکەیەتی، وە پێی وایە کارەساتی لەوە گەورەتریش هەیە. |
|---|---|---|---|

## بەڵگەی یەکەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥ ﴾ عەلقەمە فەرموویەتی : ((ئەوە کەسێکە تووشی موصیبەتێك دەبێت، دەزانێت ئەو موصیبەتە لە خواوەیە بۆیە رازی دەبێت و تەسلیم دەبێت) .

- ﴿يَهۡدِ قَلۡبَهُۥ﴾ : دڵئارامی پێ ئەبەخشێ، جا ئەگەر دڵ هیدایەت وەربگرێت ئەوا ئەندامەکانیش هیدایەت وەردەگرن .

## بەڵگەی دووەم :

لە صەحیحی موسلیم دا هاتوە لە (ابو هريرة)وە – ڕەزای خوای لێبێت – کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: ( اثنتان في الناس هما بهم كفر : الطعن في النسب، والنياحة على الميت) واتە : دوو ئاکار لە ناو خەڵکیدا هەن کەوا کوفریان تێدایە : تانەدان لە نەسەب و نەژادو شیوەنکردن لە سەر مردوو ) .

- (الطعن في النسب) : واتە عەیبدارکردنی یان نەفیکردنی، جا ئەمە کارێکە لە کارە کوفریەکان.
- (والنياحة على الميت) : ئەمە جێگەی شاهیدەکەیە، جا شیوەن کردن بەشێکە لە تووڕەبوون (التسخط) .

## بەڵگەی سێیەم و چوارەم :

٣- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ – رضي الله عنه – عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ : (( لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ)) (رواه البخاري ومسلم) واتە : لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) هاتووەو دەڵێ :(( پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : لە ئێمە نییە ئەو کەسەی لەڕومەتی خۆی دەدا و یەخەی خۆی دادەدڕێ و دەنگ و هاوارو شین و واوەیلێی لێ بەرز دەبێتەوە وەك سەردەمی نەفامی )) .

٤/ لە (ئەنەس)ەوە هاتوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی : (إذا أراد الله بعبده الخير عجل له العقوبة في الدنيا، وإذا أراد بعبده الشر أمسك عنه بذنبه حتى يوافي به يوم القيامة).واتە : ئەگەر خوای گەورە چاکەی بۆ عەبدەکەی بوێت ئەوا سزای تاوانەکانی لە دونیادا دەدات، وە ئەگەر خراپەی بۆ عەبدەکەی بوێت ئەوا سزای تاوانەکانی لە دونیادا نادات تاوەکو لە ڕۆژی قیامەتدا پێی دەگات )).

- ((بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ)) : هەموو ئەو بانگەوازانە سەرچاوەکەی نەفامیە، نمونەی ڕوخاندنی خانوو، وشکاندنی دەفر، و خراپکردنی خواردن ، وە چەندان نمونە وەکو ئەوانە کە خەڵکی ئەنجامی ئەدەن لەکاتی توشبوونیان بە موصیبەتێك.
- ((إذا أراد الله بعبده)) : خراپە خودی خۆی مەبەستی خوا نییە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێت : ((والشرُ ليسَ إليك))، خوای گەورە ئەوەی بۆ حیکمەتێك ئەوێت، جا ئەو کات ئەبێتە چاکە بە پێی ئەو حیکمەتەی کە تێیدایە.
- وە ئامانجی فەرموودەکە دڵنەوایی کردنی ئەو کەسانەیە تووشی موصیبەت هاتوون بۆ ئەوەی بێزار و بێ ئومێد نەبن ، جا ئەوە ڕەنگە خەیر و چاکە بێت، و سزای دونیا سوکترە لە سزاو ئازاری ڕۆژی دوایی، جا سوپاسی خوا دەکات کە سزاکەی دوانەخستووە بۆ ڕۆژی دوایی.

**بەڵگەی پێنجەم :**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ : (إن عظم الجزاء مع عظم البلاء، و إن الله إذا أحب قوما ابتلاهم، فمن رضي فله الرضا، و من سخط فله السخط) (حسنه الترمذي).واتە : بە ڕاستی گەورەیی پاداشت بە پێی گەورەیی بەڵاکەیە، وە ئەگەر خوای گەورە کۆمەڵێکی خۆش بوێت تاقیان دەکاتەوە، جا هەرکەسێك ڕازی بوو ئەوا ڕازیبونی دەست دەکەوێت و هەرکەسێك تووڕە بێت ئەوا تووڕەبونی دەست دەکەوێت )).

**سوود بە دەست هاتووەکان :**

١. هەرچەندە بەڵاکە سەختتر بوو و مرۆڤ ئارامی لەسەر گرت، ئەوا پاداشتەکەی مەزنتر ئەبێت.

٢. ئەگەر خودا گەلێکی خۆشبوێت تاقیان ئەکاتەوە بەوەی تەقدیری داوە بەسەریانەوە قەدەری گەردوونی و شەرعی.

٣. سەلماندنی خۆشویستن و تووڕەبوون و ڕازی بوون بۆ خودا، لەگەڵ وریابوون لە لێکچوواندن و چۆنیەتی.

**مەسەلەکان :**

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (التغابن) : ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ﴾

**دووەم :** ئەمە بەشێکە لە ئیمان هێنان بەخودا (ئارامگرتن لەسەر قەدەرەکانی خودا).

**سێیەم :** تانەدان لە نەسەب و ڕەچەڵەك (بە عەیبدارکردن و ڕەتکردنەوەیەی دەبێت، و ئەوەش کوفری بچووکە).

**چوارەم :** سەختی هەڕەشەی لەو کەسانەی لە روومەتی خۆیان دەدەن و کراس دادرین و بانگەواز کردن بە بانگەوازێکی جاهیلییەت (چونکە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لێ بەری کردووە).

**پێنجەم :** لە نیشانەی چاکە ویستنی خودا بۆ بەندەکەی (سزاکەی لە دونیادا بۆ پێش ئەخات).

**شەشەم :** لە نیشانەی خراپە ویستنی خودا بۆ بەندەکەی (سزاکەی بۆ ڕۆژی دوایی بۆ دوا ئەخات).

**حەوتەم :** نیشانەی خۆشویستنی خودا بۆ بەندە (ئەویش تاقیکردنەوەیە).

**هەشتەم :** حەرامی تووڕەبوون (واتە ئەو بەڵایانەی تووشی بەندە دێت).

**نۆیەم :** پاداشتی ڕازی بوون لەسەر بەڵاکان (ئەویش ڕازیبوونی خودایە لە بەندەکە).

## ٣٦/ بەشی ئەو بەڵگانەی لەسەر رووپامایی ( ریا ) هاتوون

### بەڵگەی یەکەم بۆ سێیەم :

١/ خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە.

٢ / لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتوە کە ئیمامی (مسلم) ریوایەتی کـردوە لـە فەرموودەی (أبو هريرة)ەوە کـەوا خۆشەویسـت (ﷺ) فەرموویـەتی : ((قال الله تبارك و تعالى : أنا أغنى الشركاء عن الشرك، من عمل عملاً أشرك معي فيه غيري، تركته و شركه )) رواه مسلم واتە : من لە هەموو شەریکەکان بێ نیاز تـرم لـە شەریك، کەسێ کردەوەیەك بکات و جگە لە مـنی تێدا بەشدار بکات ئـەوا لـە گەڵ شەریکەکەیدا بە جێیان دەهێڵم ))

٣ / لـە (ئـەبو سـەعید)ەوە هـاتووە ئـەویش لـە پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ) دەفەرموێت : (ألا أخبركم بما هو أخوف عليكم عندي من المسيح الدجال ؟ قالوا : بلى يا رسول الله (ﷺ)، قال : الشرك الخفي، يقوم الرجل فيصلي فَيُزَيِّنُ صلاته لما يرى من نظر رجل) رواه أحمد واتە : ئایە هەواڵتان پێ بدەم بەوەی لێـی دەترسم تووشتان ببێت زیاتر لە مەسیحی دەججـال ؟ وتیـان : بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)، فـەرمووی : شـیرکی شـاراوە، کەسـێك هەڵدەسـتێ نوێـژ دەکـات و نوێژەکەی دەڕازێنێتەوە لەبەر ئەوەی کەسیکیتر تەماشای دەکات)).

- ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ﴾ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکراوە بەخەڵکی بڵێت کەوا ئەویش مرۆڤە، و ئەم مرۆڤبوونەی دووپات کردوەتەوە بە ئایەتی ﴿مِّثۡلُكُمۡ﴾، تەنها ئەوەیە ئەو وەحی بۆ دێت، بۆیە گوێڕایەڵی کردنی واجیبە، بەڵام پەرستنی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) حەرامە.
- ﴿لِقَآءَ رَبِّهِۦ﴾ : گەیشتن بە ڕازی بوونی خوای گەورە و نیعمەتەکانی تایبەتە بە ئیمانداران، و بینینی خوداش لە ڕۆژی دواییدا ئەگرێتەوە.
- ﴿عَمَلٗا صَٰلِحٗا﴾ : بە دڵسۆزی و بە دروستی (ئیخلاص و شوێنکەوتن).
- ((أنا أغنی)) دوو مانا ئەگرێتەوە :

١. پووچەڵبوونی ئەو کارانەی کە ڕووپامایی (ریا)ی تێدایە و حەرامبوونی (ریا).

٢. ڕوونکردنەوەی بێ نیازبوونی خوای گەورەو گەورەیی مافەکەی، و ماف کەس نییە هاوەڵی لە گەڵدا بۆ پەیدا بکات.

- ((المسيح الدجال)) : چاوی ڕاستی سڕاوەتەوە، پیاوێکی درۆزنە و لە نەوەی ئادەمە.

## بۆچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ریا ترساوە تووشی ئوممەتەکەی ببێت زیاتر لە مەسیحی دەجال؟

١. چونکە فیتنەی دەجال دیار و ڕوونە، بەڵام فیتنەی ڕیا شاراوەیە، وە خۆ دوورخستنەوە لە ریا زۆر گرانە.

٢. چونکە فیتنەی دەجال تەنها لە کۆتایی دونیادا دەبێت، بە جیاواز لە گەڵ ڕیادا کە فیتنەکەی لە هەموو کاتێکدایە.

## شیرك دوو جۆرە :

١. **شاراوە :** ئەوەی کە لە دڵدایە وەکو (ڕیا)، و پێشی ئەوترێت شیرکی نهێنییەکان .

٢. **دیار (ئاشکرا) :** ئەوەی بە قسە و زمان دەبێت وەکو سوێندخواردن بە جگە لە خودا، یان بە کردار وەکو کرنۆش بردن بۆ جگە لە خودا.


ڕووپامایی (ڕیا) : واتە کارێك بکات تاکو خەڵکی ببینن یان گوێیان لێبێ، وئەوەش لە خوڕەوشتی دووڕووەکانە.
لە ئەصڵی پەرستنەکەدا دەبێت : پەرستنەکە پوچەڵ ئەکاتەوە.
لە ناکاودا بێت : وردەکاری تێدایە :
دوای تەواو بوونی پەرستنەکە : هیچ کاریگەری نابێت لەسەر پەرستنەکە تەنها مەگەر دژایەتی تێدا بێت وەکو منەت کردن و ئازار پێگەیاندن لە پاش سەدەقە.
خاوەنەکەی پاڵی دەنێت و لە خۆی دووری دەکاتەوە : ئەوەی واجیب بووە لەسەری کردوویەتی، وپەرستنەکەش دروستە.
لە گەڵیدا شۆر دەبێتەوە : وردەکاری تێدایە:
سەرەتای پەرستنەکە پەیوەستە بە کۆتاییەکەیەوە : وەکو نوێژ، ئەوا تەواوی پەرستنەکە پوچەڵە.
سەرەتای پەرستنەکە جیا بێت لە کۆتاییەکەی : وەکو زەکات، ئەوا ئەو بەشەی پوچەڵ ئەبێتەوە کە ڕیای تێدایە.

## چارەسەری ڕیا چییە؟

١. بە گەورە دانانی خودا، ئەویش بە فێربوونی یەکتاپەرستی و کارکردن پێی دەبێت، چونکە مرۆڤ ئەگەر خودا بەمەزن دابنێت ئەوا گرنگی بە هیچ کەسێکی تر نادات .

٢. وازهێنان لەکارەکە لەترسی ڕیا، چونکە شەیتان یان ئەتکاتە ناو ڕیاوە یان ناو ترسان لەجگە لەخودا.

٣. نزاکردن (دوعاکردن ).

٤. شاردنەوەی کارەکان لە ترسی کەوتنە ناو ڕیاوە.

٥. سەردانی کردنی گۆڕستان بەسەردانێکی شەرعی و دروست، چونکە ئەوە دوارۆژت بیر ئەخاتەوە، وە ڕیا مرۆڤ بە دونیاوە دەبەستێتەوە.

### مەسەلەکان:

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (الکهف): ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾

**دووەم :** ئەم بابەتە گەورە و مەزنە، ئەویش ڕەدکردنەوەی کاری چاکەیە ئەگەر نیەتێکی بۆ جگە لە خودا تێکەڵ ببێت.

**سێیەم :** باسکردنی هۆکاری واجیب بوونی ئەوە، ئەویش کاملبوونی بێ نیازی خودایە.

**چوارەم :** یەکێك لەهۆکارەکان ئەوەیە کەخوای گەورە باشترین شەریکەکانە.

**پێنجەم :** ترسی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هاوەڵەکانی لەوەی تووشی ڕیا ببن (جا ئەوانەی پاش ئەوان دێن لەپێشترن).

**شەشەم :** پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی بەوە تەفسیر کردووە کە مرۆڤ بۆ خودا نوێژ بکات، بەڵام جوانی ئەکاتەوەو دەیڕازێنێتەوە، لە بەر ئەوەی کە ئەبینێت خەڵکی تەماشای دەکەن (هەروەها لە کاتی قسەکردنیشدا).

## ( ٣٧ ) بەشی : لە جۆرەکانی شیرك دونیاویستی مرۆڤە لە کردەوەکانیدا

- ئـەم بەشـە باسـی ئـەو کەسـانە دەکـات کـە نایـەوێت باسـبکرێت لـە پەرستنەکەیدا و رووپامایی ناوێت، بەڵکو خودا بە دڵسـۆزی و ئیخڵاصـەوە ئەپەرستێت، چونکە پشکێکی لە دونیا ئـەوێت، وەکو مـاڵ و پلـەو پایـە و لەشساغی خۆی و نمونەی ئەوانە، جـا ئـەو بەکارەکـەی سـودێکی دونیـایی ئەوێت، بێ ئاگا لەپاداشتی ڕۆژی دوایی.
- هیچ ڕێگرێك نییە مرۆڤ لە نوێژەکانیدا نزا بکات و داوا بکات خودا ماڵی پـێ بدات، بەڵام ئەو نوێژکردنەکەی لەبەر ئەوە نییە، چونکە ئەگەر وابێت ئەمە پلەیەکی زۆر نزمە، ئەویش دونیاویستییە بەکردەوەکانی ڕۆژی دوایی.
- **ئاگاداری :** هەندێ کەس کاتێ باسی سوودی پەرستنەکان ئەکات ئەیگۆڕن بۆ سوودی دونیایی، وە پێویست و زەرور ئەوەیە کە سـوودە دونیاییـەکان نەکرێنە ئەصڵ و بنەما.
- ئەم بابەتە لە بابەتی ڕیا ترسناکترە، چـونکە ڕیـا ڕەنگـە بـۆ نمونـە لەیـەك نوێــژدا ڕوو دەدات، بــەڵام دونیاویســتی بــە کــردەوەی ڕۆژی دوایــی ترسناکیەکەی بۆ هەموو پەرستنەکان درێژ ئەبێتەوە.

## بەشەکانی خەڵکی بەنیسبەت ئەم بەشەوە پێنجن:

| | |
|---|---|
| **دونیای دەوێت بە کردووەوەی دونیا :** | ئەمەش دروستە، وەکو ئەوەی یەکێك بازرگانی بکات تاکو خانوویەك بکڕێت. |
| **ڕۆژی دوایی ئەوێت بەکردەوەی دونیا :** | ئەمەش موستەحەببە، وەکو ئـەوەی کشـتوکاڵ دەکات تاکو بیکاتە صەدەقە. |
| **ڕۆژی دوایی ئەوێت بەکردەوەی ڕۆژی دوایی :** | موژدەی لێ بێت، ئەمە بەرزترین پلە و پایەیە. |
| **دونیا و ڕۆژی دوایی ئەوێت بەکردەوەی ڕۆژی دوایی :** | دروسـتە بەمـەرجێك ڕۆژی دواییەکـە لەپێشـتر بێـــت، ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً﴾ |
| **دونیای ئەوێت بەکردەوەی ڕۆژی دوایی :** | شیرکی بچووکە، وەکو ئەو کەسـەی پێشـنوێژی بۆ خەڵکی ئەکات بۆ پارە. |

- چۆن بزانێت دونیـای ئـەوێت یـاخود ڕۆژی دوایـی؟ ((إنْ أُعطيَ رَضيَ، وإن لَمْ يُعطَ سخِطَ)) واتە : ئەگەر پێی درا ئەوا ڕازی دەبێـت و ئەگـەر پێـی نـەدرا ئەوا تووڕە دەبێت).
- ئاگاداری: هەندێك قوتـابی لـەکاتی تاقیکردنـەوەدا بەدڵسۆزیەوە پەرستن ئەکات، بەڵام هەر لە گەڵ هاتنەوەی ئەنجامەکان واز لەپەرستن دێنێت.

## بەڵگەی یەکەم :

خــوای گــەورە دەفــەرموێت : ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا﴾ .

ئەمە تایبەتە بەئایەتەکەی سورەتی (الاسراء) : ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومًا مَّدۡحُورًا﴾، جا کارەکە ئەگەڕێتەوە بۆ ویستی خودا و لە کێدا ئەیەوێ.

## بەڵگەی دووەم :

لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا لە (ابو هریرة)ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویــەتی : (( تعسَ عبدالدينار، تعس عبد الدرهم، تعس عبد الخميصة، تعس عبد الخميلة، إن أعطيَ رضيَ و إنْ لم يعطَ سخطَ، تَعسَ و انتكسَ، وإذا شيك فلا انتقشَ، طوبى لعبدٍ آخذ بعنانِ فرسهِ في سبيل الله، أشعثَ رأسُهُ، مغبرةٍ قدماهُ، إن كان في الحراسةِ كان في الحراسةِ، وإن كان في الساقة كان في الساقة، إن استأذنَ لم يؤذنْ لهُ، وإن شفعَ لم يُشفَّعْ)) واتە :– کەساس و چارەڕەش بوو بەندەی دینار، کەساس و چارەڕەش بوو بەندەی دەرهەم، کەساس و چارەڕەش بوو بەندەی پۆشاکی جوان (الخميصة)، کەساس و چارەرەش بوو بەندەی راخەری جوان (الخميلة)، ئەگەر پێی بدرێ ئەوا رازی دەبێت و ئەگەر پێی نەدرێ ئەوا پەست دەبێت، کەساس و سەرەوژێر بوو، ئەگەر دڕکێك چوو بە لەشیدا ئەوا کەسێك نابینێتەوە بۆی دەربهێنێ، موژدە بۆ بەندەیەك کە جڵەوی ئەسپەکەی خۆی گرتووە لە پێناوی خوادا، قژی گڤ و هەردوو پێی تۆزاوی، ئەگەر لە کاتی پاسەوانیدا بێت ئەوا ئەو پاسەوان دەبێت، وە ئەگەر پێویست بوو لە پاشەوە بێت ئەوا ئەو لە پاشەوە دەبێت، ئەگەر داوای مۆڵەت بکات ئەوا مۆڵەتی پێ نادرێت، وە ئەگەر داوای لێ خۆش بوون بۆ کەسێك بکات ئەوا لێ ی خۆش نابن (شەفاعەتەکەی قبوڵ ناکرێت))) .

- ((تَعِسَ )) : دۆڕاو و سەرشۆڕ بوو، ((عبدُ الدينار)) : پارەی نەختینە لە ئاڵتوون، و پێی وتووە بەندەی دینار، چونکە ئەو واپەیوەستی بووە وەکو پەیوەست بوونی بەندە بە پەروەردگارەوە و بووەتە گەورەترین کێشەی، وە پێشی گوێڕایەڵی خواکەی خستووە.
- ((الدرهَم)) : پارەی نەختینە لە زیو.
- ((عبدالخميصة))، ((عبدالخميلة)) : ئەوەی کە بایەخ بە جل و بەرگ و پۆشاکەکەی دەدات.
- ((إن أعطيَ رضيَ )) : ڕازی نابێ ئیللا بە پارە نەبێت و تووڕەش نابێت ئیللا بۆ پارە نەبێت، بۆیە ناوی ناوە بەندەی دینار.
- ((انتكسَ )) : کارەکانی بەسەردا هەڵگەڕایەوە بەپێچەوانەی ئەوەی ئەو ئەیەوێت بەشێوەیەك بۆی ڕێکناکەوێت.
- ((وإذا شيك فلا انتقشَ)) : ئەگەر دڕکێکی بە پێدا بچەقێت ناتوانێت لایبەرێت.
- هەرسێ ڕستەکە ئەکرێت ڕستەیەکی خەبەری بێت یان دوعاکردن بێت لێی.
- ((طوبى)) : باشترین دۆخ کەبەسەر ئەم پیاوەدا بێت، وە دەڵێن : دارێکە لەبەهەشت، و یەکەم ڕا گشتگیرترە.
- (( في سبيل الله)) : ڕێکخەرەکەی ئەوەی کە دەجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی پیرۆزی (الله) بەرزکاتەوە نەك لەبەر دەمارگیری و نیشتمان .
- ((أشعثَ رأسُهُ)) : لەخۆڵدا لەپێناو خوادا، جا ئەو گرنگی نە بە حاڵی خۆی ئەدات نە بە جەستەی، مادام ئەوە لەئەنجامی گوێڕایەڵی خوادا بێت، وە پێی تۆزاوی بووە لە بەر ڕۆشتن لە پێناوی خوادا، وە ئەو شوێنەوارەی بە هۆی خواپەرستییەوە دەرکەوتووە، ئەگەر خۆماندوو کردنی تێدا نەبێت بۆی، ئەوا پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، وەکو ئەو فەرموودەیەی

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : (لخلوف فم الصائم ...) واتە : بۆنی دەمی کەسی ڕۆژووان ...)

- ((السَّاقَةِ)) : لەدواوەوەی سوپا ئەبێت، وە ئەو دوو ڕستەیە لە فەرموودەکەدا دوو مانای هەیە کە بۆی گونجاوە :

١. لای گرنگ نییە لەکوێ دائەنرێت، ئەو داوای پلەیەکی بەرزتر ناکات بۆ نمونە لە پێشەوەی سوپا بێت .

٢. ئەگەر لە پاسەوانیدا بێت مافەکەی ئەدات، هەروەها لە دواوەی سوپاش بێت مافی دەدات.

- ((إِنِ استأْذَنَ)) : لە لای خەڵکی ڕوو و شەرەف و پلەو پایەی نییە، بەڵام لای خوای گەورە هەیەتی.

- شاهید لە فەرموودەکەدا ئەوەیە کە کەسانێك لە خەڵکیدا هەن دونیا پەرستن، لەبەر دونیا تووڕە ئەبن، و فەرموودەکە خەڵکی دابەش کردووە بۆ :

١. کەسانێك هیچ کێشەیان نییە جگە لە دونیا، بە کۆکردنەوەی پارە یان باشکردنی حاڵیان، دڵی کردووەتە کۆیلەی خۆی، لە یادی خودا و خواپەرستی سەرقاڵی کردووە، جا دۆخەکە بەسەریدا هەڵئەگەڕێتەوە و خۆی لەبچووکترین ئازار پێ لانادرێت.

٢. گەورەترین خەمی ئەو ڕۆژی دواییە، بۆیە ئەو هەوڵی بۆ ئەدات بەسەختترین هیلاکی و ماندوو بوون کە ئەویش جیهاد کردنە لەپێناو خوادا، وە لە گەڵ ئەوەشدا لە هەموو ڕوویەکەوە ئەوەی لەسەریەتی ئەنجامی داوە، وە چاکەی لا گرنگە بۆیە شەفاعەت بۆ خەڵکی ئەکات.

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** دونیاویستی مرۆڤ بە کردەوەی ڕۆژی دوایی.

دووەم : تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی هود : ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا﴾

**سێیەم :** ناونانی مرۆڤی موسڵمان بە بەندەی دینار و دەرهەم و پۆشاکی جوان.

**چوارەم :** تەفسیرەکەی ئەوەیە کە ئەگەر پێی بدرێت ڕازییە، وە ئەگەر پێی نەدرێت تووڕە ئەبێت .

**پێنجەم :** ((تعس وانتكس)) (ئەکرێت هەواڵدان بێت و ئەکرێت نزا بێت).

**شەشەم :** ((وإذا شيك فلا انتقش)) (ئەکرێت هەواڵدان بێت و ئەکرێت نزا بێت).

**حەوتەم :** ستایشکردنی ئەو موجاهیدانەی ئەو صیفاتانەیان تێدایە ( ئەو شایەنی ئەوەیە مەدح و ستایش بکرێت نەك خاوەنی دەرهەم و دینار و خاوەنی ڕاخەر و پلە و پایە).

**( ٣٨ ) بەشی ئەو کەسەی گوێڕایەڵی زانا و فەرمانڕەوا ئەکات لە حەرامکردنی ئەو شتانەی کە خودا حەڵاڵی کردووە یان حەڵاڵکردنی ئەو شتانەی کەخودا حەرامی کردووە، ئەوا ئەوانی بە پەروەردگار داناوە جگە لەخودا.**

**حاڵەتەکانی گوێڕایەڵیکردنی زانا و فەرمانڕەواکان لە سەرپێچی خواداد :**

**کــوفری گــەورە :** شــوێنیان بکــەوێت بــەڕازی بــوون بــە قسەکانیان، پێشیان بخــات، ڕقــی لــە حوکمی خوا بێت، جا هــەر کەســێك ڕقــی لەوە بێت کە خودا دایبەزاندووە کوفری کردووە، وە هەروەها ئەگەر باوەڕی وابێت کــە حــوکمی ئــەوان هاوشــانی حــوکمی خوایە یان باشترە لێی.

**کوفری بچووك و ترسێکی مەزنــە، نزیکــە لــەوەی بکەوێتــە نێــو کــوفری گــــەورەوە :** شــــوێنیان بکەوێت بەڵام بە حوکمی خودا ڕازی بێت و بزانێت کە باشتر و چاکترە بۆ خەڵکی و وڵاتیش، بەڵام لەبــەر ئارەزوویــــەکی نەفســی خــۆی ئــەوەی هەڵبــژاردووە، وەکــو ئەوەی پیشەیەکی بوێت، وە ئەگــەر بــەوە مــاف موســـڵمانێك نـــەدات و بیبڕێــت ئــەوا ئەبێتــە ستەمکار.

**وردەکاری تێدایە کە بە نەزانین شوێنیان بکەوێت و پێی وابێت کە ئەوە حوکمی خودایە :**

١/ ئەگەر بەخۆی توانی حەق بناسێت، ئەوا ئەو زیادەڕۆکــارە یــان کەمتەرخەمــە بۆیــە تاوانبارە.

٢/ کە نەزانێت و نەتوانێت فێر ببێت و بەلاسایی کردنــەوە شــوێنیان ئەکەوێت، و پێی وایە ئەمە حەق و ڕاستە، ئەوا هیچ شتێکی لەسەر نییە و بیانووی هەیە.

## بەڵگەی یەکەم و دووەم :

١/ ئـیبن عـەبباس فەرموویـەتی : (( یوشكُ أن تنزلَ علیكم حجارة من السماء، أقول: قال رسول الله (ﷺ) وتقولون : قال أبو بكر وعمر )) واتە : نزیکە لەوەی لـە ئاسمانـەوە بـەردتان بـە سـەردا ببارێـت، مـن دەڵـێم : پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی، ئێوە دەڵێن : ئەبو بەکر و عومەر فەرموویانە)) .

٢/ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموویەتی : سەرم سوڕماوە بە کەسانێك راست و دروستی سەنەدیان ناسی، کەچی دەچن بۆ بۆچوونی سوفیان، لـە کاتێکدا خــوای گــەورە دەفــەرموێت : ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾

ئایە دەزانی فیتنە چییە ؟ فیتنە بریتییە لە شیرك، چـونکە ئەگـەر هەنـدێکی رەد کردەوە ئەوا شتێك لە لادان لە دڵیدا دروست بێت و بە هەلاکەتدا دەچێت)).

- ((قال أبو بكر وعمر)) : بە هیچ شێوەیەك نەزانراوە کـە ئەبوبـەکر و عومـەر بەڕای خۆیان پێچەوانەی دەقێکیان کردبێت.
- ﴿يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ﴾ : واتـە پشـتی لـێ دەکـەن چـونکە بـە کـەمی دەزانێت و گوێی پێ نادات .

**سەبارەت بە لاساییکردنەوە سێ ڕای جیاواز هەیە :**

**واجیب بوونی لاساییکردنەوە :** چونکە دەرگای ئیجتیهاد داخرا بە مردنی چوار پێشەواکە.

**حەرامبوونی بەرەهایی :** چونکە قەبوڵکردنی ڕای کەسێکە کەقسەکەی حوججەو بەڵگە نییە.

**دروستە ( ئەمەش ڕای ڕاجیحە ) :** لەکاتی پێویستیدا، وە نەتوانێت ئەحکامەکان دەربهێنێ، بۆیە لاسایی ئەو کەسە ئەکاتەوە کە متمانەی بە دینەکەی و زانستەکەی ئەکات و لە هەموو مەسەلەکاندا قسەی وەرئەگرێت و شوێنی ڕوخصەت و مۆڵەتەکان ناکەوێت.

**بەڵگەی سێیەم :**

لە (عدی کوڕی حاتم)ەوە هاتووە کەوا گوێی لێبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾، (عدی کوڕی حاتم) دەڵێت : پێم وت : (إنا لسنا نعبدهم . قال: أليس يحرمون ما أحل الله فتحرمونه؟ ويحلون لكم ما حرم الله، فتحلونه؟ " فقلت: بلى، قال : "فتلك عبادتهم) (رواه أحمد والترمذي وحسنه). واتە : ئێمە ئەوانمان نەدەپەرست ! فەرمووی : ئایە ئەو شتەی خوای گەورە حەڵاڵی کردبوو ئەوان حەرامیان نەدەکرد و ئێوەش بە حەرامتان دەزانی و ئەوەی خوای گەورە حەرامی کردبوو ئەوان حەڵاڵیان دەکرد بۆتان و ئێوەش بە حەڵاڵتان دەزانی ؟ وتم : بەڵێ، فەرمووی : ئەوە پەرستنیانە).

- ﴿أَحۡبَارَهُمۡ﴾ : ئـەو زانایانـەی زانسـت و زانیاریـان فراوانـە، ﴿وَرُهۡبَٰنَهُمۡ﴾ : خواپەرستێکی لەخواترس.
- ((إنا لسنا نعبدهم)) : سـوژدەیان بـۆ نابـەین و کڕنۆشـیان بـۆ نابـەین و سەربڕینیان بۆ ئەنجام نادەین و نزریان بۆ ناکەین، بـەڵام پێغەمبـەر (ﷺ) بـۆی ڕوونکـردووەوە کـە لـە ماناکـانی پەرسـتن گوێڕایەڵییـە، ئەمـە بەندایەتیـەکی بەستراوە (مقيدة).

**مەسەلەکان :**

**یەکـەم :** تەفسـیری ئایەتەکـەی سـورەتی (النـور) : ﴿فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ﴾

**دووەم :** تەفسـیری ئایەتەکـەی سـورەتی (بـراءة) ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا﴾

**سـێیەم :** وریاکردنـەوە لـە مانـای عیبـادەت کـە (عـدي) ئینکـاری لـێ کـرد (پەرستنیان بە گوێڕایەڵی) .

**چوارەم :** ئیبن عەبباس نمونـەی بـە ئەبوبـەکر و عومـەر هێنایـەوە، و ئەحمـەد نمونەی بە سوفیان هێنایەوە .

**پێنجەم :** گـۆڕانی دۆخـەکان بـۆ ئـەم ئاسـتە، تـاکو وای لێهـاتووە لای زۆرینـە خەڵکی پەرستنی ڕاهیبەکان بووەتە باشترین کار، و ناویان نـاوە ویلایـەت، وە پەرستنی زاناکانیان زانست و فیقهە، پاشان دۆخەکە گۆڕا تا وای لێهات ئەوانە ئەپەرسـتێنرێن کـە تەنانـەت پیـاو چـاکیش نـین، و بەمانایـەکی تـر ئەوانـە دەپەرستێنرێن کە کەسانی نەزانن (جا پێویستە وریا بین و بزانین کـە شـەرعی خودا پێویستە بپارێزرێت، وە هەرگیز گوێرایەڵی کـەس نـەکرێت لـەحەرامکردنی ئەوەی خوا حەڵاڵی کردووە و حەڵاڵ کردنی ئەوەی خوا حەرامی کردووە).

## ٣٩/ بەشی ئایـەتی : ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ٦٠﴾

- ئەم بەشە پەیوەندیەکەی بەهێزی هەیە لەگەڵ بەشەکەی پێشوودا، چونکە ئەوەی پێشوو باسی حوکمی ئەو کەسەی تیادا بوو کە گوێرایەڵی زانا و فەرمانڕەوا دەکات لە حەڵاڵ کردنی ئەوەی خوا حەرامی کردووە یان حەرامکردنی ئەوەی خوا حەڵاڵی کردووە، وە ئەم بەشەش ئینکارکردنی تێدایە لە ئەو کەسانەی کە بیانەوێ داوەری ببەن بۆ لای جگە لەخودا.
- ﴿أَلَمۡ تَرَ﴾ : شێوازی پرسیارییە مەبەست لێی تەقریر و سەرسوڕمانە لە دۆخیان، وە دواندنەکەش لە گەڵ پێغەمبەرە (ﷺ).
- ﴿يَزۡعُمُونَ﴾ : نەیوت : (ئەوانەی باوەڕیان هێنا) چونکە ئەوان ئیمانیان نەهێنا، بەڵکو قسەلۆك ئەکەن و لە کاتێکدا ئەوان درۆزنن .
- ﴿وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ : شەیتان (جنس)ێکە مەبەست لێی شەیتانە مرۆڤ و جنۆکەکانە.
- ﴿أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا﴾ : ئەیانخاتە نێو گومڕایی دوور لە حەق هەنگاو بە هەنگاو.
- ﴿رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ﴾ : دەرخستن لە جێگایەکدا کە دەکرێت (ضمیر)ی بە کار بهێنایە لەبەر سێ هۆ :

١. ئەوانەی خۆیان بە ئیماندار ئەزانی دووڕوو بوون.

٢. ئـەم قسـەیە تـەنها لـەدەمی دووڕوو دەرئەچـێت، چـونکە ئیمانـداری ڕاستەقینە ئەبێت ملکەچ بێت بە بیٚ پشت لێکردن .

٣. وریاکردنەوە، چونکە ئەگەر قسـە بەیـەك شـێواز و نەسـتەق بێـت ڕەنگـە کەسەکە لێی بیٚ ئاگا و غافـڵ بێـت، و ئەگـەر شـێوازەکە گـۆڕدرا ئاگـادار ئەبێتەوە.

- **شیخ الاسلام – ڕەحمەتی خوای لـیٚ بێـت - ئەفـەرموێت :** ئـەم ئایەتانـە بەتـەواوەتی جێبـەجیٚ ئـەبێت بەسـەر جەماعـەتی تـەحریف و تـەئویل لـە صیفاتەکانی خوای گەورەدا، چونکە ئەوان ئـەڵێن : ئـەوان ئیمانیـان بـەخودا و پێغەمبەر (ﷺ) هێناوە، وە ئەگەر پێیان بوترێت : وەرن بـۆ لای ئـەوەی خـودا دایبەزاندووە و بـۆ لای ئـەوەی پێغەمبـەر (ﷺ) هێناویـەتی دەبـینی ئـەوان ڕوو هەڵئەگێڕنەوە، و ڕەتی ئەکەنەوە و ئەڵێن : دەڕۆیـن بـۆ لای فـلاَن و فـلاَن، وە ئەگـەر ئاگـادار بکرێنـەوە ئـەوا دەڵـێن : ئێمـە چـاکە و تـەوفیقمان ئـەوێت و دەمانـەوێت لـە نێـوان بەڵگـە عەقلّیـەکان و بەڵگـە بیسـتراوەکاندا (قورئـان و سوننەتدا) کۆبکەینەوە.

## بەڵگەی دووەم تا چوارەم :

١. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾

٢. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا﴾

٣. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾

- ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ﴾ : خراپەکاری لە سەر زەویدا دوو جۆرە:

١. خراپەکاریەکی هەست پێکراوی ماددی : وەکو رووخاندنی خانوو و خراپکردنی رێگاوبانەکان.

٢. خراپەکاریەکی مەعنەوی : ئەوەش بە سەرپێچی دەبێت، جا ئەمە لە گەورەترین خراپەکارییە لە سەر زەویدا روو دەدات.

- ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾ : ئەم بانگەشەکردنە لە پووچترین بانگەشەکانە، خوای گەورە دەتوانێت لەوەی خۆیان بە خۆیان دەڵێت گەورەتریان بە سەردا بهێنێت، جا ئەوانەی خراپەکاری ئەکەن لەزەویدا و بانگەشەی چاکەکاری ئەکەن، بە راستی هەر ئەوانە خراپەکارن نەك کەسانی تر.

- ﴿بَعْدَ إِصْلَاحِهَا﴾ : لە لایەن چاکەکارانەوە، هەر لەوەش وەستانە لە دژی بانگەوازی ئەهلی زانست و بانگەوازی سەلەف و ئەوانەی حوکم بە شەریعەتەکەی خوا دەکەن.

- ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ : پرسیارکردنەکە بۆ سەرزەنشتکردنە، واتە : ئایە هیچیان ناوێت جگە لە حوکمی جاهیلیەت؟ وشەی جاهیلیەتیش دوو مانا هەڵئەگرێت : ئەوەی پێش هاتنی پەیامی ئیسلام بێت، وە ئەوەی لەسەر جەهل و نەفامی بنیات ئەنرێت.
- ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا﴾ : هیچ کەسێك حوکمی باشتر نییە لە حوکمی ئەو، ئەمەش مانایەکی تەحەددا لە خۆ دەگرێت .

## بەڵگەی پێنجەم :

لە (عبداللە ی کوری عمرو) ەوە –رەزای خوای لێ بێت– هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (لا يؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعا لما جئت به) واتە : هیچ یەکێك لە ئێوە ئیمانەکەی تەواو و کامل نییە تاوەکو حەز و ئارەزووی شوێنکەوتەی ئەوە نەبێت کە من هێناومە)) قال النووي : حديث صحيح، رويناه في (كتاب الحجة) بإسناد صحيح

## بەڵگەی شەشەم :

(الشعبی) دەفەرموێت : ((كان بين رجل من المنافقين ورجل من اليهود خصومة، فقال اليهودي : نتحاكم الى مُحَمَّد (ﷺ)، عرف أنه لا يأخذ الرشوة، وقال المنافق : نتحاكم الى اليهود، لعلمه أنهم يأخذون الرشوة، فأتفقا أن يأتيا كاهناً من جهينة، فيتحاكما إليه، فنزلت : ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ الآية.

واتە : لە نێوان کابرایەکی دووڕوو و کابرایەکی جولەکەدا ناکۆکییەك روویدا، کابرای جولەکە وتی : داوەری دەبەینە لای (محمد) (ﷺ)، چونکە دەیزانی بەرتیل وەرناگرێت، کابرای دووڕوو وتی : داوەری دەبەینە لای جولەکە، چونکە دەیزانی ئەوان بەرتیل وەردەگرن، بۆیە رێك کەوتن لە سەر ئەوەی بچن

بۆ لای کاهینێك لە (جوهەینە) و داوەری ببەن بۆ لای ئەو، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ﴾ الآية

((وقيل : نزلت في رجلين اختصما،فقال أحدهم : نترافع الى النبي (ﷺ) وقال الآخر : الى كعب بن الأشرف، ثم ترافعا الى عمر، فذكر له أحدهما القصة، فقال للذي لم يرض برسول الله (ﷺ) أكذلك ؟ قال : نعم، فضربه بالسيف فقتله )).

واتە : وە دەڵێن : بە هۆی دوو پیاوەوە دابەزیوە کە ناکۆکی لە نێوانیاندا هەبوو، یەکێکیان وتی : بابەتەکە بەرز دەکەینەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وە ئەویتر وتی : بۆ لای (کعب بن الاشرف)، ئەمجار بابەتەکەیان بردە لای عومەر، یەکێکیان باسەکەی بۆ کرد، جا بەو کەسەی وت کە رازی نەبوو بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) : ئاوایە باسەکە ؟ وتی : بەڵێ، بۆیە بە شمشێر لێیدا و کوشتی ))

- ((لا يؤمن)) : واتە ئیمانێکی تەواوەتی و کامل، ئیللا مەگەر بە گشتی خۆشی نەوێت، ئەوا ئەو کاتە بێ ئیمانە .
- فەرموودەکە کۆمەڵێك لەزانایان بە لاوازیان داناوە، بەڵام ماناکەی ڕاستە.
- ((من المنافقين)) : ئەو کەسەیە ئیسلام دەرئەخات و لەناخەوە کوفری شاردووەتەوە.
- ((اليهود)) : ئەوانەن کە دراونەتە پاڵ ئاینی موسی، وە بەو ناوەوە ناویان لێنراوە چونکە:

١. چونکە وتیان ﴿إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ﴾ واتە : گەڕاینەوە.

٢. یان دراونەتە پاڵ باوکیان (یهوذا).

- ((الى محمد (ﷺ))) : وەکو وەصفی پێغەمبەر (ﷺ) ناوی نەهێناوە، چونکە ئەوان باوەڕیان بە پەیامەکەی نییە.
- ((الرشوة)) : بەرتیل : ئەو بڕە پارەیەیە کە ئەدرێت بە مەبەستی گەیشتن بەشتێك.

## مەسەلەکان:

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (النساء) کە یارمەتیدەرێکە بۆ تێگەیشتن لە مانای (تاغوت) : ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾

**دووەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (البقرة) : ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ﴾ (ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا دووڕوویی فەساد و خراپەکارییە لەسەر زەویدا چونکە لە باسی دووڕووەکاندا هاتووە، وە فەسادیش هەموو سەرپێچییەکان دەگرێتەوە )

**سێیەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (الأعراف) : ﴿وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا﴾.

**چوارەم :** تەفسیری ئایەتی ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ وە جاهلییەت هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە لە گەڵ شەرعدا ناکۆك و جیاوازە، وە دراوەتە پاڵ جاهلییەت بۆ ئەوەی خەڵکی خۆی لێ دوور کاتەوە و نابوتی و ناشرینی روون ببێتەوە، چونکە لەسەر نەفامی و گومڕایی بنیات نراوە).

**پێنجەم :** ئەوەی کە ئیمامی (الشعبي) فەرمووی دەربارەی هۆی دابەزینی یەکەم ئایەتەکە.

**شەشەم :** تەفسیر و ڕوونکردنەوەی ئیمانی ڕاستگۆیانە و درۆ (چونکە ئیمانی ڕاستگۆ پێویستی بە ملکەچبوونی تەواوەتی و تەسلیم بوون هەیە بۆ حوکمی خودا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، وە ئیمانی درۆ پێچەوانەی ئەوەیە).

**حەوتەم:** چیرۆکەکەی (عومەر) لەگەڵ دووڕووەکەدا.

**هەشتەم :** هیچ کەسێك ئیمانی دەست ناکەوێت تاوەکو حەز و ئارەزووی شوێنکەوتەی ئەوە بێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێناویەتی .

## تاقیکردنەوەی بەشی حەوتەم ( ٩ بەشە )

**پرسیاری یەکەم : نیشانەی (×) لەشوێنی گونجاو دابنێ یان بۆشاییەکە پڕ بکەرەوە :**

١/ بەشی یەکەمی لە بەشی حەوتەم بەشی خۆشویستنە : **ڕاستە هەڵەیە**.

٢/ هەندێك لە خواپەرستەکان کۆمەڵێك گۆڕ و پیاوچاکانیان خۆش دەوێت و بە مەزنی دەزانن هەروەکو خۆشویستنی خودا یان زیاتر . **ڕاستە هەڵەیە**.

٣/ ئەگەر دڵ بە تەواوەتی خاڵی بێت لەخۆشویستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوا ئیمانی ( لاوازە ... نەفی ئەصڵی ئیمانە).

٤/ دەبێت پێغەمبەرمان (ﷺ) خۆش بوێت زیاتر لە منداڵ و دایك و باوك و هەموو خەڵکیش: **ڕاستە هەڵەیە**.

٥/ لە هۆکارەکانی بوونی شیرینی تامی ئیمان خۆشویستنە:

لەبەر خودا ....... لەبەر خزمایەتی.

٦/ نەهی مانای نەفی .............. لە خۆ دەگرێت ئەگەر نا ئەوا لەسەر ........ ئەگەر نا ئەوا لەسەر ...................

٧/ قسەی ئەهلی سوننە سەبارەت بەو دەقانەی هەڕەشە لە خۆ دەگرێت ئەوەیە کە .................................. ئایە ئەمە مانای ئەوەیە کە لە ماناکەی تێنەگەین ؟ بەڵێ نەخێر

٨/ ئەو کەسەی پێی وابێت کە جوولەکە و گاورەکان لەسەر ئاینێکن کە خودا پێی ڕازییە یان قەبولێەتی لە پاش هاتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوا لە ئیسلام دەرچووە و قورئانی بەدرۆ خستۆتەوە : **ڕاستە هەڵەیە**.

٩/ موسڵمان غەش لە کافر ناکات و ئامۆژگاری دەکات و بۆی ڕوون ئەکاتەوە کە لەسەر گومڕاییە و پێچەوانەی ئەوەیە کە موسی و عیسی فەرمانیان پێکردووە:

**ڕاستە هەڵەیە**.

١٠ / رق و کینە لە دوژمنانی خودا و دوژمنایەتی کردنیان مانای ئەوە نییە کە بەوەفا نەبین بەرانبەر پەیمانەکان لە گەڵیاندا : **ڕاستە هەڵەیە**.

١١/ ئەم وتەیە کێ فەرموویەتی :

(ئەگەر کەسێکی گاور ببینم ئەوا چاوەکانم دادەخەم چونکە پێم ناخۆشە بە چاوەکانم دوژمنی خوا ببینم) : ئیمامی ئەحمەد شیخ الاسلام ابن تيمية.

١٢/ ئەم وتەیە کێ فەرموویەتی : (هەرکەسێك ئیمانداریکی لەخواترس بێت ئەوە وەلی خوایە): ابن تيمية ابن القيم.

١٣/ ویلایەتی گشتی کە لە خوداوە بۆ بەندەکانی ئەوەیە کە هەموو موسڵمان و کافر و هەموو دروستکراوەکانی ئەگرێتەوە: **ڕاستە هەڵەیە**.

١٤/ ئەگەر مرۆڤ نوێژ بکات و ڕۆژوو بگرێت و ویلایەتی دوژمنانی خودا بکات ئەوا ویلایەتی خودای دەست ناکەوێت : **ڕاستە هەڵەیە**.

١٥/ نووسەر بەشی خۆشویستنی دوای بەشی ترس هێناوە، چونکە پەرستن تەرکیزی لەسەر ئەو دووانە کردووە : **ڕاستە هەڵەیە**.

١٦/ خەڵکی لە باسی ترسان لەخودا دابەش بوونە بۆ دوو لا و نێوەندێك :

**ڕاستە هەڵەیە**

١٧/ ترسی ڕاست ئەوەیە کە تەنها لەحەرامکراوەکان ئەتگێڕێتەوە، جا ئەگەر لەوە زیاتر بوو، ئەوا ئەتگەیەنێتە بێ هیوا بوون لە ڕەحمەتی خوا :

**ڕاستە هەڵەیە**.

١٨/ هەرکەسێك فاحیشە و خراپەکاری سەرخات ئەو ئەولیای شەیتانە :

**ڕاستە هەڵەیە**.

١٩/ هەرکەسێك لە خودا بترسێت هەموو شتێك لێی ئەترسێت، وە هەرکەس تەقوای خودا هەبێت هەموو شتێك دەیپارێزێت، وە هەرکەسێك لەجگە لەخودا بترسێت ئەوا لە هەموو شتێك ئەترسێت: **ڕاستە هەڵەیە**.

٢٠/ مەبەست لە نۆژەنکردنەوەی مزگەوتەکان بریتییە لە نۆژەنکردنەوەی :

(ماددی) مەعنەوی هەردووکیان.

٢١/ زۆر جار خوای گەورە ئیمان هێنان بەخۆی گرێداوە بە ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایی، چونکە وادەکات فەرمانەکان جێ بە جێ بکرێت : **ڕاستە هەڵەیە**.

٢٢/ بۆچی پێغەمبەری خوامان (ﷺ) خۆش ئەوێت ؟ :

١/ ................................... ٢/ ..............................

٣/ ................................... ٤/ ..............................

٢٣/ وە خۆشویستنی لە پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) چۆن دەبێت ؟:

١/............................ ٢/............................

٢٤/ (أقام الصلاة) مەبەستی ئیقامەتی :

واجیبە موستەحەببە هەردووکیان.

٢٥/ پشتبەستن (توکل) نیوەی دینە : ( ڕاستە هەڵەیە)، و ئەکرێت بوترێت : ( پشتم بەتۆ بەست تۆم کرد بەوەکیل پشتم بەخودا بەست پاشان تۆ هەمووی جگە لە یەکەم.

٢٦/ پشت بەستن بریتییە لە: ...................، وە دابەش ئەبێت بۆ

( سێ ... چوار ... پێنج) بەش.

٢٧/ پشتبەستن بە پیاوچاکان لە ئامادەنەبوو و مردووەکان شیرکی :

( گەورەیە بچووکە)

٢٨/ پشتبەستن بە کەسێك بۆ دابینکردنی ڕۆزی و بژێوی پشتبەستنی هەژاری نواندنە : (ڕاست و دروستە شیرکی بچووکە)

٢٩/ پێغەمبەر (ﷺ) گەورەی ئەوانەیە پشتیان بە خوا بەستووە (متوكلین)ـە، لەگەڵ ئەوەشدا ئازاری ( تووش ئەبێت ... تووش نابێت)، وە زیانی ( پێئەگات ... پێناگات)، چونکە خودای بەس بووە.

٣٠/ چی ئەوترێت لەکاتی بەڵاو تەنگانەدا؟ ..............................

٣١/ (ابـن عبـاس) لـەو کەسـانەیە کـە لەبـەنی ئیسـرائیلەوە هـەواڵی (وەردەگـرت وەرنەدەگرت)

٣٢/ ئەو کەسەی بێ هیوا ئەبێ لە ڕەحمەتی خـودا : ( گومڕایـە ... هیدایـەتی لـە دەست داوە ...... بزر و ون بووە نازانێت کەچی واجیبە بۆ خودا ... هەموویان.

٣٣/ تەئمین بوون لە مەکری خوا کەلێنێکە لە لایەنی (ترسـەوە ... ڕەجـاوە ) وە بێ ئومێدی لە رەحمەتی خوا کەلێنێکە لە لایەنی (ترسەوە ... رەجاوە ).

٣٤/ تاوانە گەورەکان ( ژمێردراوە ...سنورداره) و هەموویشی بەیەك پلەن (**ڕاســـتە هەڵەیـــە**.)، وە شـــیرکی بچـــووك گـــەورەترین تاوانـــە گەورەکانـــە (**ڕاســـتە هەڵەیـــە**.)، وە حـــوکمی ئـــەو کەســـەی تـــاوانی گـــەورەی کـــردووە (ئیماندارێکی ئیمان کەمە ... ئیماندارە بە ئیمانەکەی و فاسقە بـە تاوانەکـەی..... ئیماندارە ...کافرە ... یەکەم و دووەم)، وە ئەو کەسەی تاوانی گەورەی کردووە ( خۆشمـان دەوێـت ... ڕقمـان لێـی ئـەبێت ...... هێنـدەی ئـەوەی ئیمـانی هەیـە خۆشمان ئەوێت و هێندەی خراپەکەی ڕقمان لێی ئەبێت)، وە ئایە تاوانە گەورەکان بە کرداری چاك ئەسڕێتەوە؟ ( بـەڵێ ...نـەخێر)، وە ئایـە لـە کـاتی ئەنجامـدانی تاوانەکەی لەتەنیشـتی دائەنیشـین؟ ( بـەڵێ ... نـەخێر)، وە بـۆ هەنـدێ لـە تاوانـە گەورەکان تەوبە هەیە ( بەڵێ ... نەخێر).

٣٥/ بەشـــەکانی ئـــارامگرتن (ســـێ ... چـــوار ... پێـــنج) بەشـــە، وە نیشـــانەی خۆشویستنی خودا بۆ بەندە بەڵا بەسەرا هێنانە : ( ڕاستە ... هەڵەیە).

٣٦/ بەرزترین جۆرەکانی ئارامگرتن خۆگرتنە لەسەر ئەنجام نەدانی سەرپێچی:

**ڕاستە هەڵەیە**.

٣٧/ بەرهـەمی لەبـەرکردنی بابـەتی ئـارام گـرتن بریتییـە لـە خوێندنـەوەی لـەکاتی موصیبەتدا و خوێندنەوەی بە سەر ئەو کەسەدا بەڵاکەی بە سەردا هاتووە.

**ڕاستە هەڵەیە**.

٣٨/ پێویستە بەبوونی دوو ئاکار لە ئاکارەکانی کوفر لە کەسێکدا تا ببێتە کافر :

**ڕاستە هەڵەیە.**

٣٩/ پێویست بەبوونی دوو ئاکاری ئیمان ناکات لە کەسی کافردا تاکو ببێتە ئیماندار، وەکو حەیا: **ڕاستە هەڵەیە.**

٤٠/ هاتنی وشەی کوفر بە (نکرە) ( بەڵگەیە ... بەڵگە نییە) لەسەر دەرچوون لە ئیسلام.

٤١/ خەڵکی لەکاتی کارەساتدا چەند پلەن؟ : ( پێنج ... چوار ... سێ).

٤٢/ تووڕەبوون لە کاتی بەڵادا سەرئەکێشێ بۆ کوفر **ڕاستە هەڵەیە.**

٤٣/ تووڕەبوون بە (دڵ و زمان و ئەندامەکان... زمان و ئەندامەکان) دەبێت.

٤٤/ جیاوازی لە نێوان ئارامگرتن و ڕازی بووندا لە حوکم و قورسی کارەساتەکەدایە: **ڕاستە هەڵەیە.**

٤٥/ ڕەنگە ئیمانی مرۆڤ بە موصیبەتەکان زیاد بکات : **ڕاستە هەڵەیە.**

٤٦/ خودا خراپەیەکی دەوێت لەبەر حیکمەتێك، بۆیە کارەکە دەبێتە خەیر بە پێی ئەو حیکمەتەی لە خۆی گرتووە : **ڕاستە هەڵەیە.**

٤٧/ ناونراوە ڕۆژی هەڵسانەوە (قیامەت) بەهۆی هەڵسانەوەی :

خەڵکی لەگۆڕەکانیان ... شایەتەکان ... دادپەروەری ...هەمووی.

٤٨/ پێشخستنی سزا لە دونیادا باشترە بۆ خاوەنەکەی لە دواخستنی بۆ ڕۆژی دوایی : **ڕاستە هەڵەیە.**

٤٩/ پاداشتی ئەو کەسەی دڕکێك دەچێتە جەستەیدا وەکو پاداشتی ئەو کەسەیە شوێنێکی بشکێت : **ڕاستە هەڵەیە.**

٥٠/ پێویستە لە هەموو صیفاتەکانی خوادا هەبێت :

( سەلماندن ... وریابوون لە لێکچواندن و چۆنیەتی ... هەموویان) .

٥١/ تانەدان لەڕەچەڵەك واتە : ( عەیبدارکردنی ...نەفی کردنی ... هەموویان)

٥٢/ ڕیا شیرکی : ( بچووکە ... بچوکە وڕەنگە بگاتە گەورە )، وە ڕیاش ئەوەیە کەسێك کارێك بکات تاکو خەڵکی بیبینن و ئەوە ناگرێتەوە کەسێك ڕیای بکات تاکو خەڵکی بیبیسن و باسی بکەن : **ڕاستە هەڵەیە**

٥٣/ لەڕێگاکانی چارەسەرکردنی ڕیا بیرکردنەوەیە لە مردن و سەکەراتی مردن :

**ڕاستە هەڵەیە.**

٥٤/ دڵخۆشی مرۆڤ بەوەی کە خەڵکی بە پەرستنەکەی ئەزانن : ( ڕیایە ... ڕیا نییە)

٥٥/ دڵخۆشی مرۆڤ بە ئەنجامدانی گوێڕایەڵی : ( ڕیایە ... ڕیا نییە)

٥٦/ پیاوێك چاکەی کرد لەپێناو خوادا پاشان خودا خۆشەویستی و ستایشی ئەوی خستە دڵی ئیماندارانەوە : (بە ریاباز دەژمێردرێت ...... بە دڵسۆز دەژمێردرێت)

٥٧/ پارەی بەخشی لەپێناو خوادا تاکو پارەکانی زیاد بکات، چی ویستووە ؟ :

( دونیا بە کردەوەی ڕۆژی دوایی ... ڕۆژی دوایی بەکردەوەی ڕۆژی دوایی) .

٥٨/ ئەگەر موسڵمان لەوە ترسا بکەوێتە ناو ڕیاوە ئەوا ئەتوانێت واز لە پەرستنەکە بێنێت : ( دروستە ... شیرکی بچووکە)

٥٩/ ناونراوە بەندەی دینار : ( چونکە دەیپەرستێت ... بەهۆی ڕازیبوون و تووڕە بوونی لەپێناویدا وەکو بەندەیەکی)

٦٠/ ((طوبى)) واتە :

( باشترین حاڵ بۆ ئەم پیاوە ببێت ... درەختێکە لەبەهەشت)

٦١/ باسی دونیا ویستی مرۆڤ بەکردەوەکانی ترسناکترە لەباسی ڕیا :

**ڕاستە هەڵەیە.**

٦٢/ ئەوەی یەکێك لە نەیارەکان ئەیدەنە دادوەر پێی دەڵێن :

( دیاری کارکردنە ... بەرتیلە ... هەردووکیان)

٦٣/ جیاوازی نییە لە نێوان ڕیا لە (لا إله إلا الله) و ڕیاکردن لە سەدەقەدا:

**ڕاستە هەڵەیە.**

٦٤/ دەرهەم نەختینەیە لە :        (ئاڵتوون    ... زیو )

٦٥/ ئەوانەی شایەنی ئەوەن مەدح بکرێن خاوەن پارە و پلە وپایەکانن:

**ڕاستە    هەڵەیە**.

٦٦/ موسڵمان بەوەدا ئەناسرێتەوە کە دونیاویستە ئەگەر پێی بدرێت ڕازی ئەبێت و ئەگەر پێی نەدرێت تووڕە ئەبێت:    **ڕاستە    هەڵەیە**.

٦٧/ زاناکان خاوەنی ( زۆرلێکردن و جێبەجێکردنن    ڕینموێنی و دەلالەتن) و دەسەڵاتدارانیش ئەویترن.

٦٨/ نەزانراوە ئەبوبەکر و عومەر بە بۆچوون و ڕاکانیان پێچەوانەی دەقێکیان کردبێت: ( ڕاستە    هەڵەیە).

٦٩/ بەشەکانی شوێنکەوتنی زاناکان و دەسەڵاتداران لە سەرپێچی خوادا :

١/............................ و حوکمەکەی.......... ......................

٢/ ..................... و حوکمەکەی .............................

٣/ ............... .......... و حوکمەکەی ...............................

٧٠/ لاسایکردنەوەی کوێرانەو دەمارگیری مەزهەبی : (ویستراوە    نەویستراوە )

٧١/ ڕاهیب واتە:

(زانایەکی زانست فراوان        خواپەرستێکی زاهید) حەبریش ئەویترە .

٧٢/ لەو فەرمودەیەی کە لە (عدي)ـەوە گێڕدراوەتە بە بەحەرامکردنی حەڵاڵ دەستی پێکرد، چونکە ئەوە لە حەڵاڵکردنی حەرام گەورەترە، وهەردووکیان حەرامن : (**ڕاستە    هەڵەیە**)، وە شوێنکەوتنی زانا و دەسەڵاتداران لە (پێچەوانەی هاوڕابوونی    هەردووکیان) شەرعی خوادا، ئەوا لە بە خوا دانانی ئەوانە.

٧٣/ هەرکەسێك ڕقی لەوە بێت کە خودا دایبەزاندووە، ئەوا کوفرێکی :

(گەورەیە    بچوکە)

٧٤/ باوەڕبوون بە دروستی حوکم کردن بە جگە لەوەی خوای گەورە دایبەزاندووە:

(گەورەیە بچووکە)

٧٥/ باوەڕبوون بەوەی کە حوکمی جگە لەخودا وەکو حوکمی خودایە یان لەو باشترە کوفرێکی : (گەورەیە بچووکە)

٧٦/ باوەڕی وابوو کە حوکمی خوا باشترین حوکمە، بەڵام لەبەر ئەوەی رقی لە حوکملێکراوەکە بوو تاکو وای کرد کە حوکم بە جگە لەوەی خوای گەورە دایبەزاندووە بکات ئەوا : ( کافرە ستەمکارە فاسقە)

٧٧/ ﴿وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ جنسێکە کە شەیتانە (مرۆڤەکان جنۆکەکان هەردووکیان) ئەگرێتەوە.

٧٨/ بانگەشە دەکەن : (ئیمانن بەڵام درۆ ئەکەن

کردەوەکانیان و قسەکانیان بەدرۆی ئەخاتەوە هەردووکیان).

٧٩/ مەبەست لە موصیبەت : (شەرعییە دونیاییە هەردووکیان).

٨٠/ ملکەچی فەرمانی خودا و پێغەمبەر (ﷺ) نابێ و ڕەتی ئەکاتەوە :

(ئیماندار دووڕوو).

٨١/ گەورەترین خراپەکاری لەزەویدا خراپەکاری : (ماددیە مەعنەویە).

٨٢/ خراپەکاری پاش چاکەکاری مەزنتر و خراپترە لەوەی کە مرۆڤ لەسەر خراپەکاریەکەی بەردەوام بێت پێش چاکبوونەوە، هەرچەندە ئەوەی پێویست بێت چاکەکاری بێت دوای خراپەکاری : **ڕاستە هەڵەیە**

٨٣/ جاهلییەت (نەفامی) : (پێش هاتنی پێغەمبەرە(ﷺ)

ئەو نەزانینەیە کە لەسەر زانست بنیات نانرێت هەردووکیان )

٨٤/ بەرتیل حەرامە تەنانەت ئەگەر بگەیەتە مافێك کە لێی زەوت کراوە یان خراپەیەك لەخۆی دوور بکاتەوە: (ڕاستە هەڵەیە )

**هەشتەم : تەوحيدى ناو و صيفاتەكانى خوا ( يەك بەشە )**

**٤٠ / بەشى : كەسێك نكۆڵى بكات لە بەشێكى ناو و صيفاتەكان**

**نكۆڵى كردن بريتييە لە ئينكارى كردنە، وە ئەويش دوو جۆرە:**

**ئينكارى بەدرۆخستنەوە ( بێگومان كوفرە ) :** ئەگەر كەسێك ئينكارى ناوێك لەناوەكانى خودا يان صيفەتێك لە صيفاتەكانى بكات كە لە قورئان و فەرمودەدا جێگر و سابت بووبێت ئەوا بە كۆدەنگى زانايان كافرە، چونكە بەدرۆدانانى خودا و پێغەمبەرە (ﷺ)، بە كۆدەنگى زانايان كوفرێكە خاوەنەكەی لە دين دەرئەكات.

**ئينكاركردنى تەئويل :** ئينكارى ناكات بەڵام تەئويلى ئەكات بۆ مانايەكى پێچەوانە:

**ئەوەی لە زمانەوانى عەرەبيدا پاكانەيەكى نەبێت و جێى نابێتەوە، ئەوا پێى كافر ئەبێت: وەكو ئەوەی بڵێت :** دەستى خودا واتە ئاسمانەكان، ئەمە كوفرە، چونكە لە زمانەوانيدا هيچ پاكانەيەكى نييە و جێی نابێتەوە، وە نە مەبەستە شەرعيە ڕاستەقينەكەيە، جا ئەوە ئينكاريكەر و بەدرۆخەرەوەشە.

**ئەوەی لە زمانەوانيدا پاكانەی هەيە و جێی دەبێتەوە، ئەمە كافر نييە بەڵام لە خەتەرێكى گەورەدايە و ڕەددى ئەدەينەوە :** وەكو ئەوەی لەم ئايەتەدايە ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾ بڵێت مەبەست لە (يد لج دەست) نيعمەتە، ئەوا كافر نابێت، چونكە دەست لە زمانەوانيدا بەماناى نيعمەتيش دێت، بەڵام ڕەدد ئەدرێتەوە بە:

١. ئەوە پێچەوانەی ڕواڵەتی دەقەکە و کۆدەنگی پێشینانە و بەڵگەی لەسەر نییە.

٢. دەست بە چەند صیفاتێك وەصف کراوە کە ناکرێت نیعمەت و هێزی پێ وەصف بکرێت، وەکو (تثنية) کردنی بە دوو دانە و کۆکردنەوە و نوقاندن و کردنەوە، و ئەمانەش بۆ نیعمەت  و هێز نابن.

٣. خوای گەورە منەتی کرد بەسەر ئادەمدا کە بەدەستی خۆی دروستی کردووە، و ئەگەر دەست بەمانای نیعمەت یان هێز بوایە ئەوا هیچ تایبەتمەندییەك نییە بۆ ئادەم بە سەر دروستکراوەکانی تردا .

**یەکتاپەرستی ناو و صیفاتەکان :** بەتاك دانانی خودایە بەو ناوانەی ناو خۆی لێناوە و ئەو وەصفانەی خۆی پێ وەصف کردووە لە قورئانەکەیدا یان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، ئەوەش بە سەلماندنی ئەوەی بۆ خۆی سەلماندوویەتی و نەفیکردنی ئەوەی خۆی لەبارەی خۆیەوە نەفیکردووە، بەبێ لادان و پەکخستن و چۆنیەتی بۆ دانان و لێکچواندن.

**بۆچی وتی ( بەبێ لادان- تحريف ) و نەیگوت : ( بەبێ تەئویل )؟**

١.  چونکە ئەم وشەیە لە قورئاندا هاتووە، ئێمەش لێی لانادەین.

٢.  چونکە لە دادپەروەریەوە نزیکترە، چونکە ئەوانە ئەهلی لادانن نەك تەئویل.

٣.  دوورخستنەوەی خەڵکی لێیان، چونکە ئەهلی لادان (تەحریف) ئەگەر بە تەئویل وەصفیان بکەیت خۆشحاڵ ئەبن.

٤.  تەئویل هەمووی خراپ نییە، چونکە ئەوەی بەڵگەی لەسەر بێت ئەوا ڕاستە و وەرگیراوە، و ئەوەشی بەڵگەی لەسەر نەبێت ئەوا فاسیدە و ڕەت ئەکرێتەوە، بەڵام لادان (تحريف) هەمووی نەویستراوە و خراپە.

## بۆچی ( تمثیل )ـی نەفی کردووە بەڵام ( تشبیه )ـی نەفی نەکردووە؟

١. چونکە (تمثیل) ئەوەیە کە لە قورئاندا هاتووە و بەتەواوەتی ڕەت ئەکرێتەوە، بەپێچەوانەی (تشبیه)وە.

٢. چونکە نەفیکردنی (تشبیه) بە رەهایی راست و دروست نییە، چونکە هەموو بوونەوەرەکان بێگومان لە یەکچونێك لە نێوانیاندا هەیە وە هەر یەکەو بە تایبەتمەندییەکەی خۆی تایبەتمەند کراوە .

٣. خەڵکی لە مانای (تشبیه) ڕای جیاوازیان هەیە، هەندێکیان وایان داناوە کە سەلماندنی صیفاتەکان (تشبیه)ە.

## ( الاسم ) وەرگیراوە لە :

١. لە (سمو) واتە بەرزی، جا ناونراو بەناوەکەی بەرز ئەبێتەوە و ڕوون ئەبێت و دەرئەکەوێت.

٢. وە یان لە (سمة) واتە نیشانە، ئەوەش نیشانەی بۆ ئەو ناولێنراوە.

جیاوازی نێوان ناو و صیفەت:

ناو ئەوەیە کە خوای گەورە ناوی خۆی بەو ناوەوە ناوناوە و صیفەتیش ئەوەیە کە خوای گەورە بەو صیفەتەوە وەصفی خۆی کردووە .

## بۆچی تەوحیدی ناو و صیفاتەکان ئەخوێنین؟

١. تاکو یەکتاپەرستی جێ بە جێ بکەین، بەڵکو مرۆڤ یەکتاپەرست نابێت تاکو خوای گەورە بەتاك دانەنێت بەهەر سێ جۆرەکەی یەکتاپەرستی.

٢. چونکە لەوەدا ژیانی دڵەکانی تێدایە، وە مەزنترین شت بۆ ژیانی و شەرەفمەندترین زانست بریتییە لە ناسینی خودای گەورە.

٣. چوونە ناو بەهەشت، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت : (لله تسعة وتسعين اسماً، من أحصاها دخل الجنة) واتە :خوای گەورە نەوەت و نۆ ناوی هەیە، هەرکەسێك بیژمێرێتو لەبەری بکات ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە) .

٤. چونکە ئەمە ئەو بنەماو بنچینەیە کە پێشینان لەسەری بوون.

٥. بۆ ئەوەی نەکەوینە ناو ئەوەی کە کۆمەڵە گومڕاکان تێی کەوتن هەر لە (تمثيل) و (تعطيل)...هتد.

٦. تاکو پێی داوا لەخودا بکەین، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا﴾

**تەحریف : واتە : گۆڕینی ئەوەی پێویستە بۆ خودا بسەلمێنرێت**

**مەعنەوی :** وەکو ئەوەی کە ئەڵێت : دەستی خودا واتە نیعمەت.

**زارەکی :** وەکو گۆڕینی وشەی (اللّهُ) بۆ (اللّهَ) لەئایەتی : ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا﴾، بەوەش صیفەتی قسەکردنیان بۆ خودا ڕەتکردەوە بە بیانووی ئەوەی قسە ئەکات موسایە نەك خودا، وەڵامیش بۆ ئەوان، لێیان ئەپرسین لەبارەی ئایەتی : ﴿وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾، بەوەش وەڵامیان نامێنێت و حوججە و بەڵگەیان دەبڕێتەوە .

**لە کارخستن (التعطيل) : ئینکارکردنی ئەو ناو و صیفاتانەیە کەئەبێت بۆ خودا بسەلمێنرێت.**

لەکارخستنی جوزئی وەکو ئەشعەرییەکان کە هەندێك صیفات ئەسەلمێنن و هەندێکی تر ڕەت ئەکەنەوە.

لەکارخستنێکی گشتی وەکو جەهمییەکان کە خوای گەورەیان لە هەموو صیفاتەکانی داماڵی و لەکارخست .

**(التكييف) : بە وشەی (چۆن) لە بارەیەوە پرسیار ئەکرێت، بە چەند شێوەیەك دەبێت :**

**ئـەویش بــە زمــان دەرئــەبڕدرێت :** بەوەی شتێك بەزمانی وەصف بکات.

**بـە پەنجـەکانی :** بـەوەی بـە پەنجـەکانی وێنـەی شتێك بکێشێت .

**بە دڵ تەقدیری دەکـات :** بـەوەی کـە شـتەکان چۆنییەتیەکی بـۆ دابنـا لـە دڵیدا .

**دەلالەتەکانی ناو :**

**هاوتـاکردن (المطابقـة) :** ئـەویش دەلالـەتێتی لەسـەر هـەموو ماناکـانی

**لــە خــۆگرتن (التضمين) :** ئـەویش دەلالـەتـە لەسـەر بەشێکی ماناکەیەتی.

**(الالتـزام) :** ئـەویش دەلالەتـە لەسـەر شـتێك دەکات کە لە دەرەوەیەتی و پێویستە بۆی.

نمونـە بـۆ ئـەوە : (الخـالق–بەدیهێنـەر) بەڵگەیـە لەسـەر زاتـی خـودا بەتـەنها بـە هاوتاکردن (المطابقـة)، و لەسـەر صـیفەتی بـەدیهێنان بـە (التضـمين)، و بەڵگەیـە لەسەر زانست و توانا بە دەلالەتی (الالتزام)، هەروەکو خوای گەورە دەفـەرموێت : ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلۡأَرۡضِ مِثۡلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنَهُنَّ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عِلۡمَۢا ﴿١٢﴾﴾ .

## چۆن زانستی ناو و صیفاتەکان بخوێنین؟

١. زانست پەرستشە، بۆیە دەبێت لەسەر ئەو ڕێبازە بڕۆین کە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان لەسەری ڕۆیشتوون .

٢. پێویستە مەبەست لە خوێندن و فێربوونەکە بە مەزن دانانی خودا بێت، هەر بۆیە کاتێك ئیمامی مالیك پرسیاری (ئیستیوا)ی لێکرا، سەری دانواند و ئارەقەی کرد (چونکە لەبارەی مەزنێکەوە پرسیاری لێکراوە).

٣. لەبارەی شتانێکەوە پرسیار ناکەین کە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاریان لەبارەوە نەکردبێت.

٤. یەکەمجار باسی بەڵگە ئەکەین ئینجا باوەڕە دادەمەزرێنین، وە ئەوانەی دژایەتی ئەهلی سوننەت دەکەن سەرەتا باوەڕەکەیان دادەمەزرێنن ئەمجار بەدوای بەڵگەدا ئەگەڕێن بۆی، بۆیە بۆی نادۆزنەوە و لێیان تێك دەچێت و ناچار ئەکەونە ناو بیدعەوە.

٥. ڕێگاکەی ئیمامی شافیعی جێبەجێ ئەکەین کە ئەڵێت : (باوەڕ بهێنە هیدایەت ئەدرێیت)، و باوەڕ ئەهێنین بەخودا و ئەوەی لەخوداوە هاتووە، بەو شێوەی خودا ئەیەوێت و مەبەستێتی، و باوەڕ ئەهێنین بە پێغەمبەری خودا (ﷺ) و ئەوەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە، بەو شێوەی پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستێتی.

## هەندێك لەو بنەمایانەی پەیوەندیان بەناو و صیفاتەکانەوە هەیە :

١. **ناوەکانی خودا لە ژمارەیەی دیاریکراودا دیاری نەکراون** : بەڵگەش فەرموودەکەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە دەفەرموێت : ((أو استأثرت به في علم الغيب عندك)) واتە: یان لە عیلمی غەیبدا لای خۆت هێشتوتەتەوە)، بەڵام فەرموودەی : ((إن لله تسعة وتسعين اسماً)) واتە :خوای گەورە نەوەتو نۆ ناوی

هەیە)) مانای ئەوە نییە کەخودا جگە لەو ناوانە ناوی تری نییـە، بـەڵکو وەکـو ئەوەیە کەسێك بڵێ : سەد ئەسپم هەیە بۆ سەدەقە دامناوە.

٢. **ناوەکانی خودا عەلەم و وەصفن:** تەنها عەلەم نین، جا لەو لایەنەوە کـە بەڵگەیە لەسەر زاتی خودا عەلەمن، وە لەو لایەنەوە کە دەلالەت دەکات لەسەر صیفەتێك کە ئەم ناوە لە خۆی دەیگرێت ئـەوا صـیفاتن، بـە جیـاواز لـە گـەڵ ناوەکـانی ئێمـەدا، ڕەنگـە کەسـێك نـاوی (علـی–بـەرز) بێـت و لـە بێنـرخترین کەسەکان بێت.

٣. **ناوەکانی خوا هاومانای (مـورادیفی) یـەکترن و جیـاوازن :** جـا ناوەکـان هاومانان (مورادیفن) بە پێی ئەوەی هەموویان دەلالەت دەکەن بۆ یەك نـاونراو و یەك کەس کە زاتی خوای گەورەیە، جـا نـاوی (السـمیع و البصـیر و الحکـیم) هـەمووی دەلالـەت دەکـەن بـۆ یـەك زات کـە ئـەویش (الله)یـە، بـەڵام بـە پێـی ماناکەیان جیاوازن، چونکە مانای (الحکیم) جیاوازە لە گەڵ مانای (السمیع)دا.

٤. **هەر ناوێك لەناوەکانی خودا بەڵگەیە لەسەر زاتی خودا و ماناکەشی:** بۆیە پێویستە لەسەر ئێمـە وەکـو ناوێـك لـەناوەکانی خـودا بـاوەڕی پـێ بهێـنین، و بـاوەڕ بـەو صـیفاتەش بێـنین کـە ئـەو نـاوە ئەیگرێتـەوە، و بـاوەڕ بێـنین بـەو لێکەوتەو حوکمانەی کە ئەم صیفەتە ئەیگرێتەوە ئەگەر صـیفەتێکی (متعـدی) تێپەڕ بێت، بۆ نمونە : (سمیع–بیسەر) باوەڕمان وایـە کـە یـەکێك لـەناوەکانی خودا (سمیع)ـە، ئەوەش بەڵگەیـە لەسـەر صـیفەتی بیسـتن، وئـەم بیسـتنەش حوکم و شوێنەوار و لێکەوتەی هەیە کە ئەویش ئەویـە پێـی ئەبیسـتێت، بـەڵام ئەگەر ناوەکە تێپەڕ نەبێت (غیر متعدي) بێت وەکـو (عظـیم–مـەزن) و (حـي– زیندوو) و (جلیـل–شـکۆمەند)، ئـەوا نـاو و صـیفەتەکە ئەسـەلمێنین، وە هـیچ حوکمێکی تێپەڕی (متعدي) نییە.

٥. **صیفاتەکان لەناوەکان فراوان ترن :** چونکە هەر ناوێك صیفەتێك لە خۆ دەگرێت، بەڵام هەموو صیفەتێك ناوێك لەخۆ ناگرێت،خوای گەورە وەصف کراوە بە (کلام و إرادة) کەچی ناونانرێت بە (متکلم) و (مرید).

٦. هەموو ئەوە وەصفانەی کە خودا وەصفی خۆی پێکردووە لەسەر حەقیقەت و ڕاستیەکەیەتی، بەڵام خودا پاك ڕائەگرین لە لێکچواندن و چونییەتی.

**بەڵگەی یەکەم:**

**خوای گەورە دەفەرموێت :** ﴿وَهُمۡ يَكۡفُرُونَ بِٱلرَّحۡمَٰنِۚ﴾

- کافرەکانی قورەیش باوەڕیان بەو ناوە نییە، نەك بە ناونراوەکە کە (الله)یە چونکە ئەوان دانی پیائەنێن.
- وە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە هەر کەس ئینکاری ناوێك لەناوەکانی خودا بکات ئەوا کوفری کردووە.

**بەڵگەی دووەم:**

لە (صحیح البخاري) دا هاتووە کەوا (عەلی) فەرموویەتی : ((حدِّثوا الناسَ بما يعرفون، أتريدون أن يكذب الله و رسوله (ﷺ)؟!)) واتە : لە گەڵ خەڵکیدا بەوەی ئەوان دەیزانن بدوێن، ئایە دەتانەوێت خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بە درۆ بخرێنەوە؟!)).

- پێویستە کەسی بانگخواز سەیری عەقڵییەتی ئەو کەسانە بکات کە بانگەوازیان ئەکات و دابەزێتە ئاستی عەقڵی ئەوان، وە بەشێوەیەك قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکات کەبە عەقڵیان بگات، بەوەی هێواش هێواش بیانگوازینەوە تاکو فەرموودە قەبوڵ ئەکەن و لێی دڵئارام ئەبن، وە بانگیان ناکەین بە شتێك عەقڵیان پەی پێ نەبات .

## بەڵگەی سێیەم:

پێشەوا عبدالرزاق ریوایەتی کردووە لە (معمر)ەوە ئەویش لە (طاووس)ەوە لە باوکییەوە لە (ابن عباس)ەوە کەوا کابرایەکی هەڵچوو کاتێك فەرموودەیەکی بیست لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەربارەی صیفاتەکان، وەکو ئینکاری کردنێك لێی، بۆیە (ابن عباس) فەرمووی : ((ما فَرَقُ هؤلاء، يجدون رقة عند محكمة، ويهلكون عند متشابهه)) واتە : چی ئەوانەی ترساندووە، دڵنەرمییەك دەبینن لە موحکەمەکەیدا و کەچی لە متشابهەکەیدا بە هەلاکەتدا دەچن))

- ((ما فَرَقُ)): واتە ترسی ئەوانە لە چییە لە سەلماندنی ئەو صیفەتەی کە بەسەریاندا خوێندرایەوە و پێیان گەیشتووە، بۆچی بۆ خوای گەورەی ناسەلمێنن وەکو ئەوەی خودا بۆ خۆی سەلماندوویەتی و پێغەمبەریش (ﷺ) بۆی سەلماندووە؟



١/ بە قورئان ئەوترێت **کە (هەمووی موحکەمە)** بەبێ ئەوەی باسی موتەشابیە بکرێت : واتە هیچ کەموکورتی تێدا نییە، هەواڵەکانی درۆی تێدا نییە، وە حوکمەکانیشی ستەمی تێدا نییە، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا﴾

٢/ بە قورئان ئەوترێت کە **(هەمووی موتەشابیهە)** بە بێ باسی موحکەم : واتە لەیەك ئەچن لە ڕووی باشییەتی و کەمال و تەواوییەوە، و خۆی خۆی بەڕاست ئەخاتەوە و دژیەك نییە، ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُتَشَابِهًا﴾

٣/ بە قورئان ئەوترێت کە **(تیایەتی موحکەم و تیاشیەتی موتەشابیە)** : موحکەمیش لێرە واتە ئەوەی کە ماناکەی ڕوون بووەتەوەو ئاشکرا بووە، و موتەشابیهیش واتە ئەوەی ماناکەی شاراوەیە، ئەویش دوو جۆرە ڕەها و ڕێژەیی، ئەمەش بنیات دەنرێت لە سەر خوێندنەوەی وەستان و گەیاندن، لەو ئایەتەی کە دەفەرموێت : ﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ﴾ :

**ڕەها :** ئەوەی کە جگە لەخودا کەس نایزانێت، وەکو : چۆنیەتی صیفاتەکانی خودا، وە حەقیقەتی شتەکانی ناو بەهەشت.

**ڕێژەیی :** ئەوانەی لە زانستدا قووڵ بوونەتەوە ئەیزانن و لای جگە لەوان موتەشابیهە .

وە لە قورئاندا هیچ شتێك نییە لە ڕووی ماناوە لای هەموو خەڵکی موتەشابیهـ بێت، بەڵام هەڵە لە تێگەیشتندایە، هەر بۆیە ئیبن و عەبباس ئەفەرموێت : (أنا من الراسخين في العلم الذين يعلمون تأويله)، واتە : من یەکێکم لەو زانایانەی کە لێکدانەوەی ئایەتەکان دەزانم)، ئەمەشی بۆ خۆ هەڵکێشان نەگوتوە، بەڵام بۆ ئەوەی خەڵکی بزانێت کە لە کتێبەکەی خودادا هیچ شتێك نییە کەماناکەی نەزانرێت، چونکە ناکرێت لەم ئوممەتەدا، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) تا دوا دانەیان لەمانای قورئان تێنەگەن و ئایەتەکانی صیفاتی خودا بخوێننەوە و لەماناکەی تێنەگەن.

## بەڵگەی چوارەم:

(( ولما سَمعتْ قُريشٌ رسولَ الله (ﷺ) يذكرُ الرحمن أنكروا ذلكَ، فأنزلَ الله فيهم : ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ﴾ واتە : کاتێ قورەیش بیستیان کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی (الرحمن) دەکات ئینکارییان لێکرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دەربارەیان دابەزاند : ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ﴾

## مەسەلەکان:

**یەکەم :** هەرکەسێك نکۆڵی بکات لە بەشێك لە ناو و صیفاتەکانی خودا ئەوا بێ ئیمانە (واتە نەمان و نەبوونی ئیمان بە هۆی ئەمەوە).

**دووەم:** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی الرعد: ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ﴾.

**سێیەم:** وازهێنان لە قسەکردن بە شێوەیەك گوێگر لێی تێنەگات (وە بە شێوەیەك قسەیان لە گەڵ دەکەین کە لێی تێ بگەن و پەی پێ ببەن).

**چوارەم :** باسکردنی هۆکارەکە، کە سەردەکێشی بۆ بە درۆخستنەوەی خودا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، هەرچەندە ئەو کەسەی ئینکاری ئەکات مەبەستیشی نەبێت.

**پێنجەم:** قسەکەی ئیبن عەبباس بۆ کەسێکە کە شتێك لەوانە ئینکار بکات، و ئەویش بەهەلاکەتدا بردویەتی .

## پرسیارەکانی بەشی هەشتەم ( یەك بەشە )

**پرسیاری یەکەم : نیشانەی (×) لەشوێنی گونجاو دابنێ یان بۆشاییەکان تەواو بکە:**

١. ئینکاری کردنی ناو و صیفاتەکان دابەش ئەبێت بۆ : (دوو بەش   سێ بەش)، و جیاوازی نێوان ناو و صیفەت ئەوەیە کە ناو ئەوەیە خوای گەورە ناوی خۆی بەو ناوەوە ناوناوە و صیفەت ئەوەیە خۆی پێ وەصف کردووە :

**ڕاستە   هەڵەیە**

٢. ئینکار کردنی ناوێك یان صیفەتێك کە لە قورئان و فەرمودەدا هاتبێت کوفری :

گەورەیە   بچووکە.

٣. (الاسم) داڕێژراوە لە : بەرزی   تایبەتمەندی و نیشانە   هەردووکیان.

٤. ناوەکانی خودا : عەلەمن   وەصفن   عەلەم و وەصفن.

٥. ناوی بەندەکان : عەلەمن   وەصفن   عەلەم و وەصفن.

٦. دەلالەتەکانی ناو :

هاوتابوون (المطابقة)   لە خۆگرتن (التضمين)   ئیلتیزام   هەمووی

٧. ناوەکانی خودا : هاومانان   جیاوازن   هاومانا و جیاوازن

٨. ناوەکانی خودا : (دیاریکراون   دیاری نەکراون) لە ژمارەیەکی دیاریکراودا.

٩. صیفاتەکان لەناوەکان زۆرترن، چونکە هەموو ناوێك صیفەتێك لەخۆ دەگرێت :

**ڕاستە   هەڵەیە**

١٠. چەندین صیفەت هەن لەخودا ئەنرێت و لە ناوەکانیشیدا نییە : **ڕاستە   هەڵەیە**

١١. نەفیکردنی (التمثيل) باشترە لە نەفیکردنی (التشبيه): **ڕاستە   هەڵەیە**

١٢. هۆکارەکانی خوێندنی ناو و صیفاتەکان:

١. ..........................................................................

٢. ..........................................................................

٣. ..........................................................................

٤. ...........................................................................

٥. ...........................................................................

١٣- شێوازی خوێندن:

١. ......................................................................

٢. ......................................................................

٣. ......................................................................

٤. ......................................................................

١٤-واز ئەهێنین لەو قسانەی خەڵکی لێی تێناگەن هەرچەندە پێویستیشیان پێی بێت: **راستە هەڵەیە**

١٥- ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَٰنِ﴾

واتە:........................................................

١٦-دەقەکانی صیفات لە موحکەمەکانن کە لەڕووی ماناوە ماناکەی ڕوون بووەتەوە، وە موتەشابیهێکی ڕەهان کە جگە لەخودا هیچ کەسێك نازانێت لە رووی چۆنیەتیەوە : **راستە هەڵەیە**

١٧- واتای (موحکەم) ئەگەر بە تەنها باس بکرێت :

ئەوەی واتاکەی ڕوون بووەتەوە ئەوەی کەموکورتی تێدا نییە.

١٨- واتای (موتەشابیهـ) ئەگەر بەتەنها باس بکرێت :

ئەوەی کە لە ڕووی تەواوی و باشییەوە لەیەکتری ئەچێت: **راستە هەڵەیە**

١٩- موتەشابیهی ڕێژەیی لای هەموو کەسێك شاراوەیە، و ڕەهاش هەندێك کەس نایزانن و هەندێك ئەیزانن : **راستە هەڵەیە**

٢٠- لە قورئاندا هیچ شتێك نییە نەتوانرێت بگەین بە ماناکەی: **راستە هەڵەیە**

٢١- پێویستە لەسەر بانگخواز سەیری عەقڵی ئەوانە بکات کە بانگەوازیان ئەکات و دابەزێتە ئاستیان: **راستە** **هەڵەیە**

٢٢- لەقورئاندا هیچ شتێك نییە لە ڕووی ماناوە لەسەر هەموو خەڵکی موتەشابیە بێت : (**راستە** **هەڵەیە**) بەڵام بە نیسبەت ڕاستیەکانیشەوە، ئەوەی خوای گەورە هەواڵی داوە دەربارەی کاروباری غەیبی ئەوا موتەشابیهە لە لای ( هەندێ کەسەوە هەموو خەڵکی ).

٢٣- بۆچی ئیبن عەبباس فەرمووی : (من یەکێکم لەو زانایانەی لێکدانەوەی ئایەتەکان دەزانم) ؟ :.............................................. .

٢٤- لە خراپترین قسەکانی ئەهلی بیدعە ئەوەیە کە ئەڵێن ئایەتەکانی صیفات لەماناکەی کەس تێناگات، چونکە بەنەزان دانانی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان و بەدرۆخستنەوەی قورئان و دەمدرێژی فەیلەسوفەکانی تێدایە : راستە هەڵەیە

٢٥- لە نیشانەکانی ئەهلی باتڵ ئەوەیە کە موحکەم وەرئەگرن و ئینکاری لە موتەشابیە ئەکەن: **راستە** **هەڵەیە**

٢٦- لە بنەماکانی ناو و صیفاتەکان : ١/ .........................
٢/.............................. ٣/.......................

**پرسیاری دووەم: ئەم بۆ شایانەی خوارەوە بەم ووشانە پڕ بکەرەوە:**

**(التحریف ، تەئویل ، تعطیل ، موحکەم ، موتەشابیهـ ، تکییف ، جحود)**

١. .......... بریتییە لەئینکارکردن ئەوەش دوو جۆرە: بەدرۆخستنەوە و تەئویل.

٢. .....................ئەویش دەربڕینە بەزمان و ئەنجامدانە بە پەنجەکان و تەقدیرکردنە بەدڵ.

٣. .....................لە باشێتی و تەواویدا لەیەکتر ئەچن , و یەکتری پشتڕاست ئەکەنەوە.

٤. ........................گۆڕینی ئـەوەی کەئـەبێت بـۆ خـودا بسـەلمێنرێت , ئەویش یان زارەکییە یان مەعنەوییە.

٥. ........................ ئینکارکردنی ئەوەی کە بۆ خودا ئـەبێت بسـەلمێنرێت لەناو و صیفاتەکان (گشتی و جوزئی)

٦. ........................کەم وکورتی تیا نییە , درۆش لە هەواڵەکانیدا نییـە و ستەمیش لە حوکمەکانیدا نییە.

٧. ........................ئـەوەی بەڵگەیـەکی لەسـەر بێـت ئـەوا ڕاسـتە و وەرگیراوە , ئەگەر نا خراپە و ڕەت ئەکرێتەوە.

## نۆیەم : ( ئەو وشانەی نەهییان لێکراوە و ئەوانەی شیرك لە خۆ دەگرێت ) ( ٢٦ بەشە )

- ئەمە درێژترین بەشی کتێبەکەیە، چونکە لە نەریتی نووسەر وایە بەگشتی باسکردن پاشان وردەکاری.
- لەم بەشەدا باسی ئەو وشانەی کردووە نەهییان لێکراوە و ئەوانەی شیرك لە خۆ دەگرێت و هەندێك لە کردەوە شرکیەکانی کردووە، وە جەختی خستوەتە سەر شیرکی بچووك چونکە شاراوەیە، وە جەختیشی خستوەتە سەر کوفری نیعمەت چونکە زۆرە و باوە.

## ٤١/ بەشی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا﴾ ( کوفرکردنی نیعمەت بەشێکە لە شیرك )

موجاهید فەرموویەتی : وەکو قسەی کەسێك بلێت : ئەمە سامانی خۆمە و لە باوکمەوە بۆم ماوەتەوە )) وە (عون بن عبدالله) دەڵێت : (دەڵێن : ئەگەر فلان کەس نەبوایە ئەوا وا رووی نەدەدا)) وە ابن قتيبة دەفەرموێت : (( دەڵێن : ئەمە بە شەفاعەتی خوداکەمانە))

- نیعمەتەکان تاقیکردنەوەن، بەڵگەش : ﴿وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾
- دانەپاڵی نیعمەتەکانی خوای گەورە بۆ جگە لە ئەو کەموکورتی خستنە نێو یەکتاپەرستی : ١/ **الربوبية:** چونکە ئەو داویەتیە پاڵ هۆکارەکە کە گوایە ئەو بکەرەکەیە. ٢/ **پەرستن:** چونکە وازی لە سوپاسگوزاری هێناوە.
- ((دەڵێن : ئەگەر فلان کەس نەبوایە ئەوا وا رووی نەدەدا )): ئەگەر بەوە مەبەستیان لە هەواڵەکە بوبێت و هەواڵەکەش ڕاست و دروست بێت ئەوا کێشە نییە.

## ناز و نیعمەتەکان تاقیکردنەوەن، جا چۆن لێی سەلامەت بین؟

**پێش ئەوەی نیعمەتەکە بێت:** بێگومان ئەبێت لە خودا داوا بکرێت و دڵیش پێوەی پەیوەست بێت، هەندێك لە خەڵکی وا بیر ئەکەنەوە کە وەزیرێك یان سەرۆکێك بیناسێت و نیعمەتی بەسەردا برژێنێت، جا هەروەك چۆن بەهەشت تەنها لە خودا داوا ئەکرێت، ئاواش ڕزق و ڕۆزیش.

**دوای ئەوەی نیعمەتەکە دێت:** جا ئەبێت سوپاسی ئەو کەسە بکەیت کە نیعمەتەکەی پێ بەخشیوە بە دڵ و زمان و ئەندامەکان.

## بەشەکانی خەڵکی لە دانە پاڵی نیعمەتەکان:

**ڕاست و دروست:** بەشێوەیەك کە ئەیداتە پاڵ هۆکارێکی ڕاستی سەلمێنراو بێت لەڕێگەی شەرع یان هەستەوە، ئەمەش بەدوو مەرج دروستە:

- باوەڕی وانەبێت کەهۆکارەکە بەخۆی کاریگەرە.
- سوپاسکردنی نیعمەت بەخشەکەی بیر نەچێت.

**شیرکی بچووك:** بیداتە پاڵ هۆکارێکی ئاشکرا، بەڵام نە لە ڕێگەی شەرعەوە نە هەستەوە نەسەلمێنراو کە هۆکارە.

**شیرکی گەورە:** هۆکارێکی شاراوە بێت و بە هیچ شێوەیەك کاریگەری نەبێت.

## بەڵگەی دووەم:

لە پاش فەرموودەکەی (زید بن خالد) کە تیایدا هاتووە خوای گەورە فەرموویەتی : ((أَصْبَحَ من عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ ...)).تا کوتایی فەرموودەکە، لە پێشدا باسکرا – ابو العباس دەفەرموێت : ((ئەمەش لە قورئان و فەرموودەدا زۆرە کەوا خوای گەورە زەمی ئەو کەسانە دەکات کە نیعمەتەکان دەدەنە پاڵ جگە لە ئەو و جگە لە ئەو بەشدار دەکات لەو نیعمەتەدا)

هەندێ لە پێشین فەرموویانە : ((وەکو ئەوەی هەندێ کەس دەڵێت : بایەکی باش بوو و کەشتیوانەکەش زیرەك و لێهاتوو بوو، لە نمونەی ئەوانە کە لە سەر زاری زۆرێك لە خەڵکی دەبیستین )).

## مەسەلەکان:

**یەکەم :** تەفسیری زانینی نیعمەت و ئینکارکردنی (واتە: بەهەستەکانیان ئەزانن کە لە خوداوەیە کەچی ئینکاری لێ دەکەن بەوەی دەیدەنە پاڵ جگە لە ئەو).

**دووەم :** زانینی ئەوەی ئەم قسانە لەسەر زاری زۆر کەس بڵاوە (وەکو ئەوەی کاتێ لە فرۆکە دادەبەزن).

**سێیەم :** ناونانی ئەم قسەیە بەئینکارکردنی نیعمەت (ئینکارکردنی بەوەی لە لایەن خوداوە پێی بەخشراوە نەك ئینکارکردنی بەوەی بوونی نەبێت، چونکە ئەوان دەیزانن و هەست بە بوونی دەکەن).

**چوارەم:** کۆبوونەوەی دوو دژ بەیەك لە یەك دڵدا (زانین و ئینکارکردن).

## ٤٢/ بەشی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت : ﴿فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ( تەفسیری هاوتا )

- لە پەرستندا هاوتا بۆ خودا دامەنێن لەکاتێکدا باش دەزانن لە پەروەردگارێتیدا هاوتای نییە، وە ئەم ئایەتەش یەکەمین فەرمان و بانگەوازی تێدایە بۆ یەکتاپەرستی و یەکەمین نەهیکردنی تێدایە لە شیرك لە قورئانی پیرۆزدا.

((ئیبن عەبباس – ڕەزای خوا لە خۆی و باوکی بێت– دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت : (الانداد) بریتییە لەو شیرکانەی کە سوکترە لە خشەی مێروو لە لە سەر بەردێکی ڕەش لە تاریکی شەودا، ئەویش ئەوەیە کە بڵێت : سوێند بە خوا و سوێند بە ژیانی تۆ ئەی فلان و سوێند بە ژیانی من، وە بڵێیت : ئەگەر ئەم سەگە نەبوایە ئەوا دز دەهاتە سەرمان، وە ئەگەر ئەو مراوییە لە ماڵماندا نەبوایە ئەوا دز دەهاتە سەرمان، وە قسەی کەسێك بە هاوەڵەکەی دەڵێت : (ما شاء الله وشئت) وە قسەی کەسێك : ئەگەر خوا و فلان نەبوایە، فلان کەسی تێدا مەکە، ئەمە هەمووی شیرکی تیادایە )) رواه ابن أبي حاتم.

- ((أخفى منْ ...)): ئەمەش ئەو پەڕە لە شاراوەییدا، جا ئەگەر شیرکی ناو دڵی مرۆڤەکان لەوە شاراوەتر بێت، ئەوا داواکارین لەخودا یارمەتیدەرمان بێت بۆ ڕزگاربوون لێی.

### بەڵگەی دووەم:

(عومەری کوڕی خەتتاب) ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەوا فەرمویەتی: ((من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك). واتە: هەر کەسێ سوێندی بە غەیری خوا خوارد ئەوا کوفری کردووە یان شیرکی بۆ خوای گەورە ئەنجام داوە.)) رواه الترمذي وحسنه وصححه الحاكم.

## بەڵگەی سێیەم:

ئیبن مەسعود فەرموویەتی : (لأن أحلف بالله كاذباً، أحب إلي من أن أحلف بغيره صادقاً) واتە : ئەگەر سوێند بە خوا بخۆم لە کاتێکدا تێیدا درۆزن بم، پێم خۆشترە لەوەی کە سوێند بخۆم بە جگە لە خوا و تێیدا راستگۆ بم)).

- ((كفرَ أو أشركَ)): کوفر یان شیرکی گەورەیە ئەگەر پێی وابێت ئەوەی سوێندی پێی خواردووە لە گەورەیی و مەزنیدا هاوتای خوای گەورەیە ، ئەگەرنا شیرکی بچووکە.
- ئیبن مسعود نە حەزی لەوەیە نە ئەویتر، بەڵام خراپەی شیرك گەورەترە لە خراپەی درۆ، چونکە خودا لە شیرك خۆش نابێت.

## بەڵگەی چوارەم:

لە (حوزەیفە)وە ریوایەت کراوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەوا فەرموویەتی : (لا تقولوا : ما شاء الله وشاء فلان، ولكن قولوا : ما شاء الله ثم شاء فلان) (رواه أبو داود بسند صحيح) واتە : مەڵێن : خوا و فلان ویستیان لە سەر بوو، بەڵکو بڵێن : خوای گەورە ویستی لەسەر بوو ئەمجار فلان)).

## بەڵگەی پێنجەم:

لە (ئیبراهیمی نەخەعی)یەوە گێڕدراوەتەوە کەوا پێی ناخۆش بووە کەسێك بڵێت : (پەنا ئەگەرم بە خوا و تۆ ) وە دروستە بڵێت : (پەنا ئەگەرم بە خوا ئەمجار تۆ)، وە دەڵێت : (ئەگەر خوا نەبوایە ئەمجار فلان ) وە مەڵێن : (ئەگەر خوا و فلان نەبوایە) .

- ((ولكن قولوا)): شەریعەت ئەگەر دەرگای حەرامکراوەکان دابخات ئەوا دەرگای ڕێگە پێدراوەکان ئەکاتەوە، تاکو وازهێنان لە حەرام ئاسان بێت، هەروەها تاکو بەرزی و مەزنی شەریعەت بزانین.

## مەسەلەکان:

**یەکەم:** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (البقرة) لەباسی هاوتاکاندا.

**دووەم :** هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئایەتەی بۆ شیرکی گەورە دابەزیوە شیرکی بچووکیشی پێ گشتگیر دەکەن، (چونکە (الند) هاوشێوە و هاوتا دەگرێتەوە بە شێوەیەکی رەها یان لە هەندێ رووەوە) .

**سێیەم:** سوێند خواردن بەجگە لەخودا شیرکە ( بۆ نمونە دەڵێن : سوێند بە ژیانت، بە ژیانی من، سوێند بە زیممەتی تۆ، سوێند بە زیممەتی خۆم، بەگەردنم، بە ریشم، بە رووخسارم، بە پێغەمبەر (ﷺ)، بە شەرەفم، بە کەعبە، بە نوێژەکانت ، بە رۆژووەکانت، بە تەمەنت، سوێند بە یارمەتێکانت، یان کەسێك لە سوێندەکانیدا دەڵێت : ئەو جولەکەیە یان گاورە یان کافرە ئەگەر ئەو کارەی کردبێت ))

**چوارەم:** ئەگەر بەڕاستەوە سوێند بە غەیری خوا بخوات ئەوا لە سوێندی (غموس) گەورەترە (سوێندی (غموس) : بریتییە لەوەی سوێند بە خوا دەخوات بە درۆوە بۆ ئەوەی ماڵی موسڵمانێك بە ناحەق بخوات).

**پێنجەم:** جیاوازی نێوان (و) و (ثم) لە گفتاردا ( چونکە پیتی واو یەکسانبوون لە خۆ دەگرێت ئەویش دەبێتە شیرك، بەڵام (ثم – پاشان) ریزبەندی و (تەراخی) لە خۆ دەگرێت و نابێتە شیرك، من لە پەنای خوا و پەنای تۆدام، من لە پاراستنی خوا و پاراستنی تۆدام، کێم هەیە ئیللا خوا و تۆ نەبێت، پشتم بە خوا و تۆ بەستووە، ئەمە لە خوا و تۆوەیە، خوام هەیە لە ئاسمان و تۆم هەیە لە سەر زەوی، من بۆ لای خوا و تۆ تەوبە دەکەم )

## ٤٣/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی ئەوانەی قایل نابن بە سوێند خواردن بە خوا (یەکێکە لە تاوانە گەورەکان)

کەسی سوێندخۆر ئەوەیە کە سوێند دەخوات لەسەر شتێك، بە مەزندانانی ئەوەی سوێندی لە سەر دەخوات، بە مەبەستی دووپات کردنەوەی، جا قایل نەبوون بە سوێند خواردن بە خوا بەڵگەی بەکەم زانینی گەورەیی خوایە، ئەمەش لە گەڵ کەمالی تەوحیددا یەك ناگرێتەوە.

### بەڵگەی یەکەم :

لە (ابن عمر)ەوە ریوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **(لا تحلفوا بآبائكم، من حلف بالله فليصدق، ومن حُلف له بالله فليرضَ، ومن لم يرضَ فليس من الله)** (رواه ابن ماجه بسند حسن) واتە: سوێند بە باوکتان مەخۆن، وە هەرکەسێك سوێندی بە خوا خوارد با راستگۆ بێت، وە هەرکەسێك سوێندیان بۆ خوارد بە خوای گەورە با رازی بێت، وە هەر کەسێك رازی نەبێ ئەوا خوای گەورە لێی بەرییە).

### بەشەکانی قایل بوون بە سوێند خواردن

**شەرعی :**

پێویستە رازی بێت بە سوێند خواردن بە خوا ئەگەر سوێندێك رووبەرووی کەسی تۆمەتبار کرایەوە، بە پێی حوکمی شەرعی.

**هەستپێکراو :**

ئەوەی سوێندی بۆ دەخورێت یەکێکە لەم پێنج حاڵەتە :

١. بزانێت کە درۆ دەکات، ئەوا لەسەری نییە باوەڕی پێ بکات .
٢. درۆکەی لای پەسەندتر و زیاتر بێت، ئەوا لەسەری نییە باوەڕی پێ بکات .
٣. درۆ و راستی لا یەکسان بێت، پێویستە باوەڕی پێ بکات.
٤. راستەکەی لا پەسەندتر و زیاترە، پێویستە باوەڕی پێ بکات .
٥. بزانێت راستگۆیە، پێویستە باوەڕی پێ بکات .

## مەسەلەکان :

**یەکـــەم :** نـەهیکراوە لـە سـوێند خـواردن بـە باوکـان ( وە نەهییەکـەش بـۆ حەرامبوونە)

**دووەم :** فەرمان کراوە بەو کەسـەی بـە خـوای گـەورە سـوێندی بـۆ دەخورێـت رازی بێت .

**سێیەم :** هەڕەشە کراوە لەو کەسەی رازی نابێت .

**چوارەم :** فەرمان کراوە بـەو کەسـەی سـوێند دەخـوات راسـتگۆ بێـت، چـونکە راستی واجیبە ئەگەر سوێندیشی لە گەڵدا نەبێت، ئـەی چـۆنە ئەگـەر سـوێندی لە گەڵدا بێت؟

## ٤٤/ بەشی وتنی : خوا و تۆ ویستتان لەسەر بوو

## بەڵگەی یەکەم :

لە (قتيلة)وە ریوایەت کراوە کەوا کابرایەکی جولەکە هاتە خزمـەت پێغەمبـەری خــوا(ﷺ) و پێــی فــەرموو : (( إنكم تشركون ! تقولون : ما شاء الله وشئت، وتقولـون: والكعبـة ، فـأمرهم النـبي (ﷺ) إذا أرادوا أن يحلفـوا أن يقولـوا : ورب الكعبة، وأن يقولوا : ماشاء الله ثم شئت) رواه النسائي وصححه . واتە : ئێوە شـیرك بڕیـار دەدەن، دەڵـێن : (ما شاء الله وشئت) وە دەڵـێن : سـوێند بــە کەعبــە، جـا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێ کـردن ئەگـەر ویسـتیان سـوێند بخـۆن ئـەوا بڵێن : سوێند بە پەروەردگاری کەعبە و بڵێن : (ماشاء الله ثم شئت) .

**بەڵگەی دووەم :**

هەروەها ئیمامی (النسائي) لە (ئیبن عەبباس)ەوە ڕیوایەتی کردووە کەوا کابرایەك بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) فەرموو : (ما شاء الله وشئت) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی : (أجعلتني لله ندا ؟! قل : ما شاء الله وحده) واتە : منت کرد بە هاوتای خوا ؟ بڵێ : خوای تاك و تەنها ویستی لەسەر بوو) .

- **بۆ ( یهود ) بەم ناوەوە ناونراون ؟**

١/ چونکە وتیان : (هُدنا إليك) واتە : گەڕاینەوە بۆ لای تۆ .

٢/ چونکە باپیریان ناوی (يهوذا بن يعقوب) بوو .

- **فەرموودەی یەکەم چەند سوودێکی تێدایە لەوانە :**

١. پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئینکاری نەکرد لە جولەکەکە هەرچەندە مەبەستی زەمکردن بوو، چونکە ئەوەی وتی حەق و ڕاستی بوو .

٢. دروستی گەڕانەوە بۆ لای حەق، هەرچەندە ئەو کەسەی لە حەقەکە ئاگاداری کردینەوە خۆی حەق دۆست و ئەهلی حەق نەبێت .

٣. پێویستە لە کاتی گۆڕینی شتێکدا بۆ شتێکی نزیك خۆی بگۆڕدرێت .

- **چۆن هیچ کەسێك ئاگاداری ئەو کارە نەبوو ئیللا ئەم کابرای جولەکە نەبێت؟**

حیکمەتەکە تاقیکردنەوەی ئەو جولەکانەیە کە ڕەخنەیان لە موسڵمانان گرت، لە کاتێکدا خۆیان بە شیرکی گەورە شیرك بۆ خوای گەورە بریار دەدەن کەچی ئەو تاوانە نابینن .

- **(ما شَاءَ اللهُ وَحْدَهُ) :** ڕێنمویی کرد بۆ ئەوەی شیرکی لێ دەبچڕێت و نایهێڵێ، ڕێنمویی نەکرد بۆ وتنی: (ما شاء الله ثم شئت) بۆ ئەوەی ڕێگایەك بەرەو شیرك دەبیات بیبڕێتەوە هەرچەندە دووریش بێت، وەکو پاراستنێك بۆ تەوحید و بە ئەدەب بوون لە گەڵ خوادا .




## بەڵگەی سێیەم :

(ابن ماجه) ریوایەتی کردووە لە (طُفَيْلِ بْنِ سَخْبَرَةَ)ەوە –برای دایکە عائیشە لە دایکییەوە– دەفەرموێت : (( رَأَيْتُ كَأَنِّي أَتَيْتُ عَلَى نفرٍ مِنَ الْيَهُودِ، قُلْتُ : إِنَّكُمْ لأَنْتُمُ الْقَوْمُ لَوْلاَ أَنَّكُمْ تَقُولُونَ : عُزَيْرٌ ابْنُ اللهِ، قَالُوا : وإنكم لأَنتُمُ الْقَوْمُ لَوْلاَ أَنَّكُمْ تَقُولُونَ : مَا شَاءَ اللَّهُ وَشَاءَ مُحَمَّدٌ (ﷺ)، ثُمَّ مررت بنفرٍ مِنَ النَّصَارَى، فَقُلْتُ: إِنَّكُمْ لأَنْتُمُ الْقَوْمُ لَوْلاَ أَنَّكُمْ تَقُولُونَ : الْمَسِيحُ ابْنُ اللهِ، قَالُوا : وإنكم لأَنْتُمُ الْقَوْمُ لَوْلاَ أَنَّكُمْ تَقُولُونَ : مَا شَاءَ اللَّهُ وَشَاءَ مُحَمَّدٌ (ﷺ)، فَلَمَّا أَصْبَحتُ أَخبَرتُ بِهَا مَنْ أَخْبَرتُ، ثم أتيت النبي (ﷺ) فأخبرته، فقال : (هل أخبرتَ بها أحداً ؟ قلت : نعم، قال : فحمد الله وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ : (( أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ طُفَيْلاً رَأَى رُؤْيَا أَخْبَرَ بِهَا مَنْ أَخْبَرَ مِنْكُمْ، وَإِنَّكُمْ قلتم كَلِمَةً كَانَ يَمْنَعُنِي كذا وكذا أَنْ أَنْهَاكُمْ عَنْهَا، فَلاَ تَقُولُوا : مَا شَاءَ اللَّهُ و شَاءَ مُحَمَّدٌ (ﷺ)، ولكن قولوا : ما شاء الله وحده)) واتە : لە خەودا بینیم وەکو ئەوەی رۆیشتم بۆ لای کۆمەڵێك لە جولەکە، وتم : بە راستی ئێوە قەومێکی باش دەبوون ئەگەر نەڵێن : عوزەیر کوڕی خوایە، ئەوانیش وتیان : ئێوەش قەومێکی باش دەبوون ئەگەر نەڵێن : (ماشاء الله وشاء محمد(ﷺ))، ئەمجار بە تەنیشت کۆمەڵێکی گاوردا تێپەڕیم و وتم : بە راستی ئێوە قەومێکی باش دەبوون ئەگەر نەڵێن : مەسیح کوڕی خوایە، ئەوانیش وتیان : ئێوەش قەومێکی باش دەبوون ئەگەر نەڵێن : (ماشاء الله وشاء محمد(ﷺ))، کاتێ کە رۆژ بوویەوە، هەواڵم بە چەند کەسێك دا، ئەمجار هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەواڵم پێدا، وتی : ئایە هەواڵت بە کەس

داوە ؟ وتم : بەڵێ، ئەمجار ئەویش حەمد و سەنای خوای گەورەی کرد و وتی:
أما بعد : (طفيل) خەوێکی بینیوە و هەواڵی بە هەندێ کەس داوە، وە ئێوە
قسەیەکتان دەکرد چەند شتێك ڕێگرم بوو نەمهێشتان لێ بکەم، بۆیە چیتر
مەڵێن: (ماشاء الله وشاء محمد (ﷺ)) بەڵکو بڵێن : ما شاء الله وحده) .

- (يَمْنَعُنِي كذا وكذا) : شەرم و حەیا ڕێگری بوو، نەك لە ڕووی ئینکارکردنی باتڵ، بەڵکو ئەوەی ڕێگر بوو بۆی کە نەهی لێ بکات بە بێ ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێ بکات، وەکو مەی (عارەق) لێی بێ دەنگ بوو تاوەکو حەرام کرا .

**مەسەلەکان :**

**یەکەم :** زانیاری جولەکە دەربارەی شیرکی بچووك .
**دووەم :** تێگەیشتنی مرۆڤ ئەگەر ئارەزووی هەبێت.
**سێیەم :** ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێت : ( أجعلتني لله نداً؟)، ئایە ئەو کەسە چۆن دەبێت کە دەڵێت : (ما لي من ألوذ به سواك ....) هەروەها دوو بەیتەکەی پاش ئەوە ؟ (ئەمەش ئەو پەڕی کوفر و زیادەڕەوییە) .
**چوارەم :** ئەمە لە جۆری شیرکی گەورە نییە، بە بەڵگەی : ( يمنعني كذا وكذا).
**پێنجەم :** خەوی ڕاست و چاك بەشێکە لە پێغەمبەرایەتی .
**شەشەم :** ڕەنگە هۆکاری تەشریع دانانی هەندێ حوکمی شەرعی بێت (لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا).

## ٤٥/ بەشی : هەرکەسێك جوێن بە زەمانە بدات ئەوا ئازاری خوای گەورەی داوە (دانە پاڵی ڕووداوەکان بۆ ڕۆژگار).

- **(فقد آذى الله)** : مەرج نییە ئازاردان زەرەری لە گەڵدا بێت، ئەوەتا مرۆڤ ئازار دەبینێ بە بیستنی قسەی خراپ، بەڵام زەرەری پێ ناگەیەنێت، بۆیە خوای گەورە ئازاردانی بۆ خۆی سەلماندووە لە قورئاندا، بەڵام زەرەری نەفی کردووە.

### بەشەکانی جوێندان بە ڕۆژگار :

**شیرکی گەورەیە :** جوێن بە ڕۆژگار بدات بەوەی ئەو بکەرەکەیە، وەکو ئەوەی باوەڕی وا بێت کەوا ئەو کارەکان دەگۆڕێت بۆ خەیر و شەڕ .

**حەرامە :** جوێن بە ڕۆژگار بدات نەك وەکو ئەوەی ئەو بکەرە، بەڵکو باوەڕی وایە کەوا خوای گەورە خۆی بکەرە، بەڵام جوێنی پێ دەدات چونکە جێگەو کاتی ئەم شتە نەویستراوەیە .

**دروستە :** مەبەستی تەنها خەبەر بێت بە بێ ئەوەی لۆمەی بکات، وەکو ئەوەی بڵێت: گەرمای ئەمڕۆ ماندووی کردین، هەر لە نمونەی ئەوە، ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا يَوۡمٌ عَصِيبٌ ٧٧﴾

**بەڵگەی یەکەم و دووەم :**

١/ خـوای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ﴾

٢/ لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا هاتووە لـە (أبـو هريـرة)وە کـەوا پێغەمبـەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی : (قال الله تعالى: يؤذيني ابن آدم، يسب الدهر وأنا الدهر، أقلب الليل والنهار)واتـە : خـوای گـەورە فەرموویـەتی : بـەنی ئـادەم ئـازارم دەدات، جوێن بە رۆژگار دەدات لـە کاتێکـدا بـەڕێوەبردنی رۆژگـار بـە دەسـتی منە، من شەو و رۆژ دەگۆڕم و ئەمدیو ئـەودیوی دەکـەم )، وە لـە ریوایەتێکـدا هاتووە : ( لا تسبوا الدهر، فإن الله هو الدهر) واتە : جوێن بە رۆژگار مـەدەن، چونکە خوای گەورە خۆی رۆژگارە (واتـە : گـۆڕین و بـەڕێوەبردنی رۆژگـار بـە دەستی ئەوە).

- (حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا) : واتە ئەوەی ژیان و بوون بێت تەنها هـەر ئەمەیـە و رۆژی دوایی نییە .
- (وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ) : لەناوچـوون و هەلاکـەتی ئێمـە بـە دەسـتی خـوا و قەدەر نییە، بەڵکو ئەوەی بە هەلاکەتمانـدا دەبـات بەسەرچـوونی چـەندین سـاڵە بـۆ ئەوانـەی تەمـەنیان کـردووە و نەخۆشـی و خـەم و پـەژارە بـۆ ئەوانەی تەمەنیان کورتە، جـا ئـەوەی بـە هەلاکەتیانـدا دەبـات لای ئـەوان تەنها رۆژگارە (زەمانە)یە.
- (يؤذيني ابن آدم) : واتە : ئازارم پـێ دەگـات، جـا صـیفەتی ئـازار بـۆ خـوا سابتە، پێویستە ئێمەش بۆ خـوای بسـەلمێنین چـونکە خـوای گـەورە بـۆ خۆی سەلماندوویەتی، ئێمە شارەزای صیفاتی خوا نیمان لە خوای گـەورە زیاتر، بەڵام وەکو ئازاری دروستکراوەکان نییە .

- (يسب الدهر) : واتە جوێنی پێ دەدات و بە نابوتی دادەنێت و لۆمەی دەکات و لەعنەتی لێ دەکات، وە (الدهر) بریتییە لە زەمان و کات .
- (وأنا الدهر) : واتە بەڕێوەبەری ڕۆژگارە و فەرمانی ئەو بە دەستی خوایە، وەك (با) و شتیتر.

## ئایە (الدهر) یەکێکە لە ناوەکانی خوای گەورە؟

لە ناوەکانی خوای گەورە نییە، لەبەر چەند هۆیەك :

١. سیاق و میانەی ئایەتەکە ڕەددی دەکاتەوە، جا ئەگەر یەکێك بوایە لە ناوەکانی ئەوا بیروباوەڕی سەردەمی نەفامی تەواو بوو .
٢. هەروەها سیاق و میانەی فەرموودەکە ئەوە ڕەد دەکاتەوە .
٣. هەرکەسێك ڕۆژگار (الدهر) بکاتە خوا ئەوا دروستکراوێکی کردووەتە خوا .
٤. ناوەکانی خوای گەورە بەرز و پیرۆزن لەوپەڕی چاکی و کامل بووندایە، وە مانایان هەیە، وە ڕۆژگار (الدهر) جوانی تێدا نییە .
٥. ناوەکانی خوا هەمووی داڕێژراون (مشتق)ن، بەڵام الدهر ناوێکی (جامد)ە .
٦. نەهیکردنی دەربارەی جوێندان بە (ولاخ) و (با) و (تا) هاتووە لە شەرعدا.

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** نەهی کردووە لە جوێندان بە ڕۆژگار ( وەکو ئەوەی کەسێك دەڵێت : ڕۆژگار بێ هیوای کردین یان زەمانێکی خراپە، یان زەمانێکی ستەمکارە )

**دووەم :** ناوی لێناوە ئازار .

**سێیەم :** وردبەرەوە لەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت : (فإنَّ الله هو الدهر واتە : گۆڕین و بەڕێوەبردنی ڕۆژگار بە دەستی ئەوە).

**چوارەم :** ئەو ڕەنگە جوێنی پێبدات، هەرچەندە بە دڵ مەبەستیشی نەبێت .

**پێنجەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (الجاثية) : ﴿وَمَا يُهۡلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهۡرُۚ﴾

## ٤٦/ بەشی ناونان بە ( قازی قازییەکان ) و نمونەی ئەوانە ( نەهی لێکراوە )

واتە کەسێك ئەم ناوە لە خۆی بنات، یان رازی بێت جگە لە خۆی ئەم ناوەی لێ بنێن.

حوکمی ناونان بە قازی قازییەکان چییە ؟

یەکێکە لە تاوانە گەورەکان ئەگەر مەبەستی تەنها ناوەکە بێت .

شیرکی گەورەیە ئەگەر باوەڕی وابوو کەوا قازییە بە سەر هەموو قازییەکانەوە تەنانەت بەسەر خوای گەورەشەوە .

دروستە بەڵام باشتر وایە نەوترێت، ئەگەر تایبەتمان کرد بە کۆمەڵێکەوە یان شارێکەوە یان سەردەمێکەوە .

### بەڵگەی یەکەم :

لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا لە (أبو هريرة)ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (( إِنَّ أَخْنَعَ اسم عند الله : رجلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الأمْلاكِ، لا مَالِكَ إلاَّ اللَّهُ )) واتە : سوکترین ناو لای خوای گەورە، کابرایەکە ناوی خۆی ناوە خاوەنداری هەموو خاوەندارەکان، هیچ خاوەندارێك نییە تەنها خوا نەبێت))

سوفیان فەرموویەتی : وەکو شاهان شاه، وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە : ((أَغْيَظُ رَجُلٍ على الله يَوْمَ القيامَةِ وأَخْبَثُهُ) واتە : نابوترین کەس لای خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا و لە هەموو زیاتر خوای گەورە تووڕە بکات و لە هەموو ناوێك درۆتر بێت ) مەبەست لە (أخنع) واتە سوکترین .

- (أَخنَعَ) : بە دژی مەبەستەکەی خۆی سزا درا، وە نمونەی هەموو ئەو ناوانەی کە دەلالەت دەکەن لەسەر جەبەروت و دەسەڵاتداری و خۆ بە گەورە زانین .
- (أغيَظُ) : سەلماندنی (غیظ)ی تێدایە بۆ خوای گەورە جا ئەوە صیفەتێکە لایەقی خوای گەورەیە، وە ئەوەی ئاشکرایە کەوا لە تووڕەبوون توندترە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** نەهیکراوە لە ناونان بە (ملك الاملاك) خاوەنداری خاوەندارەکان .

**دووەم :** ئەوەی لە مانادا وەکو ئەوە ئەوا حوکمەکەشی وەکو ئەوە، هەروەکو سوفیان فەرمووی ( وەکو قازی قازییەکان، داوەری داوەرەکان، سوڵتانی سوڵتانەکان)

**سێیەم :** وریابوون و دیقەتدان لەو توورەبوونە و نمونەی ئەوانە، لە گەڵ دڵنیابوون لەوەی مەبەستی ماناکەی نەبووە بە دڵ.

**چوارەم :** وریابوون لەوەی کە ئەمە لە پێناوی خوادایە .

## ٤٧/ بەشی ڕێزگرتن لە ناوەکانی خوای گەورەو گۆڕینی ناوەکان لەو پێناوەدا بەشەکانی ناوەکانی خوای گەورە:

**تایبەتن :** ئەوەی بۆ هیچ کەسێك نابێت تەنها بۆ خوای گەورە نەبێت، بۆیە ئەمە هیچ کەسێك بەو ناوەوە ناو نانرێت، وە ئەگەر ناونرا ئەوا پێویستە بگۆڕدرێت، وەکو: الله، الرحمن، رب العالمین، لە نمونەی ئەوانە .

**ئەوانەی تایبەت نین :** دروستە جگە لە خوای گەورە بەو ناوەوە ناوبنرێت، وەکو : الرحیم و السمیع و البصیر، جا ئەگەر صیفەتێکی تێدا بە دی کرا، ئەوا نابێت ناوبنرێت، وە ئەگەر صیفەتەکەی تێدا بە دی نەکرا ئەوا دروستە ناو بنرێت وەکو ئەوەی عەلەمێکی رووتە و بەس .

**بەڵگەی یەکەم :**

له (أبو شريح)ەوە ریوایەت كراوە كەوا ئەو كونییەكەی (ابو الحكم) بووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( إن الله هو الحكم وإليه الحكم، فقال : إن قومي إذا اختلفوا في شيء أتوني فحكمت بينهم فرضي كلا الفريقين . قال : ما أحسن هذا! فما لك من الولد؟ قلت : شريح و مسلم وعبد الله، قال : فمن أكبرهم؟ قلتُ : شريح . قال : فأنت أبو شريح) رواه أبو داود وغيره واتە : خوای گەورە تەنها خۆی حەكەمە و حوكمیش بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە ) وتی : كەس و كارەكەم ئەگەر لە شتێكدا كێشەیان هەبوایە ئەوا دەهاتن بۆ لای من، منیش حوكمم دەكرد لە نێوانیاندا و هەردوو لا ڕازی دەبوون، فەرمووی : چەندە كارێكی باشە ! ئایە منداڵی چیت هەیە ؟ وتم : (شریح و مسلم و عبدالله)، وتی: كامیان لە هەموویان گەورەترە ؟ وتم : شورەیح، فەرمووی : تۆ باوكی شورەیحی ) .

كونییە ئەوەیە كە بە (أب) یان (أم) یان (أخ) یان (عم) یان (خال) دەست پێ دەكات، وە ئەم ناوەش كە بۆ ئەم پیاوە دانراوە ئەوەی تێدا بە دی دەكرێت كە مانای صیفەتەكە لە خۆ دەگرێت ئەویش (الحكم) ە، بۆیە لە گەڵ ناوی خوادا وەكو یەك بوون، نەك تەنها لەبەر ناوەكە وەكو عەلەمێك، بەڵكو لەبەر ناوەكە كە صیفەتەكەش لە خۆ دەگرێت، بەم پێیە دەبێتە هاوبەش لە گەڵ خوای گەورەدا، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە كونییەیەك ناوی نا كەوا پێویستە بەو كونییەوە ناو بنرێت، وە فەرمانی پێ نەكرد حەفتەمەكەی دووبارە بكاتەوە .

## مەسەلەكان :

**یەكەم :** ڕێزگرتن لە ناو و صیفاتەكانی خوای گەورە، هەرچەندە لە قسەیەكدا بێت كە مەبەستی نەبێت (لەوەی تایبەت بێت بە خوای گەورە یان مەبەست لێی بەدیكردنی صیفەتێك بێت تێیدا) .

**دووەم :** گۆڕینی ناو لەو پێناوەدا ( هەروەها ئەگەر بابەتێكی لە خۆ گرت ئەوا نابێت)

**سێیەم :** دیاریكردنی گەورەترین كوڕ بۆ كونییە (وە كونییە دروستە بۆ كەسێك دابنرێت، وە كەسی موشریك كونییەی بۆ دانانرێت)

## ٤٨/ بەشی : هەركەسێك گاڵتە بە شتێك بكات ناوی خوای تێدا بێت یان پێغەمبەری خوا (ﷺ) یان قورئان.

هەركەسێك گاڵتەی كرد بە خوای گەورە یان ئایەتە كەونییەكانی یان ئایەتە شەرعییەكانی یان بە پێغەمبەرانی ئەوا كوفری كردووە بە كوفری گەورە، چونكە گاڵتە كردن بەڵگەیە بۆ نەفی كردنی ئیمان بە نەفیكردنێكی گەورە، وە كوفریش دوو جۆرە :

**كوفری بەرنگاری و ناڕەزایی (معارضة) :** ئەمە لە هەمووی گەورەتر و توندترە، وەكو كوفری ئەبو جەهل و ئەبو لەهەب .

**كوفری پشتهەڵكردن (إعراض) :** نایەتە ناو دینی خوداوە، وە ڕووبەڕووی نابێتەوە نە بە بۆسەدانان بۆی و نە بە جەنگاندن

- کەسی گاڵتەجار کافرە بە کوفری بەرنگاری و نارەزایی، تاوانەکەی گەورەترە لەو کەسەی تەنها سوژدە بۆ بتێك دەبات، ئەمەش بابەتێکی زۆر مەترسیدارە، چونکە رەنگە وشەیەك خاوەنەکەی تووشی بەڵایەك بکات یان بە هەلاکەتیا بیبات کەچی ئاگای لە خۆی نییە، رەنگە مرۆڤێك وشەیەك بڵێت تووڕەیی خوای تێدا بێت و گوێی پێ نادات بە هۆیەوە دەکەوێتە ناو ئاگرەوە .

جا هەرکەسێك گاڵتە بە نوێژ بکات – هەرچەندە نوێژە سوننەتەکان بێت – یان زەکات یان رۆژوو یان حەج ئەوا کەسێکی کافرە بە یەکدەنگی زانایانی موسڵمانان، هەروەها کەسێك گاڵتە بە ئایەتە کەونییەکان بکات وەکو ئەوەی بڵێت : بوونی گەرما لە وەرزی زستاندا نەفامییە، یان بوونی سەرما لە وەرزی هاویندا نەفامییە، ئەمە کوفرە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەردەکات، چونکە خوای گەورە هەموو کردەوەکانی لەسەر حیکمەت بنیات ناوە، وە رەنگە ئێمە پێی نەگەین، بەڵکو بە دڵنیاییەوە پێی ناگەین .

- زانایان دوو بۆچوونیان هەیە دەربارەی ئەو کەسەی جوێنی بە خوا یان پێغەمبەرەکەی (ﷺ) یان کیتابەکەی داوە ئایە تەوبەی لێ وەردەگیرێ یان نا ؟ لە سەر دوو را :

**تەوبەکەی وەرناگیرێت و سوڵتان دەیکوژێت :** نوێژی لەسەر ناکرێت و دوعای خێری بۆ ناکرێت و لە جێگای دووری گۆڕستانی موسڵمانان دەنێژرێت، هەرچەندە وتی تەوبەی کردووە، چونکە ئەمە هەڵگەڕانەوەیە، ئەمەش کارەکەی زۆر قورس و گەورەیە سوود لە تەوبەکەی نابینێت .

**تەوبەکەی وەردەگیرێت بە چەند مەرجێك :**
١/ راستی تەوبەکەیمان بۆ دەرکەوێت .
٢/ ستایشی خوای پەروەردگار بکات .
٣/ وە خۆی بەری بکات لەوەی وتویەتی.
بەڵام ئەوەی جوێنی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوە ئەوا تەوبەکەی وەردەگیرێت و پێویستە لەسەر سوڵتان بیکوژێت لەبەر حەق و مافی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، جا ئەگەر کوژرا دەیشۆرین و کفنی دەکەین و نوێژی لەسەر دەکەین و لە گۆڕستانی موسڵماناندا دەینێژین .

## بەڵگەی یەکەم و دووەم:

١/ خـــوای گـــەورە فەرموویـــەتی : ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ﴾

٢/ لە (ابن عمر و محمد بن كعب و زيد بن أسلم و قتادة) وە (فـەرموودەکانیان هەندێکی تێکەڵی هەندێکی بووە) دەفەرموون: (( قَالَ رَجُلٌ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ : مَا رَأَيْنا مِثْلَ قُرَّائِنَا هَؤُلاءِ أَرْغَبَ بُطُونًا، وَلا أَكْذَبَ أَلْسِناً، وَلا أَجْبَنَ عِنْدَ اللِّقَاءِ – يعني: الرسول (ﷺ) وأصحابه القُرَّاء – فَقَالَ له عوف بن مالك : كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ مُنَافِقٌ، لأُخْبِرَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، فذهب عوف الى رسول الله (ﷺ) ليخبره، فوجد القرآن قد سبقه، فجاء ذلك الرجل الى رسول الله (ﷺ)وقد ارتحل وركـب ناقتـه فقال : يا رسول الله (ﷺ)! إنما كنا نخـوض ونلعـب ونتحـدث حـديث الركـب، نقطع به عنا الطريق، قَالَ ابن عمر : كأني أنظر إليه متعلقـاً بنسعة ناقة رسول الله (ﷺ) وإن الحجـارة تنكـب رجليه وهـو يقـول : إنما كنا نخوض ونلعب،فيقول لـه رســـول الله (ﷺ) : ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ﴾ ما يلتفت إليه وما يزيده عليه ..

واتە : (( کابرایەك لە غەزوەی تەبوکدا وتی : هـیچ کەسـێکمان نـەبینوە وەکـو ئەو قورئان خوێنانە لە هەموو کەسێك زیاتر حەزیان لە پڕکردنی سکیان بێت و لـە هــەموو کەسـێك درۆزنتربـن و لـە هــەموو کەسـێك ترسـنۆکتربن لـە کـاتی رووبەڕووبونەوەدا –مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی بوو– عوف ی کـوڕی مالك وتـی : درۆ دەکـەیت بـەڵام تـۆ کەسـێکی دووڕوویـت، دەبـێ ئـەم هەواڵـە بگەیەنمە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، جا عوف ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئەوەی هەواڵەکەی پێ بگەیەنێ، بینی قورئان پێشی کەوتووە و لەو بـارەوە ئایەت دابەزیوە، جا ئەو کابرایە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لـە کاتێکـدا ئەو سواری وشترەکەی بوو بـوو وە بـە ڕێ کـەوتبوو، وتـی : ئـەی پێغەمبـەری

خوا (ﷺ)، ئێمە تەنها گاڵتە و گەپمان دەکرد و ئەو قسانەمان دەکرد تـەنها بـۆ ئەوەی دووری ڕێگای پێ ببرین .

عبدالله ی کوری عومەر دەڵێت : هەر دەڵێی ئێستا لە پێش چاومە، کابرا خـۆی پەیوەسـت کردبـوو بـە ڕەشمـەی حوشـترەکەی پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ)، بەردەکان پێیان بریندار دەکردو دەیگوت : ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئێمـە گاڵتەو گەپمان دەکرد، کەچی پێغەمبەری خـوا(ﷺ) دەیفـەرموو: ﴿قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ﴾ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـەری نەدەکردە لایانەوە و لەوە زیاتر هیچی نەدەگوت .

- **(قُرَّائنا) :** مەبەستیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی بوو، سوێند بە خـوا درۆیان کرد .
- **(ولَكِنَّكَ مُنافِقٌ) :** بەمە دەزانرێت هەرکەسێ جوێن بە هاوەڵان بدات کافرە، چونکە تانەدان لەوان تانەدانە لە خوا و دینی خوا و پێغەمبەری خوا (ﷺ).
- **(بِنِسْعَةِ) :** ئەو پشتوێنەی باری وڵاخی پێ دەبەسترێت .
- **(تَنْكُبُ رِجْلَيهِ) :** دەیدا لە پێیەکانی .
- سوود بە دەستهاتووەکانی فەرموودەکە :

١. ڕوونکردنەوەی عیلمی خوای گـەورە بـەوەی کـە لـە ئایندەدا ڕوو دەدات، جا خوای گەورە دەزانێت لە پێشدا چی ڕوویداوە و لە ئایندەدا چی ڕوو دەدات .
٢. پێغەمبەری خوا (ﷺ) حوکم دەکات بەوەی لە لایـەن خـوای گـەورەوە بـۆی دابەزێنراوە .
٣. گاڵتـەکردن بـە خـوا و ئایەتـەکانی و پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) لـە گـەورەترین جۆرەکانی کوفرە .
٤. کەسی گاڵتەجار بە خوای گەورە کافرە .
٥. بە کارهێنانی توندی لە شوێن و جێگای خۆیدا .
٦. وەرگرتنی تەوبەی کەسی گاڵتەجار بە چەند مەرجێك .

## چەند ئاگادارییەك :

١. ئەو كەسەی ئامادەی جوێندانەكە دەبێت وەكو ئەو كەسەیە جوێنەكەی دابێت، ئیللا مەگەر كەسێك ئینكاری لێ بكات یان لە مەجلیسەكە هەڵسێت و بڕوات، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ﴾

٢. وریابە باسی قورئان و فەرموودە بكەیت بۆ ئەوەی خەڵكی پێ بكەنێت، وە لە كاتی باسكردنیاندا لە خوا بترسە .

٣. ئەگەر قسەكەی ئیحتمالی جوێنی تێدایە بوو ئەوا خاوەنەكەی ئاگادار دەكەینەوە ئەگەر تەوبەی كرد باشە ئەگەر نا ئەوە كەسێكی گاڵتەجارە .

٤. ئاگادار بە خۆبەزل زان و مەغرور مەبە، چونكە رەنگە چاكەیەك بتخاتە بەهەشتەوە و خراپەیەك بتخاتە ئاگرەوە، ئەوەتا ئەم پیاوە لە گەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بۆ غەزای تەبوك دەرچووە ئەمجار ئەوەی روویدا روویدا .

## مەسەلەكان :

**یەكەم :** كە ئەمەشە زۆر گەورەیە : هەركەسێك گاڵتە بە خوا و ئایەتەكانی و پێغەمبەرەكەی (ﷺ) بكات ئەوا كەسێكی كافرە .

**دووەم :** ئەمە تەفسیری ئایەتەكەیە بۆ هەركەسێك ئەو كارەی كرد جا ئیتر هەركەسێك بێت (دووڕوو بێت یان دووڕوو نەبێت)

**سێیەم :** جیاوازی لە نێوان دووزوانی و ئامۆژگاری لەبەر خوا و پێغەمبەرەكەی (ﷺ) (مەبەست لێی رێزگرتنی شەعائیری خوای گەورەیە).

**چوارەم :** جیاوازی لە نێوان ئەو لێبوردنەی کە خوای گەورە پێی خۆشە (کە چاکسازی تێدایە) وە لە نێوان ئەو توندییەی بەرانبەر بە دوژمنانی خوای گەورە دەکرێت (بەڵام بەکارهێنانی نەرم و نیانی هەندێ جار لە کاتی بانگەوازدا رەنگە شتێکی باش بێت)

**پێنجەم :** هەندێ داوای لێبوردن و بیانوو هەن وەرناگیرێت ( ئەگەر زانرا ئەو داوای لێبوردن و بیانووە باتڵ و نارەوایە).

## ٤٩/ بەشی ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِن بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي﴾

موجاهید دەفەرموێت : ( ئەمە بە هۆی کرداری خۆمەوەیە، وە منیش شایستەی ئەوەم) ئیبن عەبباس فەرموویەتی : (مەبەستی ئەوەیە –ئەم نیعمەتە– لە خۆمەوەیە) .

ئەگەر هەر کەسێك نیعمەتەکانی داوە پاڵ کار و کەسابەتی خۆی ئەمە جۆرێك لە جۆرەکانی شیرکی لە پەروەردگارێتی تێدایە، بەڵام ئەگەر دایە پاڵ خوای گەورە بەڵام وتی کەوا من شایستەی ئەوەم و ئەوەی خوای گەورە پێی بەخشیوم تەنها فەزڵێك نییە لە خواوە بەڵام من ئەهلی ئەو بەخشینەم، ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی خۆبەزل زانین لە لایەن بەندایەتییەوە.

## بەڵگەی دووەم و سێیەم :

٢/ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ﴾

قەتادە دەفەرموێت : بە هۆی شارەزای خۆمەوەیە کە جۆرەکانی کەسابەت دەزانم ) ئەوانیتر فەرموویانە : (خوای گەورە خۆی دەزانێت من شایستەی ئەوەم) ئەمە مانای قسەکەی موجاهیدە کە دەفەرموێت : ( لەبەر شەرەفی خۆم پێم دراوە)

٣/ لە(أبو هريرة)ەوە ڕیوایەت کراوە کەوا ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە فەرموویەتی :

((إنّ ثلاثَةَ من بَنِي إسْرائِيلَ : أبْرَصَ وأقْرَعَ وأعْمَى، فأراد الله أنْ يَبْتَلِيَهُمْ، فَبَعَثَ إلَيْهِمْ مَلَكاً، فأتَى الأَبْرَصَ، فقالَ : أيُّ شَيْءٍ أحَبُّ إلَيْكَ ؟ قالَ : لَوْنٌ حسنٌ، وَجِلْدٌ حَسَنٌ، ويذهب عني الذي قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ به، فَمَسَحَهُ، فَذَهَبَ عنه قذره، فأُعْطِيَ لَوْناً حَسَناً وَجِلْداً حَسَناً، فَقالَ: فأيُّ المالِ أحَبُّ إلَيْكَ ؟ قالَ : الإبِلُ أو البقر – شك إسحاق– فأُعْطِيَ ناقَةً عُشَرَاءَ فَقالَ : بارَكَ الله لَكَ فِيها .

قال : فأتَى الأَقْرَعَ، فَقالَ : أيُّ شَيْءٍ أحَبُّ إلَيْكَ؟ قالَ شَعْرٌ حَسَنٌ، ويَذْهَبُ عَنِّي الذي قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ به، فَمَسَحَهُ، فَذَهَبَ عنه، وَأُعْطِيَ شَعْراً حَسَناً، قالَ : فأَيُّ المالِ أحَبُّ إلَيْكَ ؟ قالَ البَقَرُ أو الإبل، فأُعْطِي بَقَرَةً حامِلاً، وَقالَ بارَكَ الله لَكَ فِيها .

فأتَى الأَعْمَى، فَقالَ : أيُّ شَيْءٌ أحَبُّ إلَيْكَ؟ قالَ : أن يَرُدَّ الله إلَيَّ بَصَرِي، فَأُبْصِرَ بِهِ النَّاسَ، فَمَسَحَهُ، فَرَدَّ الله إلَيْهِ بَصَرَهُ، قالَ : فأَيُّ المَالِ أحَبُّ إلَيْكَ؟ قالَ : الغَنَمُ، فأُعْطِي شاةً وَالِداً، فأَنْتَجَ هذانِ وَوَلَّدَ هذا، فَكانَ لِهذا وَادٍ مِنَ الإبِلِ ولِهذا وَادٍ مِنَ البَقَرِ ولِهذا وَادٍ مِنَ الغَنَمِ .

قال : ثمَّ إنَّهُ أتى الأَبْرَصَ في صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ، فَقالُ : رَجُلٌ مِسْكِينٌ، وابن سبيل، قد انقَطَّعَتْ بِهِ الحِبالُ في سَفَرِي هذا، فلا بَلاغَ لي اليوْمَ إلاّ بِاللَّهِ ثمَّ بِكَ، أسْأَلَكَ بالّذِي أعْطاكَ اللّوْنَ الحَسَنَ والجِلْدَ الحَسَنَ والمَالَ، بَعِيراً أتَبَلَّغُ بهِ في سَفَرِي، فَقالَ : الحُقُوقَ كَثِيرةٌ، فَقالَ لهُ : كأنِّي أعْرِفُكَ! ألَمْ تكُنْ أبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّاسُ فَقِيراً فأَعْطاكَ اللهُ المالَ ؟ فَقالَ : إنما وَرِثْتُ هذا المالَ كابِراً عَنْ كابِرٍ، قالَ : إنْ كُنْتَ كاذِباً فَصَيَّرَكَ اللهُ إلى ما كُنْتَ . قال : وأتى الأَقْرَعَ في صُورَتِهِ وهَيْئَتِهِ، فَقالَ لهُ مِثْلَ ما قالَ لِهذا وَرَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَ ما رَدَّ عَلَيْهِ هذا، فقالَ له : إن كُنْتَ كاذِباً فَصَيَّرَكَ اللهُ إلى ما كُنْتَ . قال : وأتى الأَعْمَى في صُورَتِهِ وهَيْئَتِهِ، فَقالَ : رَجُلٌ مِسْكِينٌ وابْنُ سَبِيلٍ، قد انقَطَّعَتْ بِيَ الحِبالُ في سَفَرِي، فلا بَلاغَ لي اليَوْمَ إلاَّ بِاللهِ ثمَّ بِكَ، أسْأَلُكَ بالّذِي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شاةً أتَبَلَّغُ بِها في سَفَرِي، فَقالَ : قَدْ كُنْتَ أعْمَى فَرَدّ اللهُ اليَّ بَصَرِي، فَخُذْ ما شِئْتَ ودع ما شئت، فَوالله لا أجهدكَ اليَوْمَ لِشَيْءٍ أخَذْتَهُ لِلَّهِ . فَقَالَ : أمْسِكْ مالَكَ، فإنَّما ابْتُلِيتُمْ فَقَدْ رَضِيَ اللهُ عَنْكَ، وسَخِطَ على صاحِبَيْكَ ) أخرجاه

واته : سێ کەس هەبوون لە بەنی ئیسرائیلدا، گەرێك و کەچەڵێك و نابینایەك، خوای گەورە ویستی تاقیان بکاتەوە، بۆیە فریشتەیەکی بۆ ڕەوانە کردن و ئەویش هات بۆ لای کابرای گەڕ و پێی گوت : چی شتێك لای تۆ لە هەموو شتێك خۆشەویسترە ؟( واتە : ئاوات بخوازە ) گوتی : ڕەنگێکی جوان و پێستێکی جوان و ئەوەی کە بە هۆیەوە خەڵکی بێزم لێ دەکەنەوە لە سەرم نەمێنی و چاك ببمەوە، گوتی : بە دەستەکانی سڕی و ئەویش چاك بووەوەو بێزێکەی نەما و ڕەنگێکی جوان و پێستێکی جوانی پێ بەخشرا، گوتی : : حەز لە چی جۆرە سامانێك دەکەیت ؟ وتی : وشتر، وشترێکی ئاوسی پێ درا (عشراء : ئەو وشترانەیە کە دە مانگ یان هەشت مانگ بە سەر ئاوس بوونیاندا تێپەڕیوە) ئەمجار فریشتەکە گوتی : خوای گەورە بەرەکەت بخاتە سامانەکەتەوە)) .

ئەمجار چوو بۆ لای کابرای کەچەڵ و گوتی : چی شتێك لای تۆ لە هەموو شتێك خۆشەویستره ؟ گوتی : قژێکی جوان و ئەوەی کە بە هۆیەوە خەڵکی بێزم لێ دەکەنەوە نەمێنێ، ئەویش بە دەستەکانی سڕی و ئەویش چاك بووەوەو قژێکی جوانی پێ بەخشرا، گوتی : : حەز لە چی جۆرە سامانێك دەکەیت ؟ گوتی : مانگا (چێل)، گوتی : ئەویش مانگایەکی ئاوسی پێ درا و گوتی : خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ناو سامانەکەتەوە .

ئەمجار چوو بۆ لای کابرای نابینا و گوتی : چی شتێك لای تۆ لە هەموو شتێك خۆشەویستره ؟ گوتی : خوای گەورە چاوەکانم بۆ بگێڕێتەوە و خەڵکی پێ ببینم، گوتی : ئەویش سڕی و خوای گەورە چاوەکانی بۆ گەڕاندەوە .

ئەمجار فریشتەکە بە کابرای نابینای گوت : حەز لە چی جۆرە سامانێك دەکەیت ؟ گوتی : مەڕ، گوتی : ئەویش مەڕێکی ئاوسی پێدا .

ئەو دووانەی پێشوو بەرهەمییان زیادی کرد و ئەویتریش بێچووی زۆری بوو، پاشان ئەمیان پڕ دۆڵێك وشتری بوو، وە ئەمیش پڕ دۆڵێك مانگای بوو، وە ئەویش پڕ دۆڵێك لە مەڕ .

پاشان هات بۆ لای کابرای گەڕ لە شێوە و وێنەی خۆی، گوتی : کابرایەکی هەژارم و هەموو ڕێگاکان لە سەفەرەکەمدا لێبڕاوە و هێچ دالدەیەکم نییە تەنها لای خوا و ئەمجار لای تۆ نەبێت بۆیە داوات لێ دەکەم لە بەر خاتری ئەو کەسەی ئەو ڕەنگە جوانە و ئەو پێستە جوانە و ئەو سامانەی پێداوی، وشترێکم پێ بدە بۆ ئەوەی لە سەفەرکەمدا بە کاری بهێنم، ئەویش گوتی : خەڵکی ڕەواتر زۆرن، وتی : دەڵێی من تۆ دەناسم ؟ ئایا تۆ کەسێکی گەڕ نەبوویت و خەڵکی بێزی لێت دەکردەوە، هەژار بوویت و خوا پێی بەخشی ؟ گوتی : بەڵکو من ئەم سامانەم لە باوباپیرە گەورە بەرێزەکانەوە و ئەوانیش

له گەورە بەرێزەکانەوە بۆم بە جێ ماوە، گوتی : ئەگەر درۆ دەکەیت ئەوا خوای گەورە بتگێڕێتەوە سەر حاڵی جارانت .
ئەمجار هات بۆ لای کابرای کەچەڵ لەسەر شێوەی خۆی، ئەوەی کە بە کابرای پێشوو گوت بە ئەمیشی گوت، ئەویش وەکو کابرای پێشوو وەڵامی دایەوە، ئەویش گوتی : ئەگەر درۆ دەکەیت ئەوا خوای گەورە بتگێڕێتەوە سەر حاڵی جارانت .
ئەمجار هات بۆ لای کابرای نابینا لەسەر شێوە و دیمەنی خۆی گوتی : کابرایەکی هەژار و رێبوارم و هەموو رێگاکانم لێبڕاوە لە سەفەرکەمدا و هیچ داڵدەیەکم نییە تەنها لای خوا و ئەمجار لای تۆ نەبێت بۆیە داوات لێ دەکەم لە بەر خاتری ئەو کەسەی چاوەکانتی بۆ گێڕایەوە مەڕێکم پێ بدە بۆ ئەوەی لە سەفەرکەمدا بە کاری بهێنم، ئەویش گوتی : من کەسێکی نابینا بووم و خوای گەورە چاوەکانی بۆ گەڕاندمەوە بۆیە هەرچی دەبەی ببە و هەرچی بە جێ دەهێڵی جێی بهێڵە، سوێند بە خوا هەرگیز رێگات لێ ناگرم لە بەر خوا هەرچی ببەی، بۆیە فریشتەکە گوتی : دەست بە سامانی خۆتەوە بگرە، بزانە کە ئێوە تاقیکرانەوە، جا خوای گەورە لە تۆ رازی بوو وە لە دوو هاوەڵەکەت پەست بوو )) .

- **لەم فەرموودە مەزنەدا چەندین پەند و عیبرەتی تێدایە، لەوانە :**

١. ئەو چیرۆکانەی لە قورئان و فەرموودەدا هاتوون بە مەبەستی پەند وەرگرتن و عیبرەت هاتوون .
٢. روونکردنەوەی توانا و دەسەڵاتی خوای گەورە بە چاککردنەوەی کەچەڵ و گەڕ و نابیناکە تەنها بەوەی کاتێ فریشتەکە دەستی هێنا بە سەریاندا .
٣. فریشتەکان دەتوانن خۆیان بگۆڕن، دەتوانن خۆیان بشوبهێنن لەسەر شێوەی مرۆڤ، بەڵام بە فەرمانی خوای گەورە بۆیان .
٤. فریشتەکان بریتین لە جەستە نەك تەنها رۆح یان مانا یان هێز .

٥. سوور بوونی راوییەکان بە گێڕانەوەی فەرمووده‌کە وەکو گفتەکەی خۆی.

٦. مرۆڤ پێویست و لازم نییە لەسەری رازی بێت بە قەزا لەسەر کراوەکە، بەڵکو پێویستە لەسەری رازی بێت بە قەزاکە کە کاری خوایە، جا جیاوازی هەیە لە نێوان کاری خوا و قەزا لەسەر کراوەکە، وە قەزا لەسەر کراوەکە دابەش دەبێتە دوو بەشەوە :

- بەڵا و موصیبەت کە ناچار نییە مرۆڤ پێی رازی بێت .
- ئەحکامە شەرعییەکان کە پێویستە پێی رازی بێت .

٧. دروستی دوعای پەیوەست کراو (مُعلَّق).

٨. دروستی تەنازول کردن بەرانبەر بە کەسی نەیار لە شتێکدا کە ئەو دانی پێدا نانێت و تەنازول ناکات لەبەر بەزاندنی کەسی نەیار.

٩. بەرەکەتی خوای گەورە کۆتایی نییە، بۆیە ئەمەیانە پڕ دۆڵێك وشتری بوو.

١٠. روونکردنەوەی ئەوەی سوپاسگوزاری هەر نیعمەتە و بە پێی خۆی دەبێت.

١١. دروستی خۆشوبهاندنی مرۆڤ بۆ سەر حاڵەتێك کە لە حەقیقەتدا وا نییە .

١٢. تاقیکردنەوە رەنگە گشتی و ئاشکرا بێت، وە چیرۆکەکەیان بەناوبانگە .

١٣. فەزڵی وەرع و زوهد، رەنگە خاوەنەکەی پەلکێش بکات بۆ شتێك ئەنجامەکەی سوپاسکراو بێت، وەکو کابرای نابینا.

١٤. سەلماندنی میرات لە ئوممەتەکانی پێش خۆماندا .

١٥. رازیبوون و تووڕەبوون و ئیرادە لە صیفاتەکانی خوای گەورەن، ئێمەیش بۆی دەسەلمێنین بە شێوەیەك لایەقی خۆی بێت .

١٦. هاوەڵبوون جاری وا هەیە بە کار دەهێنرێت لە هاوشێوەبوون لە شتێك لە شتەکاندا و مەرج نییە لە هەموو روویەکەوە وەکو یەك بن و بەرهاورد بکرێن .

١٧. تاقیکردنەوەی خەڵکی لە لایەن خوای گەورەوە بەو نیعمەتانەی پێیانی بەخشیوە .

١٨. یادخستنەوە رەنگە هەندێ جار بە شێوەی گفتار بێت یان کردار یان شێواز .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتی : ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنْ بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ﴾

**دووەم :** مانای : ﴿لَيَقُولَنَّ هَذَا لِي﴾ چییە ؟ واتە من شایەن و شایستەی ئەوەم .

**سێیەم :** مانای : ﴿إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي﴾ .

**چوارەم :** ئەو پەند و ئامۆژگارییە گەورە و مەزنانەی لەم چیرۆکە سەیردا هەیە ( لەوانە : جیاوازی لە نێوان کابرای کەچەڵ و گەڕ و نابینا، چونکە کابرای کەچەڵ و گەڕ نکۆڵیان کرد لە نیعمەتەکانی خوا لە پاش بەخشینی لە لایەن خوداوە وە پێش نیعمەتەکەش پەیوەست نەبوون بە خواوە، بەڵام کابرای نابینا دانی نا بە نیعمەتەکانی خوای گەورە بە سەریەوە لە پاش بەخشینی لە لایەن خوداوە وە لە پێش نیعمەتەکەش پەیوەست بوو بە خوداوە، (ابن القيم) دەفەرموێت : با وریابین بەوپەڕی وریایی لەخۆ دەرچوون بە هۆی وشەی ( أنا (من)، لي (هەمە)، عندي (هی خۆمە) ) چونکە بەم وشانە ئیبلیس و فیرعەون و قارون تووشی ئیبتیلا بوون، وشەی : ﴿أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ﴾ هی ئیبلیسە، وشەی : ﴿لِي مُلْكُ مِصْرَ﴾ هی فیرعەونە، وشەی : ﴿إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي﴾ هی قارونە، وە باشترین جێگا وشەی (أنا) ی تێدا بە کار هێنرابێت ئەوەیە کە بەندەی هەڵەکار و تەوبەکار و تاوانبار و ئەوەی داوای لێخۆشبوون دەکات و نمونەی ئەوانە، وە وشەی (لي) لەو جێگایەدا کە بەندە دەڵێت : تاوانم هەیە، کەتنم هەیە، بێ دەسەڵاتم، زەلیل و هەژارم بەرانبەرت، وە وشەی (عندي) لەو دواندنەی بەندەدایە کە دەڵێت : (أغفر لي جِدّي وهزلي وخطئي وعمدي، وكل ذلك عندي)

## ٥٠ / بەشی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت : ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحٗا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ﴾

### جۆری ئەو شیرکە لە ئایەتەکەدا مەبەستێتی :

**شیرکی گەورە :** باوەڕی وایە ئەو کەسەی ئەم منداڵەی پێ بەخشیون فلاَن وەلییە یان فلاَن پیاوچاکە یا لە نمونەی ئەوانە، چونکە دروستکردنیان داوەتە پاڵ جگە لە خوا .

**شیرکی بچووک :** سەلامەتی و پاراستنی منداڵەکە دەداتە پاڵ پزیشکەکان و نمونەی ئەوانە، چونکە نیعمەتەکەی داوەتە پاڵ هۆکار و (مُسَبِّب)ی لەبیر کردووە .

**شیرکی بچووک :** لە بەندایەتیدا بەوەی خۆشەویستی ئەو بخاتە پێش خۆشویستنی خوای گەورەوە لە گوێڕایەڵی خوا غافڵی بکات، ئایە چۆن ئەم منداڵە بکەینە هاوتا و هاوبەش بۆ خوای گەورە لە خۆشەویستیدا .

### بەڵگەی دووەم :

ئیبن حەزم دەفەرموێت : (زانایان یەکدەنگن لەسەر حەرام بوونی هەموو ناوێك بەندایەتی بۆ جگە لە خوا تێدا بە دی بکرێت، وەکو : عبد عمرو، عبدالكعبة، وە لە نمونەی ئەوانە، جگە لە عبدالمطلب ).

- دروست نییە ناونانی بەندایەتی بۆ جگە لە خوای گەورە، وە هەرکەسێ فەرموودەی : (أنا ابن عبدالمطلب) بکات بەڵگە، بە چەند وەڵامێگ رەددی دەدەینەوە:

١. ئەمە لە فەرموودە موتەشابیهەکانە، ئێمەش چەندین دەقی روونی مەحکەممان هەیە کە رەددی ئەوە دەتاوە .

٢. ئەم فەرموودەیە لە باس و بابەتی هەواڵدانە، نەك لە باس و بابەتی ئیقرار و دامەزراندن .

٣. پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ کەسێکی بەو ناوەوە ناو نەناوە، وە رێگای نەداوە بە هیچ کەسێك لە هاوەڵان ئەو کارە بکەن یان ئیقراری کردبێت .

٤. پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم ناوەوە ناسراو بوو، چونکە ئەگەر بیگوتایە: من کوڕی (عبدالله) م ئەوا کەس نەیدەناسی .

٥. پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی شتێك دەکات روویداوە و تەواو بووە و رابوردووە، وە (عبدالمطلب) مردبوو .

٦. عبدالمطلب ناو نییە، بەڵکو نازناوە (لقب)ە، وە ناوی تەواوی خۆی (شیبة الحمد)ە، وە باوکی ناوی (هاشم)ـە، باوکی بە منداڵی ناردی بۆ شاری مەدینە بۆ لای خاڵوانی لە (بەنی نەججار) بۆ ئەوەی فێر بێت و پەروەردە بێت، کاتێ مامەی (المطلب) هات بۆ مەدینە (شیبة الحمد) ی لە گەڵ خۆیدا بردەوە، کە گەیشتنە مەککە و لەبەر دوور و درێژی رێگاکە رەنگی تێك چوو بوو، خەڵکی وتیان : ئەم کۆیلەیە (عەبدە) هی کێیە ؟ وتیان : (عبدالمطلب)ە (وە بەندایەتی کۆیلایەتی کێشەی تێدا نییە) بۆیە ئەم ناوەی پێوەی پەیوەست بوو، بەم شێوەیە ئیشکال و گومانەکان نامێنن .

## بەڵگەی سێیەم :

(( وعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي الآيةِ، قَالَ: ((لَمَّا تَغشَّاهَا آدم حَمَلَتْ، فأتاهُمَا إبْلِيسُ، فَقَالَ: إِنِّي صَاحِبُكُمَا الَّذِي أَخْرَجْتُكُمَا مِنَ الجَنَّةِ، لَتُطِيعنِّي أَوْ لأَجْعَلَنَّ لَهُ قَرْنَيْ أيِّلٍ، فَيَخْرُجَ مِنْ بَطْنِكِ، فَيَشُقَّهُ، وَلأَفْعَلَنَّ وَلأَفْعَلَنَّ، يُخَوِّفُهُمَا، سَمِّيَاهُ عَبْدَ الحَارِثِ، فَأَبَيَا أَنْ يُطِيعَاهُ، فَخَرَجَ مَيِّتًا، ثُمَّ حَمَلَتْ فَأَتَاهُمَا، فَقَالَ مثل قوله، فَأَبَيَا أَنْ يُطِيعَاهُ، فَخَرَجَ مَيِّتًا، ثُمَّ حَمَلَت فَأَتَاهُما فَذَكَرَ لَهُمَا، فَأَدْرَكَهُمَا حُبَّ الْوَلَدِ، فَسَمَّيَاهُ عَبْدَ الحَارِثِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تعالى : ﴿جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ﴾ رواه ابن أبي حاتم .

و له بسند صحيح عن قتادة قال : (( شركاء في طاعته، ولم يكن في عبادته)) .

وله بسند صحيح عن مجاهد في قوله : ﴿لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا﴾ قال : أشفقا أن لا يكون إنساناً )) وذكر معناه عن الحسن وسعيد وغيرهما .

واتە : لە ئیبن عەبباسەوە ریوایەت کراوە دەربارەی ئایەتەکە، دەڵێت : ((کاتێ ئادەم چووە لایەوە دووگیان بوو، ئیبلیس هات بۆ لایان و وتی : من هاورێکەتانم کە لە بەهەشت دەرەتانم هێنا، گوێرایەڵیم دەکەن یان دوو شاخ وەکو شاخی بزنە کێوی بۆ منداڵەکە پەیدا بکەم، کاتێك لە سکت دەردەچێت سکت دەدڕێت، وا دەکەم و وا دەکەم، ئەوانی دەترسان، بۆیە ناوی لێ بنێن (عبدالحارث)، بۆیە رازی نەبوون گوێرایەڵی بکەن، جا بە مردوویی دەرچوو، پاشان دووگیان بوو، ئیبلیس هات بۆ لایان، جارێکی تر وەکو جاری یەکەمی پێ وتن، ئەوانیش رازی نەبوون گوێرایەڵی بکەن، جا بە مردوویی دەرچوو، پاشان دووگیان بوو، ئیبلیس هات بۆ لایان، جارێکی تر وەکو جاری یەکەمی پێ وتن، ئەمجار ئەوان خۆشەویستی منداڵ بەرۆکی گرتن، بۆیە ناویان لێ نا (عبدالحارث) ئەمەش باسی ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت : ﴿جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ﴾

هەر لە ئەوەوە بە (صحيح) ی هاتووە لە (قەتادە)وە، فەرموویەتی : هاوەڵدانان لە گوێڕایەڵیدا نەك لە پەرستندا ).

هەر لە ئەوەوە بە (صحيح) ی هاتووە لە (موجاهيد)ەوە دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿لَئِنۡ ءَاتَيۡتَنَا صَٰلِحٗا﴾ فەرموویەتی :بەزەییان پێدا هاتەوە نەوەك مرۆڤ نەبێت ))

- (قرني أيل) : ساوەرێنە کێوی (نێرەی بزنە کێوییە) .
- (عبدالحارث) : ئەم ناوەی هەڵبژارد، چونکە ئەوە ناوی خۆیەتی، ویستی بەندایەتییەکەی بۆ خۆی بێت .
- ئەم چیرۆکە پوچەڵ و باتڵە لە چەند روویەکەوە :

١. هیچ هەواڵێك یان فەرموودەیەکی (صحيح) نەهاتووە لەبارەیەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، (ابن حزم) دەڵێت : ئەم چیرۆکە هەڵبەستراوە و درۆیە.
٢. نابێت بە هیچ شێوەیەك خوای گەورە باسی تاوانێك بکات و باسی تەوبەکەی نەکات .
٣. پێغەمبەران مەعصومن لە شیرك بە یەکدەنگی زانایان .
٤. خەڵکی کە دەچن بۆ لای ئادەم لە رۆژی قیامەتەدا بیانوو دەهێنێتەوە بە خواردنی لە دارەکە کە سەرپێچییە، جا ئەگەر ئەو شیرکی ئەنجام دابێت، ئەوا بیانووی بەو کارە بەهێزتر و لە پێشترە.
٥. شەیتان بەوانی وت : (من هاورێکەتانم) کەسێك ئەگەر بیەوێ لە خشتەیان بەرێت ئەوا ئەم قسەیە ناڵێت .
٦. نابێت باوەڕ بە شەیتان بکەن کەوا شاخی بزنە کێوی بۆ پەیدا دەکات، چونکە ئەمە شیرکی پەروەردگارێتییە.

٧. لە ئایەتی (یشرکون) هاتووە بە راناوی کۆ، ئەگەر ئادەم و حەوا بوایەن ئەوا دەیگوت : (یشرکان).

٨. بەم پێیە تەفسیری ئایەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ بەنی ئادەم ئەوانەی بە شیرکی حەقیقی شیرکیان ئەنجام دا، چونکە لەواندا کەسی موشریك و کەسی یەکتاپەرست هەیە .

**مەسەلەکان :**

**یەکەم :** حەرامبوونی هەموو ناوێك بەندایەتی لە خۆ دەگرێت بۆ جگە لە خوا (تەنانەت عبدالمطلب)

**دووەم :** تەفسیری ئایەتی : ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحٗا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ﴾

**سێیەم :** ئەم جۆرە شیرکە لە جۆری تەنها لە ناونانە مەبەستی حەقیقەتەکەی نییە (راستی ئەمە شیرکی حەقیقیە، وە شیرکیش لە شیرکی بەنی ئادەمە نەك ئادەم و حەوا ).

**چوارەم :** بەخشینی کچی ساغ و سەلامەت بە هەرکەسێك لە لایەن خوای گەورەوە یەکێکە لە نیعمەتەکان ( چونکە هەندێ کەس وا دەزانن بەخشینی کچ یەکێکە لە بەلاکان، ئەگەر نا بەخشینی کوڕی ساغ و سەلامەت لە باس و بابەتی نیعمەتەکانە)

**پێنجەم :** باسکردنی پێشین دەربارەی جیاوازی لە نێوان شیرك لە گوێڕایەڵیدا و شیرك لە پەرستندا (چونکە ئادەم و حەوا گوێڕایەڵی شەیتانیان کرد و ئەویان بە پەرستن نەپەرست، ئەمەش بنیات نراوە لەسەر راست و دروستی چیرۆکەکە)

## ٥١/ بەشی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت : ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ﴾

(ابن أبي حاتم) ریوایەتی کردووە لە (ابن عباس)ەوە : ﴿يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ﴾: واتە : هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن، هەر لە ئەوەوە هاتووە : ((اللات) لە (الإلە)ەوە وەرگیراوە، وە (العزى) لە (العزیز)ەوە ))، هەروەها لە (الأعمش)ەوە هاتووە : چەند ناوێك دەخەنە ناو ناوەکانەوە کە لە ئەو نین).

- لەم بەشەدا ڕەددی ئەو کەسانە دەداتەوە کە دەڵێن : کتێبی (التوحید) تەنها باسی تەوحیدی خوداوەندێتی دەکات .
- (وَلِلَّهِ) : ڕێگای تەوحید، لێرەدا (خبر)ی پێش خستووە چونکە پێش خستنی ئەوەی حەقی دواخستنە سوودی (حەصر) دەگەیەنێت .
- (ٱلۡحُسۡنَىٰ) : واتە : ئەوپەڕی لە جوانیدا و کامل و تەواون لە هەموو ڕوویەکەوە، بە هیچ شێوەیەك کەموکورتی تێدا نییە .
- (فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ) : داواکردنی لە خوا بە ناوەکانی دوو مانای هەیە :

**دوعای عیبادەت ( پەرستن ) :** بەوەی خوای گەورە بپەرستیت بەو مانایانەی ئەم ناوانە لە خۆی گرتوون، بۆ نمونە : (البصیر) بینەر : ئەو مانایە لە خۆ دەگرێت بە شێوەیەك خواپەرستی ئەنجام بدەیت بە پێی ئەو بینینە، بە شێوەیەك شتێکت لێ نەبینێ پێی ناخۆش بێت تۆ ئەنجامی بدەیت .

**دوعای داواکردن :** بەوەی کە لە پێش داواکارییەکەت تەوەسولی پێ بکەیت بۆ لای خوای گەورە، وەکو ئەوەی بڵێیت : ( فأغفر لي مغفرة من عندك وأرحمني، إنك أنت الغفور الرحيم).

**الالحاد : لادان لەوەی کە پێویستە باوەڕی پێ بکرێت، وە دابەش دەبێتە دوو بەشەوە :**

**یەکەم : لادان لە ناو و صیفاتەکاندا، ئەمەش چەند جۆرێکە :**

١. ئینکار کردنی هەموو ناوەکان یان هەندێکی وەکو جەهەمییەکان .

٢. ناوەکە دەسەلمێنێ و ئینکاری لە صیفەتەکەی دەکات، وەکو ئەوەی دەڵێن: (سمیع بلا سمع) واتە : بیسەرە بە بێ بیستن.

٣. یان دەیشوبهێنێت وەکو (الممثلة) .

٤. لە ناوەکانی خوادا ناوی بتەکانی لێ دەتاشێت وەکو ناونانی (العزى) لە (العزيز)ەوە.

٥. ناونانی خوای گەورە بەو ناوانەی خۆی ناوی لە خۆی نەناوە، وەکو ئەوەی دەڵێت: (ثالث الثلاثة) سێیەم خوایە لە سێ خواکە، یان (القادر على الاختراع) توانای داهێنانی هەیە .

**دووەم : لادان لە ئایەتەکاندا :**

جا ئایەتەکان دوو جۆرن :

١. **ئایەتە شەرعییەکان :** وەکو ئەوەی کەسێك بڵێت قورئان دروست کراوە.

٢. **ئایەتە کەونییەکان :** وەکو ئەوەی کەسێك دەڵێت : سروشت دروستکراوەکانی دروست کردووە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** سەلماندنی ناوەکان بۆ خوای گەورە بە جیاواز لە گەڵ جەهەمی و موعتەزیلە زیادەڕەوەکان .

**دووەم :** هەموو ناوەکان جوان و پیرۆزن (واتە لە جوانی و پیرۆزیدا گەیشتونەتە پلەی کاملبوون ).

**سێیەم :** فەرمانی کردووە بەو ناوانەوە دوعا بکەین ( دوعای پەرستن و دوعای داواکردن، وە لە هەردووکدا فەرمانمان پێکراوە کە داوا لە خوا بکەین بەم ناوانەوە)

**چوارەم :** وازهێنان لەوانەی دژایەتی دەکەن لە نەفامان و لادەران ( واتە واز لە ڕێگاکەیان بهێنین، مانای ئەوە نییە بانگەوازیان نەکەین و بۆیان روون نەکەینەوە، وە ئایەتەکە هەڕەشە ئامێزێکی لە خۆ گرتووە)

**پێنجەم :** تەفسیر کردنی ئیلحاد.

**شەشەم :** هەڕەشە لەو کەسەی لادەدات و ئیلحاد دەکات .

## تاقیکردنەوەی یەکەم لە بەشی نۆیەمدا ( ١١ بەشە )

پرسیاری یەکەم : نیشانەی (×) لە جێگای پێویست دابنێ یان بۆشاییەکان تەواو بکە :

١/ بەشی نۆیەم درێژترین بەشی کتێبەکەیە : **راستە** **هەڵەیە**

٢/ نوسەر جەختی کردووەتە سەر شیرکی بچووك چونکە شاراوەیە:

**راستە** **هەڵەیە**

٣/ ﴿نِعْمَتَ ٱللَّهِ﴾ : تاکە و مەبەست لێی : کۆیە تاکە

٤/ نیعمەت چۆن دەبێت ؟ بەدەست هێنانی ویستراوەکان

بە لادانی نارەحەتییەکان هەمووی

٥/ ﴿ثُمَّ يُنكِرُونَهَا﴾ :

ئینکاری بوونی دەکەن ئینکاری دانەپاڵ خوای دەکەن

٦/ چەپڵەلێدان لە کاتی دابەزینی فرۆکە وەکو سوپاسگوزاری بۆ سەرۆکی فرۆکەکە:

دروستە دروست نییە

٧/ دانەپاڵی نیعمەتەکان بۆ جگە لە خوا ئەوا کوفرێکی : گەورەیە بچووکە

٨/ شیرك لە دڵی بەنی ئادەمدا :

شاراوەترە لە خشەی مێروو لە سەر بەردێکی رەش لە تاریکە شەودا

ئاشکراو روونە

٩/ سوێند خواردن بە خوای گەورە بە درۆوە :

شیرکی بچووکە شیرکی گەورەیە حەرامە وردەکاری تێدایە

١٠/ سوێندخواردن بە خوا بە راستەوە :

شیرکی بچووکە شیرکی گەورەیە حەرامە وردەکاری تێدایە

١١/ خوای گەورە لە شیرك خۆش نابێت هەرچەندە بچووکیش بێت :

**راستە هەڵەیە**

١٢/ سوێندخورادن بە خوا بە درۆ سووکترە لای ئیبن مەسعود لە سوێند خواردن بە جگە لە خوا بە راستەوە : **راستە هەڵەیە**

١٣/ وتنی : بە چی سوێندت بۆ بخۆم تاوەکو باوەڕ بکەیت؟

دروستە دروست نییە

١٤/ وتنی (ما شاء الله وشاء فلان) ئەگەر باوەڕی وابوو کەوا فلان لە خوا گەورەترە یان یەکسانە لە گەڵ خوادا ئەوا شیرکی (گەورەیە بچووکە) وە ئەگەر باوەڕی وابوو کە لە خوا کەمترە ئەوا شیرکی (گەورەیە بچووکە)

١٥/ سوێند خواردن بە ئەمانەت (وتنی : أمانة عليك) :

شیرکی بچووکە تاوانێکی گەورەیە دروستە

١٦/ پێویستە فێری شیرك ببین تاوەکو نەکەوینە ناوییەوە : **راستە هەڵەیە**

١٧/ هاوەڵان تەفسیری ئەو ئایەتانە دەکەن کە بۆ شیریکی گەورە دابەزیوە کەوا شیرکی بچووکیش دەگرێتەوە : **راستە هەڵەیە**

١٨/ سوێند خواردنی (الغموس) ئەوەیە کە سوێند بە خوا دەخوات : بە درۆوە ماڵی موسڵمانێکی پێ دەبات بۆ خۆی

١٩/ پیتی (واو) (ریزبەندی یەکسانی ) لە خۆ دەگرێت، بۆیە ( شیرکە دروستە)

٢٠/ ئەو کەسەی سوێند دەخوات و جێگای باوەڕ نییە (بۆت هەیە بۆت نییە) رازی نەبیت بە سوێندەکەی .

٢١/ سوێند خوارد بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بە ژیانی دایك و زیمەت و گەردن و شەرەف : ئەم بەڵایە گشتگیر بووە شیرکی بچووکە

٢٢/ فەرموودەی : (فڵان شت و فڵان شت رێگریم لێ دەکات) واتە:......................

٢٣/ بۆچی هیچ کەسێك ئاگاداری ئەو سوێندخواردنە نەبوو ئیللا کابرای جولەکە نەبێت ؟.........................................................

٢٤/ جولەکە ئەو کەسەیە خۆی داوەتە پاڵ شەریعەتەکەی (عیسا موسا) وە هۆکاری ناونانیان بەو ناوە : (وتنیان : ﴿إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ﴾ لەبەر باپیریان یهوذا هەمووی)

٢٥/ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ شیرکی بچووك بەڵگەی شیرکی گەورەی هێنایەوە لەو جێگای کە دەفەرموێت : (أجعلتني لله نداً) : (**راستە هەڵەیە**) وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) رێنمویی کردووین بۆ : ( بچڕاندنی هەموو ئەو رێگایانەی کە خاوەنەکەی بەرەو شیرك دەبات هەرچەندە دووریش بێت وازهێنان لە شیرك)

٢٦/ لەکاتی سڵاوکردندا بۆت چەمایەوە ( ئینکاری لێ دەکەیت ئاساییە ئەگەر شەرم رێگر بوو لێت ئاساییە) وە ئەگەر ئینکاریت لێ نەکرد ئەوا تۆ کەسێکی (تاغوتی یەکتاپەرستی)

٢٧/ بە مەزن زانینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە وشەیەك یەکسان بوون لە خۆی بگرێت لە گەڵ خوادا :

شیرکە دەگەڕێتەوە بۆ نییەتی کەسەکە، ئەگەر مەبەستی رێز بوو ئەوا ئاساییە

٢٨/ جولەکە کەموکورتی زۆرە، بەڵام ئەو وشەیان تایبەت کراوە کە دەڵێن : ﴿عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ﴾ چونکە لە هەمووی گەورەتر و بە ناوبانگترە :

**راستە هەڵەیە**

٢٩/ (فلان شت و فلان شت رێگریم لێ دەکەن ) :

شەرم لە ئینکارکردنی باتڵ نەهی کردن لێ بە بێ فەرمان خوای گەورە

٣٠/ ئەوەی راست و دروستە : بەڵگە بهێنەوە ئەمجار باوەڕ دروست بکە

باوەڕ دروست بکە ئەمجار بەڵگە بهێنەرەوە

٣١/ شەرەفی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوەدایە کە :

بەندەی خوا و پێغەمبەری ئەوە(ﷺ)          محمدی کوڕی عبدالله یە(ﷺ)

٣٢/ خەوبینینی باش ئەوەیە کە :

چاکسازی تێدا بە دیٚ دەکرێت     بە رێك و پێکی دەیبینیٚ     هەمووی

٣٣/ ئەگەر خەوبینین رێك و پێك نەبوو ئەوا خەوی تێکەڵ و پێکەڵە و هیچ حەقیقەتێکی نییە :          **راستە     هەڵەیە**

٣٤/ خەوە ناخۆشەکان لە شەیتانەوەیە (**راستە     هەڵەیە**) سوننەتە ( بۆ ئەو کەسەی خەوپەرژێن دەکات بیگێڕێتەوە     سیٚ جار تف بکات بە لای چەپیدا و (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) بکات .

٣٥/ ئەگەر قەرینە هەبوو کەوا خەوەکە لە گەڵ شەریعەتدا جیاوازە ئەوا :

پەندی لیٚ وەردەگرین          هیچ پەندێکی تێدا نییە

٣٦/ کەسێك بە ژنەکەی دەڵێت : (رەشترین رۆژ رۆژی هاوسەرگیریمان بوو) :

دروستە   دروست نییە

٣٧/ ئەوەی راستە کەوا :     مەرجە لەگەڵ ئازاردا زەرەر هەبێت

مەرج نییە لە گەڵ ئازاردا زەرەر هەبێت

٣٨/ ناوەکانی خوا جوان و پیرۆزن، وە (الدهر) ناوێکی جامدە هیچ مانایەك هەڵناگرێت تەنها ئەوە نەبێت کە بۆ کات بە کار دەهێنرێت (راستە   هەڵەیە) وە مانای : (أنا الدهر) واتە : ........................................

٣٩/ وتنی (زەمانە غەدداره) :     حەرامە          دروستە چونکە لە باسی هەواڵدانە

٤٠/ وتنی (فلاّن کەس لە ساڵی گرانییەکە لە دایك بووه)

حەرامە          دروستە چونکە لە باسی هەواڵدانە

٤١/ وتنی : (ئەی زەوی ئەوەی لەسەرتە بیپارێزه) :

داواکردنە لە جگە لە خوا (شیرکه)          دروستە

٤٢/ بەشەکانی جوێندان بە ڕۆژگار :

١/ ............................ حوکمەکەی ........

٢/ ............................ حوکمەکەی ........

٣/ ............................ حوکمەکەی ........

٤٣/ وتنی : (سروشت چەندین نهێنی و سەیروسەمەرەی هەیە ) یان (ئەمە لە کرداری سروشتە) **راستە هەڵەیە**

٤٤/ قازی کۆ دەکاتەوە لە نێوان ناچارکردن (ئیلزام) و فەتوادا : **راستە هەڵەیە**

٤٥/ وتنی : (قازی قازییەکانی سەدەی حەوتەم) :

دروستە وازهێنان لێی لە پێشترە

٤٦/ شیخ الاسلام واتە : شەیخی ڕەها کە ئیسلام بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە کەسێکە دینەکەی تازە کردووەتەوە و شوێنەواری چاکی هەیە لەبەرگری لە ئیسلام

٤٧/ (پێویستە پێویست نییە) موراعاتی لایەنی کەسی وەصفکراو بکرێت بۆ ئەوەی لە خۆی بایی نەبێت .

٤٨/ خۆشەویسترین ناو لای خوای گەورە ئەوەیە کە دەلالەت دەکات لەسەر زەلیلی نواندن و ملکەچ بوون وەکو (شاهان شاه عبدالرحمن) وە سوکترین ناو لای خوای گەورە ئەوەیە کە دەلالەت دەکات لەسەر ( جەبەروت دەسەڵات مەزن زانین هەمووی) بۆیە بە جیاواز لە گەڵ نییەتەکەیدا مامەڵەی لە گەڵ دەکرێت و ئیهانە دەکرێت (**راستە هەڵەیە**)

٤٩/ ناونان بە خاوەنداری خاوەندارەکان و قازی قازییەکان :

دروستە حەرامە یەکێکە لە تاوانە گەورەکان

٥٠/ کونییە ئەوەیە کە بە (أب) یان (أم) یان (أخ) یان (عم) یان (خال) دەست پێ دەکات وە مەبەست لێی : پیاهەڵنانە (مدح) زەمە

هاوەڵبوون لە گەڵ شتێکدا عەلەمییە هەمووی

٥١/ لـە نـاو هاوەڵانـدا کەسـانێك هـەبوون نـاوی (حکـیم) و (الحکـم) بـووە، کەچـی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیگۆڕاوە چونکە مەبەسـتیان تـەنها عەلەمییـە بـووە (راسـتە هەڵەیە) وە ئەوەی نابێت لـە ناوەکـانی خـوا نـاوی کەسـانیتری لـێ بنێیـت (ئـەوەی تایبەتە بە خۆیەوە ئەوەی تێبینی صیفەتەکەی لێ دەکرێت هەمووی)

٥٢/ حوکمی دانانی کونییە : دروستە موستەحەبە

٥٣/ (هەرکەسێ گاڵتە بکات بە شتێك ناوی خوا یـان قورئـان یـان پێغەمبـەری (ﷺ) تێدا بێت) مەبەست لە پێغەمبەر : (محمد)ـە(ﷺ) هەموو پێغەمبەران

٥٤/ نەفی کردنی ئیمان لە کەسی گاڵتەجار نەفیکردنێکی گەورەیـە و ناکرێـت کەسـی موسڵمان ئەمە نەزانێت . راستە هەڵەیە

٥٥/ مەرجەکانی تەوبەی کەسی گاڵتەجار :

١/........................................................................

٢/........................................................................

٣/........................................................................

٥٦/ پێویستە لە باس و بابەتی گاڵتەکردندا توند بین و بە ئاسانی نـەزانین : راسـتە هەڵەیە

٥٧/ کەسانێك هەن بـەرگری دەکـەن لـەو کەسـانەی جـوێن بـە پـەروەردگار دەدەن بـەڵام ئەگـەر جـوێن بـە خـۆی بـدرێت یـان بـە دایکـی ئـەوا تـوڕە دەبێـت و غـیرەت دەیگرێت : **راستە هەڵەیە**

٥٨/ پێویستە بۆ خەڵکی روون بکەینەوە لە مەترسی ئەم باسە، کەوا ئـەو کوفرێکـە خاوەنەکـەی لـە ئیسـلام دەردەکـات و چـاوەڕێ نەکـەین تـاوەکو کەسـێك تووشـی جوێندان یان گاڵتەجاری ببێت : **راستە هەڵەیە**

٥٩/ کەسـانێك هـەن دەڵـێن : پرسـیار دەکـەین لـەوەی جـوێنی داوە یـان کەسـی گاڵتەجار ئایە مەبەستی جوێندانە یان نا، ئەمەش قسەیەکی : باتڵە راستە

٦٠/ لە بە گەورەدانانی حەقی دروستکراوەکان بە سەر حەقی خواوە ئەوەیە : ئەوەی جوێنی داوە بیانووی بۆ دەهێنینەوە کەوا تووڕە بووە، بەڵام ئەو بیانووە وەرناگیرێت کاتێ جوێن بە سەرۆك یان باوك دەدات یان پارە دەدرێت : راستە هەڵەیە

٦١/ ئەم توندییە لە هەندێ وڵاتدا بەرهەمی هەبووە سوپاس بۆ خوا، وە کەمتەرخەمی لە هەندێ وڵاتی تردا وای کردووە منداڵ و گەورە جوێن بدەن :

**راستە هەڵەیە**

٦٢/ کەسی گاڵتەجار تاوانەکەی گەورەترە لەو کەسەی سوژدە بۆ بت دەبات :

**راستە هەڵەیە**

٦٣/ رەنگە نەبیسی لە جولەکە و گاورەکان جوێن بە خوا یان بە عیسا یان موسا یان دین بدەن، بەڵام رەنگە لەو کەسانەوە بانگەشەی ئیسلام دەکەن ببیسیت :

**راستە هەڵەیە**

٦٤/ ئیمانداری راست ئەوەیە کاتێك باسی ئایەتێکی بۆ بکرێت یان فەرموودەیەك دەترسێت و ئیمانی زیاد دەکات، بەڵام کەسی دووڕوو گاڵتە دەکات و یاری دەکات و فەرموودە دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی پێ بکەنێت : **راستە هەڵەیە**

٦٥/ پارچە دەنگییەك جوێن بە دایکت بدات ئایە بڵاوی دەکەیتەوە یان گوێی لێ دەگریت ؟ ئایە چۆنە دەنگییەك جوێن بە دایکی هەموو ئیمانداران دەدات، گوێی لێ دەگرێت و بڵاوی دەکەیتەوە ؟ بەڵێ نەخێر

٦٦/ ئەوەی پێویستە کاتێ پارچە دەنگییەك دەبیسی جوێنی تێدایە : گوێی لێ بگرین و بڵاوی بکەینەوە یەکسەر بیسڕینەوە

٦٧/ کۆکردنەوەی ئەو پارچە دەنگییانە کە جوێندان یان گاڵتەی تێدایە رێگای :

سەلەفە دووڕووەکانە

٦٨/ **هەڵگەڕانەوە بە هۆی جوێندان و گاڵتەکردنەوە، کارێکی زۆر مەزن و گەورەیە، هەندێ لە زانایان دەڵێن : تەوبە سوودی نییە بۆی، وە دەبێت سوڵتان بیکوژێت و نوێژ لەسەری ناکرێت و دوعای لێخۆشبوونی بۆ ناکرێت و لە گۆڕستانی موسڵمانانیدا نانێژرێت:** **راستە** **هەڵەیە**

٦٩/ **ئەوەی جوێن دەدات ئەگەر وتی : تەوبەم کردووە، وە جارێکی تر گەڕایەوە بۆ جوێندان ئەمە بەڵگەیە لەسەر درۆکەی :** **راستە** **هەڵەیە**

٧٠/ **کەسی دووڕوو ئەگەر جوێن بدات دەڵێت : مەبەستم ئەوە نەبووە، ئەمە تەنها قسەی سەر زارەکییە :** **راستە** **هەڵەیە**

٧١/ **بەڵگەی راستگۆیی تەوبەی کەسی گاڵتەجار ئەوەیە دەڵێت : جوێندان و گاڵتەکردن کوفرە و خۆم بەری دەکەم لێی لای خوای گەورە:** **راستە** **هەڵەیە**

٧٢/ **ئەو کەسەی گوێبیستی جوێندانەکە یان گاڵتەکردنەکە دەبێت و ئینکاری لێ ناکات یان هەڵناسێت ئەوا حوکمی وەکو ئەوانە :** **راستە** **هەڵەیە**

٧٣/ **شەیتان رەنگە چەند درەگایەکی خەیرت لێ بکاتەوە بۆ ئەوەی بتخانە ناو کوفرەوە، جا ئەم پیاوە لە تەبوك بووە کەچی توشی ئەوە بوو :** راستە هەڵەیە

٧٤/ **سوود لە فەرموودەی گاڵتەجارەکە وەردەگرین : کوفری ئەو کەسەی گاڵتە بە هاوەڵان دەکات : (راستە هەڵەیە) چونکە تانەدان لەوان تانەدانە لە ( خوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) دین هاوەڵان هەمووی)**

٧٥/ **هەرکەسێ لێبوردنەکەی فەساد بە دوای خۆیدا بهێنێت نەك چاکسازی ئەوا ( تاوانبارە تاوانبار نابێت) بەم لێبوردنە.**

٧٦/ **ئەگەر مرۆڤ نیعمەتەکانی داوە پاڵ کارەکەی یان کەسابەتەکەی خۆی ئەوا شیرکی تێدایە لە جۆری ( پەروەردگارێتی بەندایەتی) وە ئەگەر دایە پاڵ خوای گەورە بەڵام باوەڕی وابوو کەوا ئەو شایەنی ئەو نیعمەتەیە ئەوا جۆرێکە لە خۆ بە گەورە زانین (راستە هەڵەیە)**

٧٧/ رازیبوون بە قەزای خوای گەورە كە كرداری خوایە (واجیبە واجیب نییە) وە قەزا لەسەر كراوەكە ئەگەر موصیبەت بوو ئەوا پێویست نییە پێی رازی بین ( راستە هەڵەیە)

٧٨/ هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان كابرای كەچەڵ و گەڕ و نابینا لە داواكردنیان لە فریشتەكە (راستە هەڵەیە)

٧٩/ ناونان بە (عبدالمطلب): دروستە دروست نییە

٨٠/ ناونانی هەندێ گوڵ بە (عبَّاد الشمس) بەندەی خۆر : دروستە دروست نییە

٨١/ بازنەی بدە بە دەوری ئەو ناوەدا كە دروست نییە ناوی بنێین :

(عبدالمطلب – عبدالكعبة – عبد مناف – عبدالحسين – عبدالنبي – عبدالحارث – فرعون – خنزب – عاصية – سلطان السلاطين – سيدالناس – غلام علي – رب العالمين – الرحمن – الخالق – عبدالستار – عبدالنور – بطرس – جورج – سيدالسادات – ست النساء – عبدالناصر) .

٨٢/ ئەوە هاتووەتە ناو موسڵمانانەوە لە زیادەڕەوی ڕەوافیزەكان، ناونان بەوەی بەندایەتی لێ بە دی دەكرێت وەكو ئەوەی دەڵێن : (غلام علي) واتە (عبد علي) جا ئەوە بەندایەتی تێدا بە دی دەكرێت بۆ جگە لە خوا و ئەوەش شیركە :

**راستە هەڵەیە**

٨٣/ وتنی ئەو كەسەی كە ناتوانێت تەصەروف بكات لە سامانی كەسانی تردا : من تەنها عەبدێكی پێسپێردراوم (عبد المأمور)م : دروستە دروست نییە

٨٤/ چیرۆكەكەی ئادەم و حەوا: راستە راست نییە

٨٥/ شەیتان ناوی (عبدالحارث)ی هەڵبژارد :

چونكە ئەوە ناوی ئەوە ئەمە راست نییە چونكە (الحارث) راستترین ناوەكانە

٨٦/ ناونان بە (الحارث) : دروستە دروست نییە

٨٧/ پێغەمبەران بەریبوونە لە شیرك بە یەکدەنگی زانایان، وە هەرکەسێك قسە بکات پێیان یان بە دوای ئەو شتانەدا بگەڕێت لەوانەوە روویداوە ئەوە کەسێکی :

دووڕووە        یەکتاپەرستە

٨٨/ داواکردن لە خوای گەورە بە ناوەکانی ئەوا داواکردنی :

پەرستنە        داواکردنە        هەمووی

٨٩/ کتێبی تەوحید :

کۆکەرەوەی هەرسێ جۆرەکەی تەوحیدە        تەنها تەوحیدی پەرستنی تێدایە

٩٠/ ئیلحاد (لادان) لە ناوەکاندا دابەش دەبێت بۆ :   دوو بەش        پێنج بەش

٩١/ ﴿وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ﴾ واتە :

بانگەوازیان ناکەین و بۆیان روون ناکەینەوە        وازهێنان لە ڕێگاکەیان

٩٢/ ئیلحاد (لادان) لە ناو و صیفاتەکانی خوادا دابەش دەبێت بۆ :

١. ............................................

٢. ............................................

٣. ............................................

٤. ............................................

٥. ............................................

## /٥٢ بەشی : ناگوترێت : سڵاو لە خوا ( حەرامبوون )

### بـــۆ؟

چونکە لە گەڵ حەقیقەتدا جیاوازە، خوای گەورە داوای لێ دەکرێت نەك داوای بۆ دەکرێت، ئەو بێ نیازە لە ئێمە، بەڵام بە صیفاتی کەمال ستایش دەکرێت .

چونکە لە نمونەی ئەم دوعایانە گومانی کەموکورتی لە حەقی خوادا بە دی دەکرێت، چونکە داوای سەلام بۆ هیچ شتێك ناکرێت ئیللا مەگەر دروست بێت پێی وەصف بکرێت، خوای گەورەش بێ گەردە لەو کەموکووڕیانە.

### بەڵگەی یەکەم :

لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا هاتوە لە ( ابن مسعود)ەوە –رەزای خوای لێبێت– دەفەرموێ : ((كنا إذا كنا مع رسول الله(ﷺ) في الصلاة قلنا: السلام على الله من عباده، السلام على فلان وفلان، فقال النبي (ﷺ) : لا تقولوا : السلام على الله، فإن الله هو السلام).

واتا : ئێمە ئەگەر لە گەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بوایەین لە نوێژەکانماندا دەمانگوت : سەلام لە خوای گەورە لەلایەن بەندەکانییەوە، سەلام لە فلاّن و فلاّن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : مەڵێن : سەلام لە سەر خوا، چونکە خوای گەورە خۆی سەلامە )

- **السلام :** ناوێکی سلبی ئەرێنییە، جا (سلبی) یە واتە مەبەست لێی نەفی کردنی خوای گەورەیە لە هەموو کەموکوڕییەك یان عەیبێك کە مرۆڤ بیری بۆ بچێت یان عەقڵ گومانی پێ ببات، جا خوای گەورە هیچ کەموکوڕییەکی تووش نابێت نە لە زاتیدا و نە لە صیفاتیدا و نە لە کرداریدا و نە لە ئەحکامەکانیدا، وە ئەرێنییە واتە سەلماندنی ئەم ناوەیە بۆی، وە ئەو صیفەتەش کە لە خۆی دەگرێت بریتییە لە سەلامەت بوون لە هەموو کەم و کوڕییەك.
- **السلام :** چەند مانایەکی هەیە :

| سڵاوکردن : وەکو چۆن دەڵێن : سەلام بکە لە فلان کەس. | سەلامەت بوون لە هەموو کەمو کوڕی و ئافاتێك، وەکو ئەوەی بڵێین : (السلام عليك أيها النبي) (ﷺ). | السلام : ناوێکە لە ناوەکانی خوا . |
|---|---|---|

**مەسەلەکان :**

**یەکەم :** تەفسیری (السلام) وەکو ناوێك لە ناوەکانی خوا : واتە سەلامەت و بێ گەردە لە هەموو کەموکوڕییەك و عەیبێك .

**دووەم :** مانای سڵاوکردنە .

**سێیەم :** بۆ خوای گەورە ناوترێت و بەکارناهێنرێت ( جا ئەگەر وابێت ئەوا حەرامە)

**چوارەم :** هۆکاری ئەوە (چونکە خوای گەورە خۆی سەلامە)

**پێنجەم :** هاوەڵانی فێری ئەو سەلامە کردووە کە بۆ خوای گەورە دەگونجێ و بە کاردەهێنرێت.

## ٥٣/ وتنی ( خودایە لێم خۆشبە ئەگەر ویستت لەسەرە ) حەرامبوونی ئەو بەدەرهێنانە ( استثناء )ە لە دوعادا .

ئـەم بەشـە کـەمالی دەسـەڵاتی خـواو سـەخاوەت و فـەزڵی روون دەکاتـەوە، ئەوەی قەدەغەیە لەم بەدەرهێنانە :

| | | |
|---|---|---|
| هەسـت بـەوە دەکرێـت کـەوا خـوای گـەورە کەسـێك هەیـە ناچـاری دەکـات، کارەکـەش وا نییە . | هەست بەوە دەکرێت کـەوا ئـەم کـارە زۆر گەورەیـە لەسـەر خـوا و قورسـە لەسـەری و ناتوانیـت بیکات، کارەکەش وانییە . | هەست بە بێ نیازی مرۆڤـەکانی تێـدا دەکرێـت لـە خـوای گەورە، ئەمەش شیاو و ئەدەب نییە . |

### بەڵگەی یەکەم :

لە فەرموودەیەکی (صحیح) دا لە (ابو هریرة)ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( لا يقل أحدكم : اللهم اغفر لي إن شئت، اللهم ارحمني إن شئت، ليعزم المسألة، فإن الله لا مكره له) .

ولمسلم : وليعظم الرغبة، فإن الله لا يتعاظمه شيء أعطاه ) واتـە :با یـەکێکتان نەڵێت: خودایە لێم خۆشبە ئەگەر ویستت لێیـەتی، خودایـە رەحمم پـێ بکـە ئەگەر ویستت لێیەتی، با مەسـەلەکە یـەکلا بکاتـەوە و سـوور بێـت لەسـەری، چونکە خوای گەورە هیچ کەسێك نییە ناچاری بکـات بـۆ هـەر کارێك ) وە لـە (مسلم)دا هاتووە : وە با ویست و حەزەکانی گـەورە بکاتـەوە، چـونکە خـوای گەورە هیچ شتێکی لا گەورە نییە، ئەگەر بیەوێ بیبەخشێ )

ئەو هەڵواسینەی دوعا بە کارێکەوە لە دوعای (استخارة)دا هاتووە هەڵواسینێك نییە بە ویستەوە، بەڵکو دەربارەی کارێکە لای من نەزانراوە، نازانم ئەو کارە بۆ من خەیر و چاکە یان نا ؟ هەروەها لەو فەرموودەدا کە دەفەرموێت : (أحيني ما كانت الحياة خيرا لي) واتە : خودایە بمژێنە ئەگەر ژیان بۆ من باشترە))

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** نەهیکردن لە بەدەرهێنان (استثناء) لە دوعادا.

**دووەم :** روونکردنەوەی هۆکاری ئەوە .

**سێیەم :** مەبەست لە (وليعزم المسألة) ئەگەر داوات کرد سووربە لەسەر مەسەلەکە و دوودڵ مەبە.

**چوارەم :** گەورەکردنی حەزەکان ( واتە : داوای ئەوە دەکات کە حەزی لێیەتی و دێتە خەیاڵیدا، هیچ شتێك رێگر نییە لەوەی خوای گەورە پێی ببەخشێت)

**پێنجەم :** باسی هۆکاری ئەم بابەتە :

١. بۆ روونکردنەوەی بەرزی و بەرێزی شەریعەت .
٢. زیادبوونی دڵئارامی مرۆڤ
٣. قیاس ئەگەر هاتوو مەسەلەکە لە ئەحکامەکاندا بوو .

## ٥٤/ بەشی : ناڵێت : عەبدەکەم و کەنیزەکەکەم

## حوکمی وتنی : عەبدەکەم یان کەنیزەکەکەم

**بیداتە پاڵ خۆی :** ئەمەش دوو شێوەی هەیە :

ئەگەر بیداتە پاڵ جگە لە خۆی : وەکو ئەوەی بڵێت : (عەبدەکەی فلان) یان (کەنیزەکەکەی فلان) ئەوا دروستە .

**بە شێوازی هەواڵدان :** وەکو ئەوەی کەسێك بڵێت: خواردنم دا بە عەبەدەکەم یان عەبەدەکەم ئازاد کرد، ئەمەش وردەکاری تێدایە :

**بە شێوازی بانگ کردن بێت :** وەکو ئەوەی دەڵێت : ئەی عەبدەکەوە ، جا ئەمە نەهی لێکراوە .

ئەگەر لە پاش ملەی عەبدەکە یان کەنیزەکەکە بوو ئەوا دروستە .

ئەگەر لە پێش عەبدەکە یان کەنیزەکەکە وتی، تەماشا دەکەین ئایە هیچ مەفسەدەیەك بە دوای خۆیدا دەهێنێت پەیوەست بێت بە عەبدەکەوە یان گەورەکەوە، ئەگەر مەفسەدەکە بوو ئەوا ڕێگری دەبین ئەگەر نەبوو ئەوا دروستە.

## بەڵگەی یەکەم :

وە لە فەرموودەیەکی ( صحیح)دا هاتوە لە (ابو هريرة )- ڕەزای خوای لێبێت- کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی : (لا يقل أحدكم : أطعم ربك وضئ ربك و ليقل : سيدي و مولاي و لا يقل أحدكم : عبدي و أمتي و ليقل : فتاي و فتاتي و غلامي)  واتە : با یەکێکتان نەڵێت : خواردن بدە بە خاوەنەکەت (ربك) یان ئاوی دەستنوێژ ئامادە بکە بۆ خاوەنەکەت (ربك)، با بڵێت : گەورە و مەولام و با یەکێکتان نەڵێت : عەبدەکەم و کەنیزەکەم و با بڵێت : (فتاي و فتاتي و غلامي).

- (لا يقل أحدكم : أطعم ربك وضئ ربك) : چونكە سنوور بەزاندنی تێدایە لە لایەنی پەروەردگارێتی .
- (و ليقل : سيدي و مولاي) : ئەم دواندنە بۆ عەبدە، ئەمەش بۆ واجیب بوون نییە بەڵكو لە بەشی رێنویی حەلاڵە، چونكە زانایان دەفەرموون : ئەگەر كارێك لە بەرانبەر شتێكی قەدەغەكراو هات ئەوا مەبەست لێی دروستی كارەكەیە، وە هەر لە نمونەی ئەوە خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا﴾

- (و لا يقل أحدكم ) : نەهی یان بۆ حەرامبوونە یان بۆ كەراهەتە، بۆ ئەوەی گومانی ئەوە نەبرێت كە مەبەست لێی ئەو بەندایەتیەیە كە تەنها بۆ خوای گەورەیە، (عبدي) بۆ كوڕە (أمتي) بۆ كچە .
- (و ليقل : فتاي و فتاتي و غلامي) : ئەم دواندنە بۆ كەسی خاوەندارە (سید)ە، بەڵگەی ئەوەشی تێدایە كەوا ئەگەر شەرعی خوا دەرگایەكی حەرام دابخات ئەوا دەرگایەكی دروست و جائز دەكاتەوە، هەروەها بەڵگەی ئاگاداربوون لە جێبەجێ گەیاندنی تەوحیدی تێدایە تەنانەت لە گفتارەكاندا .

**مەسەلەكان :**

**یەكەم :** نەهی لە وتنی (عەبدەكەم كەنیزەكەم)

**دووەم :** عەبدەكەش ناڵێت : (ربي) وە پێی ناگوترێت ( أطعم ربك)

**سێیەم :** فێركردنی كەسی یەكەم بە وتنی : (فتاي و فتاتي وغلامي)

**چوارەم :** فێركردنی كەسی دووەم بە وتنی : (سيدي و مولاي)

**پێنجەم :** ئاگادار كردنەوە لە مەبەستەكە، ئەویش جێبەجێ گەیاندنی تەوحیدە تەنانەت لە گفتارەكاندا.

## ٥٥/ بەشی : هیچ کەسێك ناگێردرێتەوە ئەگەر بە ناوی خوا داوای کرد ( حەرامبوون یان کەراهەت )

### بەشەکانی داواکردن بە ناوی خواوە :

داواکردن بە ناوی خودی خواوە (واتە: بەکارهێنانی وشەی (الله)ی تێدابێت): وەکو ئەوەی بڵێت : داوات لێ دەکەم بە ناوی خوا.

داواکردن بە شەرعی خوا : واتە : داوای شتێك دەکات کە شەرع حەڵاڵی کردووە وەکو ئەوەی هەژارێك داوای صەدەقە دەکات .

### ئایە دروستە مرۆڤ داوای بکات بە ناوی خواوە یان نا ؟

داواکردن خۆی لە خۆیدا مەکروهە یان حەرامە ئیللا بۆ پێویستییەك یان زەرورەت نەبێت، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەیعەی لە هاوەڵانی وەرگرت کەوا داوای هیچ شتێك لە خەڵکی نەکەن، بەڵام هاتنە دەم کەسی داواکارەوە ئەوا لە یەکێك لەم بەشانەدا خۆی دەبینێتەوە، داواکارییەکە یان :

**تەنها داواکارییەك :** وەکو ئەوەی بڵێت : ئەی فلان پێم بدە، جا ئەگەر هاتوو لەو شتانە بوو کە شەرع حەڵاڵی کردووە ئەوا پێی دەدەیت .

**بە ناوی خواوە :** ئەوا ئەم کەسە وەڵامی داواکەی دەدەیتەوە هەرچەندە شایستەش نەبێت، چونکە بە ناوی مەزنێکەوە داوای کردووە، بۆیە وەڵامدانەوەی بە مەزن زانینی ئەو مەزنەیە، بەڵام ئەگەر داواکەی تاوان بوو یان لە وەڵامدانەوەیدا زەرەرێك هەبوو بۆ کەسی داواکراو ئەوا وەڵام نادرێتەوە.

## بەڵگەی یەکەم :

لە (ابن عمر) ەوە –رەزای خوا لە خۆی و باوکی بێت– دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی : (من أستعاذ بالله فأعيذوه، ومن سأل بالله فأعطوه، وَمَنْ دَعاكُمْ فأجيبُوهُ، وَمَنْ صَنَعَ إِلَيْكُمْ مَعْرُوفاً فَكَافِئُوهُ، فإنْ لَمْ تَجِدُوا ما تُكافِئُونَهُ فادْعُوا لَهُ، حَتَّى تَرَوْا أَنَّكُمْ قَدْ كافأْتُمُوهُ) رواه أبو داود والنسائي بسند صحيح .

واتە : هەرکەسێ داوای داڵدەی لێ کردن بە ناوی خواوە ئەوا داڵدەی بدەن، وە هەرکەسێ داوای لێکردن بە ناوی خواوە ئەوا پێی ببەخشن، وە هەرکەسێ دەعوەتی کردن وەڵامی دەعوەتەکەی بدەنەوە، وە هەرکەسێ چاکەیەکی بۆ کردن ئەوا پاداشتی بدەنەوە، وە ئەگەر هیچ شتێکتان نەبوو پاداشتی پێ بدەنەوە ئەوا دوعای بۆ بکەن تاوەکو وا دەبین کە پاداشتتان داوەتەوە) .

- (فأعيذوه) : ئیللا مەگەر داوای داڵدەتان لێ بکات لە شتێکدا کە واجیبە بە سەرییەوە، یان هاوکاری کردن لە سەر تاوان و دوژمنایەتی .

ئایە وەڵامدانەوەی ئەو کەسەی دەعوەتت دەکات حەقی خوایە یان حەقی مرۆڤەکانە ؟

حەقی مرۆڤەکانە، بۆیە ئەگەر داوای لێبوردنت کرد لەو کەسەی دەعوەتت دەکات کەوا تو ناتوانیت ئامادە بیت و ئەویش رازی بوو، ئەوا تاوانبار نابیت، بەڵام واجیب کراوە بە فەرمانی خوای گەورە، بەڵام ئەگەر داوای لێبوردنەکەی قبوڵ کرد لە کاتێکدا شەرمی لێت کرد و رووگیر بوو، وە لە ناخەوە رازی نەبوو، ئەوا نابێت واز لەو دەعوەتییە بهێنی .

- (فأجيبوهُ) : مەبەست لە دەعوەت کردن ئەوەیە کە بۆ رێزە نەك بانگەواز کردن، وە جمهوری زانایان لە گەڵ ئەوەدان کە وەڵامی ئەو کەسەی

دەعوەتت دەکات موستەحەببە ئیللا دەعوەتی هاوسەرگیری نەبێت، ئەویش واجیبە بە شەش مەرج :

١. ئەو کەسەی دەعوەتت دەکات یەکێك نەبێت لەوانەی کە واجیبە یان سوننەتە هەجری بکەیت .
٢. لە جێگای دەعوەتییەکە شتی مونکەر و خراپ نەبێت، ئەگەر هەبوو، ئەگەر توانی لایبات ئەوا واجیبە وەڵامی دەعوەتییەکە بداتەوە، وەکو وەڵامدانەوەی دەعوەتییەکەو گۆڕینی خراپەکارییەکە.
٣. ئەوەی دەعوەتییەکە دەکات دەبێ موسڵمان بێت، ئەگەر نا واجیب نابێت.
٤. کەسەکە لە ڕێگای حەرامەوە پارەی پەیدا نەکردبێت .
٥. وەڵامدانەوەی دەعوەتییەکە نەبێتە هۆی وازهێنان لە واجبێك یان شتێك لەو واجیبتر بێت.
٦. نەبێتە هۆی زەرەرێك بۆ ئەو کەسەی دەعوەت دەکرێت، وەکو سەفەر یان جیابوونەوە لە کەسوکاری کە پێویستیان پێیەتی .

ئایە ئەو کارتانەی دابەش دەکرێت جێی دەعوەتی دەگرێتەوە کە بە زار دەگوترێت ؟

ئەگەر زانرا یان گومانت زاڵ بوو کەوا ئەو کەسەی بۆی نێردراوە مەبەست لێی ئەوە ، ئەوا حوکمی دەعوەتی بە زارەکی هەیە .

(فَكَافِئُوهُ) : پاداشت دانەوە دوو سوودی هەیە :

١. هاندانی چاکەکارانە بۆ بەردەوامبوون لە چاکەکردن .
٢. شکانەوەی ئەو زەلیلییەی بە هۆی ئەو چاکەیەی لە گەڵیدا کراوە .

## مەسەلەکان :

**یەکـــەم :** دالّـدەدانی ئـەو کەسـەی بـە نـاوی خـواوە داوای دالّـدە دەکـات (هەرکەسێ بـە نـاوی خـواوە داوای دالّـدەی کـرد واجیبـە دالّدە بـدرێت، ئـیللا مەگەر داوای دالّدە بکات لە شتێکدا واجیبە، ئەنجامدانی یان وازلێهێنـانی، ئـەو کات دالّدە نادرێت .

**دووەم :** ئەو کەسەی بە ناوی خواوە داوا دەکات پێ بدرێت.

**سێیەم :** وەلاّمدانەوەی دەعوەتی .

**چوارەم :** پاداشـت دانـەوە لەسـەر ئەنجامـدانی کارێـك (واتـە : لەسـەر ئـەوەی کەسێك کارێکی چاکت بۆ دەکات).

**پێنجەم :** دوعـاکردن پاداشـتی ئـەو کەسـانەیە کـە نـاتوانن پاداشـت بدەنـەوە تەنها بەو شـێوە نـەبێت (چـونکە ئـەوە پاداشـتێکە بـۆ ئـەوە، وە یـان کەسـی چاکەکار وا باوە کە پاداشت نادرێتەوە ).

**شەشەم :** مەبەست لە : (حَتَّى تَرَوْا أَنَّكُمْ قَدْ كافأْتُمُوه) : کەمتەرخەمی ناکات لە دوعاکەیدا، بەڵکو بەردەوام دوعا دەکات تاوەکو دەزانێـت یـان گومـانی ئـەوە دەبات کە پاداشتی داوەتەوە)

## ٥٦/ بەشی : داوا هیچ شتێك ناکرێت بە روخساری خوا ئیللا بەهەشت نەبێت

### مانای ئەم ناونیشانە :

واتە : داوا لە هیچ کەسێك مەکە بە روخساری خوا، چونکە هیچ کەسێك توانای بەخشینی بەهەشتی نییە .

یان : ئەگەر داوات کرد بە روخساری خوا ئەوا داوای بەهەشت بکە، وە داوای هیچ شتێك لە کاروباری دونیا مەکە .

ئەمەش بەڵگەی مەزنی و گەورەیی روخساری خوای تێدایە، کەوا داوا بە روخساری خوا ناکرێت ئیللا بەهەشت نەبێت یان ئەو رێگایەی بەرەو بەهەشتت دەبات.

### بەڵگەی یەکەم :

لە (جابر)ەوە –رەزای خوای لێبێت– هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لا يُسأل بوجه الله إلا الجنة) رواه أبو داود واتە : بە روخساری خودا داوای هیچ شتێك ناکرێت تەنها بەهەشت نەبێت )

(بوجه الله) : سەلماندنی (روو – روخسار)ی تێدایە بۆ خوای گەورە، ئەوەش لە قورئان و سوننەت و ئیجماعدا سەلمێنراوە، رواڵەتی فەرموودەکە روخسارێکی راستەقینەیە لە روخساری دروستکراوەکان ناچێت .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** نەهی هاتووە لە داواکردنی هەر شتێك بە روخساری خواوە ئیللا مەگەر ئەوپەڕی داواکارییەکان بێت کە بەهەشتە ( هەر لە ئەدەب نواندنە داوای هیچ شتێك نەکەیت بە روخساری خوا ئیللا ئەوەی لە کاروباری دوارۆژ نەبێت، ئەویش : بە دەستهێنانی بەهەشتە یان دوور کەوتنەوەیە لە ئاگر).

**دووەم :** سەلماندنی صیفەتی (الوجە) روخسار بۆ خوای گەورە .

حوکمی داواکردن لە صیفەتێك لە صیفەتەکانی خوا :

دروست نییە داوا لە صیفەت بکەیت، وەکو ئەوەی بڵێت : ئەی رەحمەتی خوا، ئەی روخساری خوا، ئەی عیززەتی خوا، ئەمە دوعایەکی تازەیە و لە دەقەکاندا نەهاتووە، وە لە سەلەفەوە نەهاتووە، شیخ الاسلام فەرموویەتی : (ئەوە کوفرە)

## ٥٧/ بەشی : ئەو بەڵگانەی دەربارەی ( لو – ئەگەر ) هاتوون ( وردەکاری تێدایە )

### بەشەکانی بەکارهێنانی وشەی ( لو – ئەگەر ) لە گەڵ حوکمەکەیدا :

**حەرامــــە و ڕەنگــــە خاوەنەکەی بەرەو کـوفر ببات :** لە جێگایەکدا کە بـەرنگاری شـەرعی پـێ بکرێتەوە :

﴿لَوۡ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٞ مَّا قُتِلۡنَا هَٰهُنَا﴾ : دووڕووەکان بەرنگاری شـەرعەکەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بوونـەوە، وتیـان : ئەگـەر گوێڕایـەڵی ئێمـەیان بکردبایە و هەروەکو ئێمە چۆن گەڕاینـەوە ئـەوانیش بگەڕیانەتەوە ئەوا نەدەکوژران، بۆیە لە شـەرعەکەی ئەو باشترمان دەستکەوت .

**حەرامە :** لـە جێگایەکـدا کە بەرنگاری قەدەری پێ ببێـتەوە :

﴿لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْ﴾ : واتــە : ئەگــەر ئــەوان بمایەنەتەوە ئەوا نەدەکوژران، جا ئـەوان بـەرنگاری قەدەری خوا بوونەوە .

**حەرامە :** ئەگەر هاتوو بۆ پەشـیمانی و حەسـرەت بێت :

(( لو أني فعلتُ كذا لكان كذا و كذا)) واتـە : ئەگـەر ئـەو کـارەم بکردایـە ئـەوا بـەم شـێوە و بـەو شـێوە ڕووی دەدا ) چـونکە پەشـیمانی وا لـە خاوەنەکـەی دەکـان تووشـی دڵتـەنگی و سـنگ تـەنگی بێـت، لـە کاتێکـدا خـوای گـەورە دەیـەوێت ئێمـە هـەردەم سنگمان فراوان بێت .

حەرامە : بەکار بهێنرێت بۆ بیانوو هێنانەوە بۆ سەرپێچییەکان :

﴿لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا﴾ : ئەمەش پوچەڵ و ناڕەوایە، بەڵام دروستە قەدەر بکرێتە حوججە لەسەر موصیبەتەکان نەك لەسەر سەرپێچییەکان، بەوەش دەزانرێت کە بەندەکە تەوبە دەکات و واز لە سەرپێچییەکە دەهێنێت.

ئەگەر هاتوو لە خەیردا بوو ئەوا خەیرە و ئەگەر هاتوو لە شەڕدا بوو ئەوە شەڕە، کاتێ بۆ ئاوات خواستن بە کار بهێنرێت .

(( لو أنَّ لي مالاً لعملت بعمل فلان ) واتە : ئەگەر پارەم هەبوایە ئەوا وەکو فلان کەس کارم دەکرد لە کردەوەی چاکە و خەیر )) جا ئەم کەسە خۆزگەی چاکەی خواست بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : (( فهو بنيته، فأجرهما سواء )) واتە : جا ئەو کەسە خۆی و مەبەستەکەی، وە پاداشتیان وەکو یەکە) کەچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو کەسەی فەرموو کە خۆزگەی خراپەی دەخواست : ((فهو بنيَّته، فوزرهما سواء )) واتە : جا ئەو خۆی مەبەستەکەی، وە تاوانەکەیان وەکو یەکە ) .

دروستە : مەبەست لێی تەنها هەواڵ بێت :

((لَوْ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا سقتُ الهدي)) واتە :، ئەگەر ئێستام ئەوسا بوایە منیش حەیوانی دیاری بەیتم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا) ئەمە هەواڵە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆزگە بە شتێك ناخوازێت خوای گەورە تەقدیری دژەکەی کردبێت، ئەمە وەکو ئەوەیە بڵێیت : ئەگەر ئامادەی دەرسەکە بوایەیت ئەوا سوودت وەردەگرت .

## بەڵگەی یەکەم تا سێیەم :

١/ خوای گەورە فەرموویەتی :﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا﴾

٢/ خوای گەورە فەرموویەتی :﴿الَّذِينَ قَالُوا لِإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُوا لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾

٣/ لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا هاتووە لە (ئەبو هورەیرە)وە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((احرص على ما ينفعك، واستعن بالله – عز وجل – ولا تعجزن، وإن أصابك شئ فلا تقلْ : لو أني فعلت كذا لكان كذا و كذا، ولكن قل : قدر الله وما شاء فعل، فإن لو تفتح عمل الشيطان)

واتە: سووربە لەسەر ئەوەی سوودی بۆت هەیەو پەنا بە خوا بگرەو تەمبەڵ و تەوەزەل مەبەو ئەگەر شتێکت تووش هات ئەوا مەڵێ : ئەگەر وام بکردایە ئەوا ئەوەو ئەوە روویدەدا، بەڵکو بڵێ : خوای گەورە ئەوەی ویستی لێبوو و تەقدیری بوو کردی، چونکە وشەی ئەگەر (لو) دەرگاو کارەکانی شەیتان دەکاتەوە)

- ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا﴾ : ئەمە لە ناڕەزایی دووڕووەکانە بەرانبەر بە شەرعی خوا، چونکە گلەییان کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە بێ ڕازیبوونی ئەوان دەرچوو بۆ جیهاد .
- وە دەکرێت ناڕەزایی بێت بەرانبەر بە قەدەر بە مانای ئەوەی : دەرنەچوین بۆ ئەوەی بکوژرێین .
- ﴿الَّذِينَ قَالُوا لِإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُوا لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾ : ئەمە نارازیبوونی تێدایە بەرانبەر بە ئیمانداران و بەرانبەر بە قەزا و قەدەری خوای گەورە، وە تەمبەڵی و تەوەزەلی لە جیهاد کردندا .

- هەرکەسێك نارازی بێت بەرانبەر بە قەدەر ئەوا خوای گەورەی بە خوای خۆی نەزانیوە و تەوحیدی جێ بەجێ نەکردووە .
- **ئەم فەرموودە چەند سوودێکی تێدایە لەوانە :**

١. سووربوون لەسەر ئەوەی سوود دەگەیەنێت و دوور کەوتنەوە لەوەی زەرەر دەگەیەنێت .

٢. پەنا بە خوا گرتن .

٣. بەردەوام بین لەسەر کارەکە و بێ دەسەڵاتی نەنوێنین، ئەم پلەیانە بۆ خۆتە .

٤. ئەگەر بە جیاواز لە مەبەستەکە روویدا ئەوا بۆ تۆ ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئەوە بە قەدەری خوا بووە، بۆیە کارەکە بگێڕەوە بۆ لای ئەو .

**مەسەلەکان :**

**یەکەم :** تەفسیری دوو ئایەتەکەی سورەتی آل عمران ( یەکێکیان نارازیبوونە بەرانبەر بە شەرع و دووەمیان نارازیبوونە بەرانبەر بە قەدەر) .

**دووەم :** نەهی ئاشکرا هاتووە دەربارەی وتنی (ئەگەر من ...) کاتێ شتێکت تووش بوو .

**سێیەم :** باسکردنی هۆکاری بابەتەکە ئەویش ئەوەیە کە دەرگای کار و کرداری شەیتان دەکاتەوە (بۆیە مرۆڤ توشی حەسرەت دەبێت و پەشیمان دەبێتەوە).

**چوارەم :** ڕێنمویی کردن بۆ وتنی گفتاری باش (خوای گەورە ئەوەی ویستی لێبوو و تەقدیری بوو کردی) .

**پێنجەم :** فەرمان کردن بە سوور بوون لەسەر ئەوەی سوود دەگەیەنێت، لە گەڵ پشت بەستن بە خوای گەورە .

**شەشەم :** نەهیکردن لە دژەکەی، ئەویش بێ دەسەڵاتی و تەمبەڵی و سستییە لەسەر ئەنجامدانی شتێك، چونکە ئەوە لە توانای مرۆڤدایە .

## ٥٨ / بەشی نەهیکردن لە جوێندان بە (با) (رازیبوون بە قەزا)

### بەڵگەی یەکەم :

لە (أبي بن كعب)ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((لا تسبوا الريح، فإذا رأيتم ما تكرهون فقولوا : اللهم إنا نسألك من خير هذه الريح، وخير ما فيها، وخير ما أُمِرَتْ به، ونعوذ بك من شر هذه الريح، وشر ما فيها، وشر ما أُمِرَتْ به) (صححه الترمذي) واتە : جنێو بە (با) مەدەن، جا ئەگەر شتێکتان بینی پێتان ناخۆش بوو ئەوا بڵێن : ئەی خودایە ئێمە داوای چاکەی ئەم (با)یەت لێدەکەین و چاکەی ئەوەی تێیدایەو چاکەی ئەوەی فەرمانی پێکراوە و پەنات پێدەگرین لە خراپەی ئەم (با)یەو خراپەی ئەوەی تێیدایەو خراپەی ئەوەی فەرمانی پێکراوە) .

- جوێندان بە (با) وردەکاری تێدایە، هەر وەکو ئەوەی لە باسی رۆژگاردا کردمان، وە نوسەر لێرەدا بە بەشێکی سەربەخۆ داینـاوە چونکە زۆر روودەدات، وە لەشەرعدا نەهی کراوە لە جوێندان و لەعنەت کردن بە گشتی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((لَيْسَ المؤْمِنُ بالطَّعَّانِ وَلا اللَّعّان وَلا الفاحِشِ وَلا البَذيء)) واتە : ئیماندار کەسێکی تانەدەر و نەفرەت فرۆش و بەد رەوشت و زمان پیس نییە) .
- هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((لا يَكُونُ اللَّعَّانُونَ شُفَعاءَ وَلا شُهَدَاءَ يَوْمَ القِيامَةِ)) واتە : لەعنەت فرۆشەکان نابنە شەفاعەتکار و شاهید لە رۆژی قیامەتدا)).
- وە دەربارەی جوێندان بە موسڵمان دەفەرموێت (ﷺ): ((سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ)) واتە : جوێندان بە موسڵمان خراپەکارییە و کوشتاریشی کوفرە).

- وە دەربارەی جوێندان بە مردووان دەفەرموێت (ﷺ): ((لا تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا)) واتە : جوێن بە مردووەکان مەدەن چونکە ئەوان گەیشتنە ئەوەی پێشیان خست ))
- وە دەربارەی جوێندان بە ولاخ و ئاژەڵ دەفەرموێت (ﷺ): ((لا تُصَاحِبُنا ناقَةٌ عَلَيْها لَعْنَةٌ )) واتە : وشترێکی لەعنەت لێکراو نابێت لە گەڵماندا بێت – لەسەفەرەکەماندا–))
- وە دەربارەی جوێندان بە (تا) دەفەرموێت (ﷺ): ((لا تَسُبُّوا الحُمَّى)) واتە : جوێن بە (تا) مەدەن))

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** نەهیکردووە لە جوێندان بە (با) ( نەهی حەرامبوونە، چونکە جوێندان بە (با) جوێندانە بەو کەسەی دروستی کردووە و ناردوویەتی )) .

**دووەم :** ڕێنمویی کردن بۆ وتنی قسەی سوود بەخش ئەگەر کەسێك شتێکی بینی پێی ناخۆش بوو ( لەوانە، دەڵێت : (ئەی خودایە من داوای ..... )، ئەمجار هۆکارە مادییەکانیش دەگرێتەبەر، وەکو خۆ پاراستن لێی بە دیوار یان هەرشتێکی تر.

**سێیەم :** ڕێنمویی کردن بۆ ئەوەی کە ئەو (با)یەش فەرمان پێکراوە .

**چوارەم :** ئەو (با)یە ڕەنگە فەرمانی پێکرابێت بە خەیر، وە ڕەنگە فەرمانی پێکرابێت بە شەڕ.

**دەرئەنجام :** پێویستە مرۆڤ نارازی نەبێت بەرانبەر بە قەزا و قەدەری خوای گەورە، وە جوێنی پێ نەدات، وە پێویستە ملکەچی فەرمانە گەردوونیەکانی خوای گەورە ببێت هەروەکو چۆن ملکەچی فەرمانە شەرعییەکانی دەبێت، چونکە ئەم دروستکراوانە ناتوانن هیچ شتێك بکەن ئیللا بە فەرمانی خوای گەورە نەبێت .

## ٥٩/ بەشی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت : ﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٖۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ﴾

- ﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ﴾: واتە (دووڕووەکان) گومانی نەفامەکان، کە کەسی گومانکار رێز و گەورەیی خوای نەدەزانی، جا ئەو گومانە گومانێکی باتڵە و لەسەر نەزانین بنیات نراوە، وە گومان بردن بە خوا دوو جۆرە :

١/ گومانی باش بە خوای گەورە ببات، وە ئەوانەی پەیوەستن پێوە :

أ. ئەوانەی پەیوەستن بەوەی لەم گەردوونەدا ئەنجامی دەدات، ئەوا پێویستە گومانی باش بە خوای گەورە ببەیت .

ب. ئەوانەی پەیوەستن بەوەی بە تۆی دەکات، پێویستە بەو پەڕی گومانی باش گومانی باش بە خوای گەورە ببەیت، بە مەرجێك ئەوەی گومانی باش پێویست دەکات هەتبێت کە ئەویش : ئیخلاص و شوێنکەوتنە .

٢/ گومانی خراپ بۆ خوای گەورە ببات : بۆ نمونە گومانی ئەوە ببات لە کردارەکانی خوادا نەفامی یان ستەم یان نمونەی ئەوانە هەیە، جا ئەوە لە گەورەترین حەرامکراوەکانە و ناشرینترین تاوانەکانە، هەروەکو دووڕووەکان و نمونەی ئەوان گومانی ناحەقیان برد .

## بەڵگەی دووەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِۚ عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۖ﴾

مەبەست لەوانە دووڕووەکان و موشریکەکانە، جا خراپەکاری لە هەموو لایەکەوە دەورەی داون .

پێشەوا (ابن القیم) لە تەفسیری ئایەتی یەکەمدا فەرموویەتی :ـ (ئەم گومانە تەفسیر کراوە بەوەی خوای گەورە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) سەر ناخات و کارەکە نامێنێ و لەناو دەچێ، هەروەها تەفسیر کراوە کەوا ئەوەی تووشی ئەوان هات بە قەدەری خواو حیکمەتی ئەو نەبووە، جا تەفسیر کراوە بەئینکار کردنی حیکمەت و ئینکار کردنی قەدەرو ئینکاری ئەوەی خوای گەورە کاری پێغەمبەرەکەی(ﷺ) تەواو بکات و دینەکەی سەربخات بەسەر هەموو دینەکاندا، ئەمەش گومانی خراپە کە دووڕووەکان و موشریکەکان گومانیان بەخوا دەبرد لەسورەتی (الفتح)دا، ئەمەش گومانی خراپە، چونکە ئەوە گومانێکە و لایەقی خوای گەورە نییەو لایەقی حیکمەت و ستایش و بەڵێنی ڕاستی ئەو نییە، هەرکەسێ وابزانێ کەخوای گەورە ناهەق زاڵ دەکات بەسەر حەقدا بەزاڵ بوونێکی بەردەوام تاوای لێ بێت حەقەکە لەگەڵیدا لەناو بچێت و نەمێنێ، یان ئینکاری بکات لەوەی ئەوەی ڕوویداوە بە قەزاو قەدەری خوای گەورە نییە، یان ئینکاری ئەوەی کرد کەقەدەرەکەی بۆ حیکمەتێکی تۆکمە نەبێ کە لایەق و شایستەی ستایش و حەمدی ئەو بێت، بەڵکو ئەوە تەنها لەبەر ویستێك بووە، جا ئەوە گومانی ئەوانەیە کە کوفریان کرد، بۆیە وەیل بۆ ئەو کەسانە کە کوفریان کرد بە ئاگرێك، زۆربەی خەڵکی گومانی ناهەق بەخوا دەبەن بەگومانێکی خراپ بەوەی تایبەتە بە خۆیان و بەوەی لەگەڵ جگە لەخۆیان دەکرێ، وەهیچ کەسێك لەوە سەلامەت نابێ ئیللا کەسێك خوای ناسی بێت و ناوو صیفەتەکانی خوای ناسی بێت کە واجبی حیکمەت و ستایشی ئەو دەکات، بۆیە با کەسی ژیر و ئامۆژگاریکار وریای خۆی بێت لەمەدا، با تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، با داوای لێخۆشبوون بکات لە خوای گەورە لەو گومان خراپ بردنە بە خوای گەورە .

ئەگەر بپشکنیت ئەوانەی دەتەوێ بیپشکنیت، دەبینی ئینکاری و عینادی هەیە بەرامبەر بەقەدەر و لۆمەی دەکات، وەپێشنیاری ئەوە دەکات جیاواز بێت لەگەڵ ئەوەی ڕوویداوە، وەباوەڕی وایە کەئەبوایە وابوایەو وابوایە، جا هەیە بە زۆری و هەیە بە کەمی، جا تۆش خۆت بپشکنە بزانە تۆ لەوە سەلامەتی ؟

فان تنج منها تنج من ذي عظيمة      والا فإني لا إخالكَ ناجياً

- ئەمە قسەی (ابن القيم) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە (زاد المعاد) باسی کردووە لە پاش غەزای ئوحود لە ژێر ناونیشانی ئەو حیکمەت و مەبەستە چاکانەی تێیدا بوو، وە کورتەی ئەوەی باسی کرد دەربارەی گومانی خراپ :

١. گومانی وابێت کەخوای گەورە ناهەق زاڵ دەکات بەسەر حەقدا بەزاڵ بوونێکی بەردەوام تا وای لێ بێت حەقەکە لەگەڵیدا لەناو بچێت و نەمێنێ.

٢. ئینکاری بکات لەوەی ڕوویدا بە قەزاو قەدەری خوا بووە، ئایە چۆن لە دەسەڵاتەکەی خوادا شتێك دەبێت کە ئەو نایەوێت ؟

٣. ئینکاری ئەوە بکات کەوا قەدەری خوای گەورە لەبەر حیکمەتێك بێت شایەنی ئەوە بێت ستایشی لەسەر بکرێت .

- وە پوختەی ئەوەی باسی کرد بۆ چارەسەری گومانی خراپ :

١. ناسینی ناو و صیفاتەکانی خوای گەورە بە ناسینێکی حەق نەك ناسینێکی تەئویل و تەحریف .

٢. بایەخدانی کەسی ژیر بە ئەمە تاوەکو گومانی باش بە خوای خۆی دەبات، نەك گومانی خراپ و گومانی نەفامی .

٣. گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە بە تەوبەکردن لەو سەرپێچییانە کردوویەتی بۆ گوێڕایەڵی و داوای لێخۆشبوون .

٤. گومانی خراپ بە خۆت ببەیت، چونکە مرۆڤەکان جێگای کەموکورتی و خراپەکارین.

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی آل عمران : ﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ﴾ وە راناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ دووڕووەکان .

**دووەم :** تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (الفتح) : ﴿ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ﴾ وە راناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ دووڕووەکان .

**سێیەم :** هەواڵدان بەوەی کە ئەوە چەندین جۆرە و حەصر ناکرێت (وە رێکخەرەکەی ئەوەیە کەوا گومان ببات بە خوای گەورە لایەقی ئەو نەبێت ).

**چوارەم :** هیچ کەسێك لەوە پارێزراو نابێت ئیللا ئەو کەسە نەبێت کە ناو و صیفاتەکانی خوای گەورەی ناسی بێت و خۆیشی ناسی بێت ( بۆیە بیپشکنە، لە راستیدا مرۆڤ خۆی جێگای کەموکورتی و خراپەکارییە، بەڵام خوای پەروەردگار جێگای کەمالی رەهایە کە بە هیچ شێوەیەك توشی کەموکورتی نابێت ).

## ٦٠/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی ئەوانەی ئینکاری لە قەدەرە دەکەن ( کوفری گەورەیە )

- **قەدەر :** نهێنی خوای گەورەیە لە دروستکراوەکانیدا، وە هیچی دەربارەی نازانین تاوەکو روو دەدات، وە پەیوەندی بە تایبەتی ها بە تەوحیدی پەروەردگارێتییەوە، وە پەیوەندی ها بە تەوحیدی ناو و صیفاتەکانیشەوە، وە خەڵکی لە باسی قەدەردا بوونەتە سێ بەشەوە :

١/ گرووی (الجبرية) : قەدەریان سەلماند و زیادەڕەوییان تێدا کرد، تاکو گەیشتە ئەوەی توانا و هەڵبژاردە لە عەبد داماڵن، وتیان : مرۆڤ هیچ هەڵبژاردە و توانایەکی نییە .

٢/ گرووی (القدرية المعتزلة) : هەڵبژاردە و توانایان بۆ عەبد سەلماند، وە زیادەڕۆییان کرد لەوەدا تاکو گەیشتە ئەوەی نەفی مەشیئەت یان دروستکردن بکەن بۆ خوای گەورە لە کرداری بەندەدا .

٣/ گرووی سێیەم ئەوانیش ئەهلی سوننە و جەماعەن : بەڵگەکانیان کۆکردووەتەوە و ڕێگای باشترینی ئەم میللەتەیان گرتووەتە بەر، بۆیە ئیمانیان بە قەزا و قەدەری خوای گەورە هێنا، وە مەشیئەت و ویستیان بۆ بەندە سەلماند کە پەیوەستە بە مەشیئەت و ویستی خوداوە .

ئیمان هێنان بە قەزا و قەدەر چەندین سوودی هەیە، لەوانە :

١. لە تەواوکاری تەوحیدی پەروەردگارێتییە .
٢. وا لە خاوەنەکەی دەکات بە ڕاستەوە پشت بە خوای گەورە ببەستێت .
٣. دڵەکان ئارام دەکاتەوە، ئەگەر زانیت ئەوەی تووشی تۆ بووە نەئەبوایە لێت لاییبدایەو تووشت نەبوایە، ئەوەی تووشت نەبوو نەئەبوایە تووشت ببێت، ئەوا دڵئارام دەبویت بەوەی توشت بووە لە پاش ئەنجامدانی هۆکارە سوود بەخشەکان .
٤. ڕێگر دەبێت لەوەی مرۆڤ بە خۆی بنازێت ئەگەر کارێکی کرد و سوپاسگوزاری بوون، چونکە خوای گەورە خۆی منەتی ڕژاندووە بە سەریدا .
٥. خەم ناخوات بۆ ئەوەی تووشی بووە، چونکە لە خوداوەیە، جا ئەوە لە میهرەبانی و حیکمەتی خوداوە سەرچاوەی گرتووە .
٦. مرۆڤ هۆکارەکان دەگرێتە بەر، چونکە باوەڕی بە حیکمەتی خوا هەیە، وە ئەو تەقدیری هیچ شتێك ناکات ئیللا پەیوەستە بە هۆکارەکانیەوە .

## بەڵگەی یەکەم:

(عبدالله ی کوڕی عمر) دەفەرموێت : سوێند بەو کەسەی گیانی (ابن عمر)ی بە دەستە، ئەگەر یەکێك لەوان بە قەد چیای ئەحوود ئاڵتونی بوایەو ئەمجار بیبەخشێت ئەوا خوا لێی وەرناگرێت تاكو باوەڕ بە قەدەر نەهێنێ، ئەمجار فەرموودەکەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کردە بەڵگە کە دەفەرموێت :

(( الإيمان، أن تؤمن بالله، وملائكته، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره)) رواه مسلم . واتە : ئیمان، ئەوەیە باوەڕی تەواو بهێنیت بە خوای گەورە و فریشتەکانی و کتێبەکانی و هەموو پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و وە باوەڕیش بە قەزاو قەدەر بهێنیت چ چاك بێت یان خراپ ))

**ئیمان :** بریتییە لە وتن بە زمان و باوەڕبوون بە دڵ و کارکردن بە ئەندامەکان، زیاد دەکات بە گوێڕایەڵی و کەم دەکات بە سەرپێچی ، شەش پایەی هەیە :



**(أن تؤمن بالله) باوەڕهێنان بە خوای گەورە، ئەم چوار کارە لە خۆ دەگرێت :**

باوەڕ هێنان بە بوونی خوای گەورە :

تەوحیدی پەروەردگارێتی (الربوبية)

تەوحیدی خوداوەندێتی (الألوهية)

تەوحیدی ناو و صیفاتەکان (الأسماء و الصفات)

**بە عەقڵ :** جا لای عەقڵ زۆر ئەستەمە کەوا باوەڕی وابێت دروستکراوێك هەبێت بە بێ دروستکار، ﴿ أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ﴾

**بە هەستەکان :** لە تەنگانە و ناڕەحەتییەکاندا دەبیت و دەستەکان بۆ ئاسمان بەرز دەکەیتەوە، دەبینی ئەم تەنگانەیە نامێنێ بە ئیزنی خوای گەورە، هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی ئوحوددا دوعای کرد .

**بە فیترەت :** پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : (كل مولود يولد على الفطرة، فأبواه يهودانه، أو ينصرانه، أو يمجسانه..)) واتە : هەموو منداڵێك لەسەر فیترەتی پاکی ئیسلام لە دایك دەبێت، جا دایك و باوکی دەیکەنە جولەکە یان دەیکەنە گاور یان دەیکەنە مەجوسی (ئاگرپەرست) .

**بە شەرع :** (ابن القيم) باسی ئەوەی کردووە کەوا هیچ ئایەتێك نییە لە کتێبەکەی خوادا ئیللا بەڵگەیەکی تێدایە لەسەر تەوحید .

- **(وملائكته) :** فریشتەکان : جیهانێکی غەیبین، خوای گەورە لە روناکی دروستی کردوون، گوێڕایەڵی خوا دەکەن و سەرپێچی ناکەن، ئەوان روحیان هەیە : ﴿ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ﴾، وە جەستەیان هەیە : ﴿ جَاعِلِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِيٓ أَجۡنِحَةٖ مَّثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ يَزِيدُ فِي ٱلۡخَلۡقِ مَا يَشَآءُۚ﴾ وە دڵ و عەقڵیان هەیە : ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ﴾ باوەڕمان پێیان هەیە، وە بەو ناوانەی خوای گەورە فێری کردووین وەکو (جبریل و میکائیل و ئیسرافیل ) وە باوەڕمان بە صیفاتەکانیان هەیە : ﴿ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ﴾ هەروەها بە کردارەکانیان (لەوانە ئەو هەشت فریشتەی کە عەرشی خوایان هەڵگرتووە) وە ئەو هەموو هەواڵانەی دەربارەیان هاتووە.
- **(وكتبه) :** پێویستە باوەڕمان هەبێت کەوا ئەوانە قسەی خوای گەورەن نەك بە مەجازی، لە لایەن خوداوە دابەزێنراون و دروستکراو نین، وە خوای گەورە لە گەڵ هەموو پێغەمبەرێکدا –(رسول)ێکدا– کتێبێکی ناردووە، وە باوەڕمان پێیان هەیە و بەو ناو و هەواڵ و ئەحکامانەی خوای گەورە بۆی باس کردووین بە گشتی و بە تەفصیلی، ئەگەر نەسخ نەکرابێتەوە، وە باوەڕمان وایە کەوا قورئان هەموو کتێبەکانی پێش خۆی نەسخ کردووەتەوە کە ئەوانیش : (تەورات و ئینجیل و زەبور و صوحوفی ئیبراهیم و موسا) ن .
- **(ورسله) :** پێویستە باوەڕمان وابێت کەوا ئەوان مرۆڤن و بە هیچ شێوەیەك لە تایبەتمەندیەکانی پەروەردگارێتیان تێدا نییە، وە ئەوان بەندەی خوان ناپەرسترێن و خوای گەورە رەوانەی کردوون و وەحی بۆ کردوون و بە

چەندین ئایەت و نیشانە پشتگیری کردوون وە ئەوان ئەو سپاردەی لەسەر شانیان بوو بە تەواوی گەیاندیان و ئامۆژگاری ئوممەتیان کرد و دینەکەیان پێ گەیاندن، وە لە پێناوی خوادا بەو پەڕی تێرو تەسەلی و شیاوی جیهادیان کردووە، باوەڕمان پێیان هەیە، وە بەو ناو و صیفات و هەواڵانەی خوای گەورە دەربارەیان فێری کردووین، وە یەکەم پێغەمبەران (أنبیاء) (ئادەم)ە و یەکەم نێردراوان (الرسل) (نووح)ە، وە دوایین پێغەمبەر و نێردراو (محمد)ە(ﷺ)، وە هەموو شەریعەتەکانی پێشوو بە شەریعەتەکەی (محمد) (ﷺ) نەسخ کراونەتەوە، وە (أُولوا العزم) پێنج دانەن کە لە هەردوو سورەتی (الشوری) و ( الأحزاب)دا باسکراون ئەوانیش: محمد ونوح ئیبراهیم و عیسا و موسا –صەلات و سەلامی خوای گەورە لە هەموویان بێت– .

- **(والیوم الآخر) :** باوەڕبوون بە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداوین لە پاش مردن روو دەدەن، وەکو : تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ و فووکردن بە کەڕەنادا و هەستانەوەی خەڵکی لە گۆڕەکانیان و تەرازوو و دەفتەری کردەوەکان و سیرات و حەوز و شەفاعەت و بەهەشت و ئاگر و بینینی خوای گەورە لە لایەن ئیماندارانەوە لە رۆژی قیامەتدا و لە بەهەشتدا، وە جگە لەوانەی کە روو دەدەن لە کاروبارە غەیبییەکان .
- **(وتؤمن بالقدر):** فرمانی (تؤمن)ی دووبارە کردەوە چونکە ئیمان هێنان بە قەدەر زۆر گرنکە، ئەویش چوار پلەی هەیە کە هۆنەر لەم دێرەدا باسی کردووە :

**علمٌ ، کتابةُ مولانا، مشیئته        وخلقه وهو إیجاد و تکوین**

**زانست** : باوەڕمان وابێت کەوا خوای گەورە زانیاری دەربارەی هەموو شتەکان بووە بە گشتی و تەفصیلی، بەڵگەش ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ ﴾

**نوسین** : باوەڕمان وابێت کەوا خوای گەورە مەقادیری هەموو شتەکانی نوسیوە تاکو قیامەت، وە بەڵگەش ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت : ﴿ وَمَا مِنۡ غَآئِبَةٖ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ ﴾

**ویست** : باوەڕمان وابێت کەوا ئەوەی خوای گەورە ویستی لێ بێت دەبێت و ئەوەی ویستی لێ نەبێت نابێت، وە بەندە ویستی خۆی هەیە بەڵام داخلی ویستی خوای گەورەیە، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾

**دروستکردن** : هیچ شتێك نییە ئیللا خوای گەورە دروستی کردووە و بەڕێوەی دەبات و دەسەڵاتی بە سەریەوە هەیە، تەنانەت کرداری دروستکراوەکانیش دروستکراوە، باوەڕمان وابێت کەوا بەندەکان دروستکراون، خۆیان و کردەوەکانیان، ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ ﴾

## بەڵگەی دووەم تا چوارەم

٢/ له (عبادة بن الصامت)ەوه هاتووه، کەوا بە کوڕەکەی خۆی فەرموو : ((يا بني، إنك لن تجد طعم الإيمان حتى تعلم أن ما أصابك لم يكن ليخطئك، وما أخطأك لم يكن ليصيبك، سمعت رسول الله (ﷺ) يقول : ((إنَّ أول ما خلق الله القلم، فقال له: اكتب، فقال : ربِّ ! وماذا اكتب؟ قال : اكتب مقادير كل شيء حتى تقوم الساعة) يا بنيَّ سمعت رسول الله (ﷺ) يقول : ((من مات على غير هذا فليس مني) وفي رواية لأحمد : ((إنَّ أول ما خلق الله تعالى القلم، فقال له : اكتب، فجرى في تلك الساعة بما هو كائن الى يوم القيامة ) واتە : ئەی کوڕە شیرینەکەم ، تۆ هەرگیز تامی ئیمان ناچێژی تاوەکو باوەڕت وا نەبێت کەوا ئەوەی تووشت بووە نەئەبوایە لێت لابیدایەو تووشت نەبێت، ئەوەی تووشت نەبوو نەئەبوایە تووشت ببێت، گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : یەکەمجار خوای گەورە قەڵەمی دروست کرد پێی فەرموو : بنووسە، وتی : پەروەردگارا ! چی بنووسم ؟ فەرمووی : مەقادیری هەموو شتێك بنووسە تاکو ڕۆژی قیامەت)) ئەی کوڕە شیرینەکەم گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: هەرکەسێك لەسەر ڕێبازێك جگە لەم ڕێبازە بمرێت ئەوا لە من نییە) وە لەریوایەتێکی تردا (أحمد) ریوایەتی کردووە : یەکەمجار خوای گەورە قەڵەمی دروست کرد پێی فەرموو : بنووسە، ئەویش لەو کاتەدا هەموو ئەوانەی نووسی کەوا دەبن و روو دەدەن تاکو ڕۆژی قیامەت).

٣/ وە لە ریوایەتێکی تردا کە (ابن وهب) ریوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((فمن لم يؤمن بالقدر خيره وشره أحرقه الله بالنار)) واتە : جا هەرکەسێك باوەڕ بە قەدەر نەکات خەیر و شەڕەکەی ئەوا خوای گەورە بە ئاگر دەیسوتێنێت)

٤/ وفي (المسند) و (السنن) عَنِ ابْنِ الدَّيْلَمِيِّ، قَالَ : أَتَيْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ فَقُلْتُ : فِي نَفْسِي شَيْءٌ مِنَ الْقَدَرِ، فَحَدِّثْنِي بِشَيْءٍ لَعَلَّ اللَّهَ يُذْهِبُهُ مِنْ قَلْبِي، فَقَالَ : لَوْ أَنْفَقْتَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، مَا قَبِلَهُ اللَّهُ مِنْكَ، حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ، وَتَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، و مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، وَلَوْ مُتَّ عَلَى غَيْرِ هَذَا لكنت من أهل النَّارِ، قَالَ : فأَتَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ و حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ و زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ فكلهم حَدَّثَنِي بمثل ذلك عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ))) حديث صحيح، رواه الحاكم في (صحيحه) .واتە : لە (المسند) و (السنن)دا هاتووە لە (ابن الديلمي)يەوە، دەڵێت : چووم بۆ لای (أبي بن كعب) وتم : لە نەفسمدا شتێك پەیدا بووە دەربارەی قەدەر، بۆیە شتێکم بۆ باس بکە بەڵکو خوای گەورە لێم دوور کاتەوە، وتی : (ئەگەر بە ئەندازەی چیای ئوحود ئاڵتون ببەخشیت، ئەوا خوای گەورە لێت وەرناگرێت تاوەکو باوەڕ بە قەدەر نەکەیت، وە بزانیت ئەوەی تووشت بووە نەئەبوایە لێت لایبدایەو تووشت نەبوایە، ئەوەی تووشت نەبوو نەئەبوایە تووشت ببێت، وە ئەگەر بمریت لەسەر جگە لەم باوەڕە ئەوا دەبێتە یەکێك لە ئەهلی ئاگر ). دەڵێت : چووم بۆ لای (عبدالله بن مسعود) و ( حذيفة بن اليمان) و ( زيد بن ثابت) هەموویان هەمان قسەیان بۆ کردم لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ).

- **(حَتَّى تَعْلَمَ) :** خوای گەورە لە قورئانەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەم مانایە کردووە و دەفەرموێت : ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ۝٢٢ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ۝٢٣﴾

- **(يا بُنيَّ) :** بەڵگەی نەرمونیانی تێدایە لە گەڵ منداڵەکاندا بە ئامۆژگاری، وە پێویستە ئەحکامەکان بە منداڵان بگوترێت و بەڵگەکەشی لە گەڵدا بێت :

١/ بۆ ئەوەی منداڵەکەت رابهێنیت لەسەر شوێنکەوتنی بەڵگەکان .

٢/ وە بۆ ئەوەی پەروەردەی بکەیت لە سەر خۆشویستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

- **(في نَفْسي شَيْءٌ) :** ئەوەی لە ناخی (الديلمي)دا بوو بەڵگەیە لەسەر ترسناکی دانیشتن لە گەڵ بیدعاکاراندا، ئەوانەی گومانیان لە قەدەر بۆ دروست بوو، وە گومانەکانیش بە بەڵگە لادەچن و نامێنن، وە بە عەقڵ لاناچێت بەڵکو زیادی دەکات .

- **(القَلَمُ) :** بە دوو ریوایەت هاتووە بە (ضمة) و بە (فتحة) :

١/ بە (ضمة) ئەوا بە مانای ئەوەیە کە یەکەم شت خوای گەورە دروستی کردووە بە گوێرەی ئەوانەی ئێمە دەیبینین لە دروستکراوەکان، وەکو ئاسمانەکان و زەوی، جا ئەمە یەکەمینی (نسبی)یە، ابن القيم فەرموویەتی :

والناس مختلفونَ في القلم الذي ... كُتِبَ القضاءُ به من الديَّانِ

هل كان قبل العرش أو هو بعده ... قولان عند أبي العلا الهمذاني

والحق أن العرش كان قبلُ لأنهُ ... قبل الكتابة كان ذا أركان

٢/ بە (نصب – فتحة) مانای ئەوە دێت کەوا خوای گەورە فەرمانی کردە قەڵەم بنوسێت کاتێ یەکەم جار دروستی کرد .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** ڕوونکردنەوەی فەرزبوونی باوەڕبوون بە قەدەر .

**دووەم :** ڕوونکردنەوەی چۆنییەتی باوەڕهێنان بە قەدەر (بەوەی باوەڕمان بە هەرچوار پلەکەی هەبێت).

**سێیەم :** پووچەڵبوونی کرداری ئەوەی باوەڕی پێی نەبێت ( ئەوە کەسێکی کافرە بە کوفری گەورە)

**چوارەم :** هەواڵدان بەوەی هیچ کەسێك تامی ئیمان ناچێژێت تاوەکو باوەڕی پێ نەکات .

**پێنجەم :** باسی یەکەم شت خوای گەورە دروستی کردووە ( گومانی تێدا نییە کە دروست کردنی قەڵەم لە پاش دروست کردنی عەرشەوە بووە، وە قەڵەم یەکەم شتە لەو دروستکراوانەی ئێمە دەیبینین، جا ئەو لە پێش ئاسمانەکان و زەوی دروست کراوە، کەواتە یەکەمینەکەی (نسبي)یە .

**شەشەم :** مەقادیری شتەکانی نووسییەوە لەو کاتەوە تاوەکو قیامەت (وە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە خوای گەورە لە گەڵ بێ گیانەکاندا دەدوێت، وە ئەویش تێ دەگات لە فەرمانەکانی خوا، چونکە خوای گەورە فەرمانی کردە قەڵەم و ئەویش وەڵامی فەرمانەکەی دایەوە )

**حەوتەم :** بەریبوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوانەی باوەڕیان پێی نییە ( ئەو کەسێکی کافرە بە کوفرێك خاوەنەکەی لە ئیسلام دەر دەکات).

**هەشتەم :** نەریتی پێشین وابووە بۆ لادانی گومانەکان پرسیاریان لە زانایان کردووە ( وە دروستە پرسیار لە یەك زانا زیاتر بکرێت بە مەبەستی جێگر بوونی بابەتەکە نەك بۆ دۆزینەوەی روخصەتێك).

**نۆیەم :** زانایان وەڵامیان دایەوە بەوەی گومانەکەیان نەهێشت، ئەوانیش قسەکەیان داوە پاڵ تەنها پێغەمبەری خوا (ﷺ) (بەم شێوەیە گومانەکان بە تەواوی لای کەسی موسڵمان دەڕوێتەوە و نامێنێت، وە هیچ ڕێگرییەك نییە بەڵگە عەقڵی یان هەستپێکراوەکان بهێنیتەوە بۆ ئەوەی بەرانبەر قایل بێت و ئەوەی رای وەکو تۆیە پێی دڵنیا بێتەوە، وە بەڵگەیەکی چوارەمی تێدایە کە ئەویش بەڵگەی فیترەتە).

## ٦١/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی وێنەکێشان هاتوون (هەڕەشەیەکی توندیان لێکراوە)

١. لە وێنەکێشاندا دروستکردن و داهێنانی هەیە، بەوەش کەسی وێنەکێش بەشدار دەبێت لە گەڵ خوادا لە دروستکردن و داهێناندا .

٢. یەکەم شەرێك دانانێك لەسەر زەویدا روویدا لە قەومی نوحدا بوو هۆکارەکەی وێنە و پەیکەر بوو .

## بەڵگەی یەکەم تا پێنجەم :

١. لە (ئەبو هورەیرە)وە – رەزای خوای لێ بێت – ریوایەت کراوە و دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی : (قال الله تعالى : ومن أظلم ممن ذهب يخلق كخلقي؟! فليخلقوا ذرة، أو ليخلقوا حبةً أو ليخلقوا شعيرة ) (أخرجاه) واتە : خوای گەورە فەرمویەتی : چی کەسێك هەیە لەو کەسە ستەمکارتر بێت دەڕوات وەکو دروستکراوەکانی من دروست دەکات؟! دەبا بڕوات میروویەك دروست بکات یان دەنکە تۆوێك دروست بکات یان دەنکە جۆیەك دروست بکات).

٢. ئیمامی بوخاری و موسلیم لە دایکە عائیشەوە– رەزای خوای لێ بێت – ریوایەتیان کردووە کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی : (أشد الناس عذاباً يوم القيامة الذين يُضاهئون بخلق الله) واتە : سەختترین کەس سزا دەدرێت لە رۆژی قیامەتدا ئەوانەن کە هاوشێوەی خوای گەورە دەیانەوێت دروست بکەن).

٣. ئیمامی بوخاری و موسلیم–رەحمەتی خوایان لێ بێت– لە ئیبن عەبباسەوە– رەزای خوای لێ بێت – ریوایەتیان کردووەو دەڵێت : گوێم

لێ بوو کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (كل مصور في النار، يُجعل له بكل صورة صوَّرها نفس يُعذَّب بها في جهنم ) واتە : هەموو وێنەکێشێك لە ئاگردایە، بۆ هەر وێنەیەك وێنەی کێشابێت نەفسێك دروست دەکرێت لە جەهەنەمدا عەزابێ پێ دەدرێت) .

٤. ئیمامی بوخاری و موسلیم–رەحمەتی خوایان لێ بێت– لە ئیبن عەبباسەوە– رەزای خوای لێ بێت – ریوایەتیان کردووە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ): (من صوَّر صورة في الدنيا، كُلِّفَ أن يُنفخَ فيها الروح، وليس بنافخ ) واتە : هەرکەسێك وێنەیەك بکێشێت لە دونیادا، داوای لێدەکرێت –لە رۆژی قیامەتدا– روح بە بەریاندا بکات، وە هیچ کەسێك ناتوانێت روحیان بەبەردا بکات).

٥. ئیمامی موسلیم – رەحمەتی خوای لێ بێت– لە (أبو الهياج)ەوە ریوایەتی کردووە و دەفەرموێت : ئیمامی عەلی – رەزای خوای لێ بێت– پێی گوتم: (ألا أبعثك على ما بعثني عليه رسول الله (ﷺ)؟ : (( أن لا تدع صورة إلا طمستها، ولا قبرا مشرفا إلا سويته) واتە : ئایە رەوانەت بکەم بۆ ئەو کارەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی بۆی رەوانە کردووە ؟ هیچ وێنەیەك مەهێڵە ئیللا بیدڕە و هیچ گۆڕێکی ئاشکراو بەرز مەهێڵە ئیللا لە گەڵ زەویدا راستی بکەرەوە)

## سزای وێنەكێش :

١. لە هەموو خەڵكی سزاكەی توندترە یان یەكێكە لەوانەی سزایان لە هەموو كەس سەختترە.

٢. كەسێكی لەعنەت لێكراوە .

٣. خوای گەورە بۆ هەر وێنەیەك نەفسێك دروست دەكات و لە ئاگری جەهەنەمدا سزا دەدرێن.

٤. ئەو لە ئاگردایە .

٥. داوای لێ دەكرێت روح بە بەریاندا بكات، وە هیچ كەسیش ناتوانێت روح بە بەریاندا بكات.

٦. هیچ كەسێك لەو ستەمكارتر نییە لەم باسەدا، یان ئەو لە لوتكەی ستەمدایە.

- **(طَمَسْتَهَا) :** ئەگەر رەنگاو رەنگ بوو ئەوا رەنگێكی تر بە سەریدا دەهێنیت و شێوەكەی ناهێڵێت، وە ئەگەر پەیكەر بوو ئەوا سەری لێ دەكەیتەوە، وە ئەگەر حەفر بوو ئەوا بە سەر دەموچاویدا حەفر دەكەیت تاوەكو شێوازەكەی نەمێنێت، جا (طمس) جیاوازە، وە رواڵەتی فەرموودەكە بۆ هەموویانە، ئەوانەی دەپەرسترێن و ئەوانەی ناپەرسترێن.
- **(مُشْرِفاً) :** واتە : بەرز، **(سَوَّيْتَهُ) :** دوو مانای هەیە :

١. بە شێوەیەك رێكی بخەیت بە پێی شەریعەت بێت .

٢. یەكسانی بكەیتەوە لە گەڵ قەبەركانی دەورو بەریدا .

## بەشەكانی گرتنەخۆی وێنەكان :

١. لەبەر بە مەزن زانینی ئەوەی وێنەی گیراوە : ئەمە حەرامە بە بێ گومان، چونكە بە مەزن دانانی خاوەن دەسەڵاتەكان بە گرتنەخۆی وێنەكانیان

کەلێنێکە لە تەوحیدی پەروەردگارێتی، وە بە مەزن دانانی پیاوچاکان بە گرتنەخۆی وێنەکانیان کەلێنێکە لە لایەن تەوحیدی خوداوەندێتی.

٤. بۆ خۆشی : بە تەماشا کردنی یان چێژ وەرگرتن، ئەمەش حەرامە لەبەر ئەو فیتنەیەی تێیدایە.

٥. بۆ یادگاری لەبەر سۆز و خۆشەویستی، وەکو ئەوانەی وێنەی منداڵەکانیان دەگرن، ئەمەش حەرامە .

٦. ناچار بێت بە گرتنەخۆی وێنەکانیان، وەکو ئەو وێنانەی لەسەر پارەو تەسکەرەو جنسیێ، ئەمە تاوانی تێدا نییە، چونکە ناتوانی خۆتی لێ دووربکەیتەوە .

٧. لەبەر ئەوەی پاشکۆی شتی ترە، بە هیچ شێوەیەك حەزی لێی نییە، وەکو ئەو وێنانەی لە رۆژنامەکاندا هەیە، ئەمە ئاساییەو بەڵام ئەگەر توانرا لەناو ببرێت بە بێ ئەزێت و مەشەققەت ئەوە لەناودانی لە پێشترە.

٨. سووك کرابێت بە فرێدانی لە زبڵدانەکاندا یان لە زەوییەکەدا بێت و پێی بەسەردا بنرێت ئەوا ئاساییە، وە ئەمە ئەو جلوبەرگانە ناگرێتەوە کە وێنەی لەسەرە.

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** توندی نواندن بەرانبەر بە وێنەکێشان .

**دووەم :** ئاگادارکردنەوەی هۆکارەکەی، ئەویش وازهێنانی ئەدەبە لە گەڵ خوادا، بە بەڵگەی ئەو فەرموودە قودسییە : (( ومن أظلم ممن ذهب يخلق كخلقي؟! )) واتە : چی کەسێك هەیە لەو کەسە ستەمکارتر بێت دەڕوات وەکو دروستکراوەکانی من دروست دەکات ؟!) جا ئەوە بێ ئەدەبی نواندووە بەرانبەر بە خوای گەورە وەکو ئەو کەسەیە کە لە شەرعەکەیدا دژایەتی بکات، هیچ کەسێك لەو ستەمکار تر نییە).

**سێیەم :** وریاکردنەوە لەسەر تواناو دەسەڵاتی و خوا و بێ دەسەڵاتی ئەوان، بە بەڵگەی : (فليخلقوا ذرة أو شعيرة ) واتە : دەبا بڕوات مێروویەك دروست بکەن یان دەنکە جۆیەك دروست بکەن) (چونکە خوای گەورە زۆر لەوانە گەورەتری دروست کردووە کەچی ئەوان بێ توانا و بێ دەسەڵات بوون لە دروستکردنی مێروویەك یان دەنکە جۆیەك).

**چوارەم :** راگەیاندنی بە راشکاوی کە ئەوانە سزایان لە هەموو کەس زیاترە.

**پێنجەم :** خوای گەورە بە ژمارەی هەر وێنەیەك نەفسێك دروست دەکات و لە جەهەنمدا سزایان دەدات .

**شەشەم :** داوای لێدەکرێت کە روح بە بەریاندا بکات ( لە سەختترین سزاکانە)

**حەوتەم :** فەرمان کردن بە لە ناوبردنی ئەگەر هەبوو ( وە لەم فەرموودەدا کۆی کردووەتەوە لە نێوان فیتنەی پەیکەر و فیتنەی گۆڕەکان، چونکە لە هەر یەکێکیاندا رێگایەك هەیە بۆ شیرك، وە سەلماندنی سزا لە رۆژی قیامەتدا، وە سزا لە جۆر و جنسی کارەکەیە، وە داواکردنی شتێك لە رۆژی دواییدا کە ئەوەی داوای لێ دەکرێت ناتوانێت بیکات وەکو سزایەك).

## ٦٢/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی زۆر سوێند خواردن هاتوون ( هەڕەشەن - لەبەر بە مەزن ڕاگرتنی خوا ).

### بەڵگەی یەکەم :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡۚ﴾

### پلەکانی پاراستنی سوێند :

- پاراستنی هەر لە سەرەتاوە : ئەویش بەوەی زۆر سوێند نەخوات .
- پاراستنی لە ناوڕاستەوە : بەوەی سوێندەکەی نەشکێنێت، ئیللا ئەوەی لێی بەدەر هاتووە.
- پاراستنی لە پاشییەوە : بەوەی کەفارەتەکەی بدات ئەگەر سوێندەکەی شکاند .
- بەوەی سوێند نەخوات تەنها بە خوا نەبێت .

### بەڵگەی دووەم تا شەشەم :

٢. لە (ئەبو هورەیرە)وە ڕیوایەت کراوە کەوا فەرموویەتی : گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : ( الحلف منفقة للسلعة، ممحقة للكسب ) أخرجاه.
واتە : سوێند خواردن ماڵفرۆشە، بەڵام داهات و کەسابەت لەناوبەرە).

٣. هەروەها لە (سەلمان)ـەوە هاتوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:
((ثلاثة لا يكلمهم الله و لا يزكيهم، و لهم عذاب أليم : أشيمط زانٍ، وعائل مستكبر، و رجل جعل الله بضاعته، فلا يشتري إلا بيمينه، و لا يبيع إلا بيمينه) رواه الطبراني بسند صحيح . واتە : سێ کەس هەن خوای گەورە قسەیان لە گەڵدا ناکات و تەزکیەیان ناکات و سزایەکی سەختیان بۆ هەیە : بەتەمەنێکی زیناکار، وە هەژارێکی لەخۆبایی، وە کابرایەك خوای کردووەتە کاڵا و

کوتاڵ (کەل وپەلی بازرگانی)، بۆیە هیچ شتێك ناکڕێت ئیللا لە ڕێگای سوێندەکەیەوە نەبێت و هیچ شتێك نافرۆشێت ئیللا لە ڕێگای سوێندەکەیەوە نەبێت )).

٤. لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا هاتووە لە (عمران ی کوڕی حصین) ەوە کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی : (( خير أُمتي قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم )) – قال عمران : فلا أدري أذكر بعد قرنه مرتين أو ثلاثاً !– ثم إنَّ بعدكم قوماً يشهدونَ ولا يستشهدون، ويخونونَ ولا يؤتَمنون، وينذرون ولا يوفون، ويظهر فيهم السمن)) واتە : باشترینی ئوممەتەکەم ئەوانەی ئەم سەدەیەن، پاشان ئەوانەی لە پاش ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی پاش ئەوان دێن )) (عمران) فەرمووی : نازانم پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پاش ئەوە دوو سەدەی فەرموو یان سێ سەدە) – ئەمجار لە پاش ئەوان کۆمەڵێك دێن شایەتی دەدەن بە بێ ئەوەی داوای شایەتییان لێ بکرێت، وە خیانەت و ناپاکی دەکەن و کەس ئەمانەتیان لا ناپارێزی، وە نزر دەکەن و جێ بە جێی ناکەن، وە قەڵەوی لە ناویاندا بڵاو دەبێتەوە ))

٥. وە لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا هاتووە لە (ابن مسعود)ەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (( خَيْرُ الناس قرني، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَجِيءُ قَوْمٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ)) واتە : باشترینی خەڵکی ئەوانەی ئەم سەدەیەن، ئەمجار ئەوانەی لە پاش ئەوان دێن و ئەمجار ئەوانەی پاش ئەوان دێن، ئەمجار کۆمەڵێك دێن شایەتییەکەیان پێش سوێندەکەیان دەکەوێت، وە سوێندەکەیان پێش شایەتییەکەیان (واتە بە بێ ئەوەی داوایان لێ بکرێت سوێند دەخۆن بە زۆری).

٦. قال ابراهيم : (( وكانوا يضربوننا على الشهادة والعهد ونحن صغار)) واتە : ئەوان –مەبەستی گەورەکان و پەروەردەکارانیان – لەسەر شایەتی و پەیمان لێیان دەداین لە کاتێکدا ئێمە بچووك بووین))

- **(منفقة) :** واتـــه ڕەواجـــدان بـــه کاڵاکـــان، (ممحقة) واتـــه : داهـــات و کەسابەتەکەی لە ناو دەچێت .
- **(ولا يزكيهم) :** لـه ڕۆژی قیامەتـدا متمانـەیان پـێ ناکـات و بـه ڕاسـتگۆیان نازانێت و شایەتی ئیمانیان بۆ نادات .
- **(أشيمط) :** ئـەو کەسـەیە کـە قـژی سـەری ڕەش و سـپی بووەتـەوە لەبـەر گەورەیی تەمەنی، وە شەهوەتی سارد بووەتەوە .
- **(عائل) :** هەژار، (مستكبر) : بەرانبەر بە حەق و خەڵکی .
- **(لا يشتري إلا بيمينه) :** زۆری سوێند خواردنی هەست بەوە دەکرێت کە بـە کەمی دەزانێت و بە سووک تەماشای سوێندەکەی دەکات .
- **(ولا يستشهدون) :** یان پەلـە دەکـەن لـە شـایەتیدانا یـان شـایەتی ناحـەق دەدەن .
- **(تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ) :** ١/ لەبەر کەم متمانەیی پێیان شایەتی نـادەن ئیللا سوێندی لە گەڵدا دەخۆن .

٢/ یان مەبەستی ئەوەیە کە ئەوانە گوێ بە شایەتی و سوێند نادەن .

**مەسەلەکان :**

**یەکەم :** وەصێت کردن بە پاراستنی سوێندەکان .

**دووەم :** هەواڵـدان بـەوەی کـە سـوێندخواردن ڕەواج دەداتـه کاڵاکـان، بـەڵام بەرەکەت لەناو دەبات.

**سێیەم :** هەڕەشـەیەکی تونـد لـەو کەسـانەی کـە نافرۆشـێت ئـیللا بـه سـوێند نەبێت وە ناکڕێت ئیللا بە سوێند نەبێت .

**چوارەم :** وریاکردنەوە لەوەی کـە تاوانـەکان گـەورەتر دەبـن ئەگـەر پێویسـتی کەسەکە پێی کەمتر بێت .

**پێنجەم :** زەمی ئەو کەسانەی کە سوێند دەخۆن و کەچی داوایان لـێ ناکرێـت سوێند بخۆن (ئیللا بۆ پێویستی نەبێت یان لەبەر بەرژەوەندییەك)

**شەشەم :** ستایشی ئەو سێ سەدەیە یان چوار سـەدەیە لـە لایـەن پێغەمبـەری خواوە (ﷺ) و باسی ئەوەی لە پاش ئەوان روو دەدات .

**حەوتەم :** زەمی ئـەو کەسـانەی شـایەتی دەدەن کەچـی داوای شـایەتیان لـێ ناکرێت ( وە خیانەت دەکەن و متمانەیان پێ ناکرێت و نزر دەکـەن و بـە جێـی ناگەیەنن و هۆکارەکانی قەڵەوی دەگرنەبەر کەچی بێ ئاگـان لـە قەڵـەو کردنـی دڵیان بە عیلم و ئیمان).

**هەشـتەم :** پێشـین لـە منداڵـەکانی خۆیانیـان دەدا لەبـەر شـایەتی و پـەیمان بەسـەر بـردن (لەبـەر مـەزن راگـرتنی شـایەتی و پـەیمان و بایـەخیان بـە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان، وە بـۆ دروسـتی لێـدانی منـداڵ چـەند مـەرجێك هەیە :

١/ دەبێ بچووکەکە ئەدەبی پێ وەرگرێت، منـداڵێك نـەزانێت بـۆ لێـی دەدرێـت ئەوا لێی نادرێت.

٢/ ئەو کەسەی لێی دەدات ویلایەتی بە سەرییەوە هەبێـت .

٣/ زیادەڕەوی نەکات لە چەندێتی یان چۆنییەتی یان جۆرەکەی یان جێگاکەی یان جگە لەوانە .

٤/ دەبێ منداڵەکە شتێکی کردبێت شایەنی ئەو لێدانە بێت .

٥/ مەبەستی تەمێ کردنی بێـت نـەك تۆڵـەی خـۆی لـێ بسـێنێتەوە، ئەگـەر نـا ئەوە مەبەستی سەرخستنی خۆیەتی نەك تەمێکردن).

## ٦٣/ بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی زیممەتی خوا و زیممەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هاتوون (ئیخلاص و شوێنکەوتن)

بێ وەفایی بە پەیمانی خوای گەورە بە کەمزانینی ئەوە، ئەمەش خەلەل دەخاتە ناو تەوحیدەوە، جا بە مەزن راگرتنی خوای گەورە پێویستە لە مامەڵەکردندا لە گەڵ خەڵکیدا بە دی بکرێت هەرچەندە کەسەکان کافریش بن، هەرچەندە لە سەختترین کاتدا بێت، کە ئەویش جیهادکردنە لە پێناوی خوادا، بۆیە شەریعەت مەحکەم دەکات و زیممەتی خوا و زیممەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بە مەزن دەزانێت .

### بەڵگەی یەکەم و دووەم :

١/ خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَـٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَـٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾

٢/ وعَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)إِذَا أَمَّرَ أَمِيرًا عَلَى جَيْشٍ أَوْ سَرِيَّةٍ أَوْصَاهُ فِي خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا، فقَالَ « اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ، قاتلوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، اغْزُوا وَ لاَ تَغُلُّوا، وَلاَ تَغْدِرُوا، وَلاَ تَمْثُلُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدًا، وَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلاَثِ خِصَالٍ – أَوْ خِلاَلٍ – فَأَيَّتُهُنَّ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ، وَكُفَّ عَنْهُمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ، فَإِنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ، وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ إِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ فَلَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ، وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ، فَإِنْ أَبَوْا أَنْ يَتَحَوَّلُوا مِنْهَا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ، يَجْرِى عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللَّهِ تعالى، وَلاَ يَكُونُ لَهُمْ فِي الْغَنِيمَةِ وَالْفَيْءِ شَيْءٌ، إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَاسأَلْهُمُ الْجِزْيَةَ، فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا

فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَقَاتِلْهُمْ، وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهُمْ ذِمَّةَ اللَّهِ وَذِمَّةَ نَبِيِّهِ، فَلاَ تَجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّةَ اللَّهِ وَ ذِمَّةَ نَبِيِّهِ، وَلَكِنِ اجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّتَكَ وَذِمَّةَ أَصْحَابِكَ، فَإِنَّكُمْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَمَكُمْ وَذِمَمَ أَصْحَابِكُمْ، أَهْوَنُ مِنْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ اللَّهِ وَذِمَّةَ نبيه، وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ، فَلاَ تُنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ، وَلَكِنْ أَنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِكَ، فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي أَتُصِيبُ حُكْمَ اللَّهِ فِيهِمْ أَمْ لاَ ) رواه مسلم. واتە : لە (بورەیدە)وە – ڕەزای خوای لێ بێت– هاتووە دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر ئەمیرێکی دیاری بکردایە بۆ لەشکرێك یا سرییەیەك، وەصێتی پێ دەکرد بە تەقوای خوا و ئەوانەی لە گەڵیدان لە موسڵمانان بە خەیر، فەرمووی : (( غەزا بکەن بە ناوی خواوە، بجەنگن لە پێناوی خوادا بەرانبەر بەوانەی کوفریان بە خوا کردووە، غەزا بکەن و لە غەنیمەت مەبەن تا دابەش دەکرێت و پەیمان شکێن مەبن و جەستەی کوژراوەکان مەشێوێنن، وە منداڵ مەکوژن، وە ئەگەر بە دوژمنەکەتدا گەیشتیت لە موشریکەکان ئەوا بانگیان بکە بۆ سێ ئاکار – یان : سێ شت – هەرکام لەوانە وەڵامی دانەوە ئەوا لێیان وەرگرە – پێی ڕازی بە– و وازیان لێ بهێنە، ئەمجار بانگیان بکە بۆ ئیسلام، ئەگەر وەڵامیان دایتەوە ئەوا لێیان وەرگرە، ئەمجار داوایان لێ بکەن کەوا لە جێگای خۆیانەوە کۆچ بکەن بۆ لانەی کۆچەران، وە پێیان بڵێ : ئەگەر ئەوان ئەو کارەیان کرد ئەوا هەرچی مافێك بۆ کۆچەران هەیە بۆ ئەوانیش دەبێت و ئەوەی لەسەر کۆچەرانە لەسەر ئەوانیش دەبێت، جا ئەگەر ڕازی نەبوون کۆچ بکەن، ئەوا هەواڵیان پێ بدە ئەوان هەروەکو موسڵمانە دەشتەکییەکان دەبن، حوکمی خوایان بەسەردا جێ بە جێ دەبێت، وە لە دەستکەوت و غەنیمەت هیچیان بۆ نییە، ئیللا دەبێت لە گەڵ موسڵمانانمدا جیهاد بکەن – ئەو کات بۆیان دەبێت– جا ئەگەر ڕازی نەبوون – بە موسڵمان بوون– ئەوا داوای سەرانەیان لێ بکە –

جزية– جا ئەگەر وەڵامی تۆیان دایەوە ئەوا پێی رازی بە و وازیان لێ بهێنە، بەڵام ئەگەر رازی نەبوون ئەوا پشت بە خوا ببەستە و لە گەڵیاندا بجەنگە، وە ئەگەر دەوری قەڵایەکت دا و ویستیان زیممەتی خوا و زیممەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نێوانتاندا هەبێت ئەوا با زیممەتی خوا و زیممەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نێوانتاندا نەبێت، بەڵام با زیممەتی خۆت و هاوەڵانت لە نێوانتاندا هەبێت، چونکە ئەگەر ئێوە زیممەتی خۆتان و هاوەڵانتان بشکێنن سوکترە لەوەی زیممەتی خوا و زیممەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بشکێنن، وە ئەگەر دەوری قەڵایەکت دا و داوایان لێ کردی کە حوکمی خوایان بەسەردا جێبەجێ بکەیت، ئەوەیان لە گەڵدا مەکە، بەڵکو حوکمی خۆتیان بەسەردا جێ بە جێ بکە، چونکە تۆ نازانی کە ئایا وەکو پێویست ئەتوانی بڕیار و حوکمی راستی خوایان بەسەردا جێبەجێ بکەیت یان نا))

- **(جَيْشٍ) :** ئەو سوپایەیە کە لە چوار سەد کەس زیاترە .
- **(أو سرية) :** سریە لە چوار سەد کەس کەمترە .
- **(اغزوا باسم الله) :**

١/ پشت بە خوا ببەستن ٢/ غەزاکەتان بە ناوی خواوە دەست پێ بکەن .

- **(في سبيل الله) :** نیەت و کرداریش دەگرێتەوە .
- **(من كفر بالله) :** مەجەنگە لە گەڵ خەڵکیدا لە پێناوی دەمارگیریدا یان نەتەوە یان نیشتمان، بجەنگە لە گەڵیاندا لەبەر بەرژەوەندی خۆیان ئەویش رزگار کردنیانە لە ئاگر، وە کوفریش بە دەوری دوو تەوەردا دەسوڕێتەوە : نکۆڵی و ئینکارکردن .
- **(ولا تغلوا):** بەوەی شتێك لە دەستکەوتەکان بشارێتەوە بۆ خۆی، ئەمەش یەکێکە لە تاوانە گەورەکان .

- (ولا تغدروا) : ئەگەر پەیمانمان دا خیانەت ناکەین، بەڵام پلانێك بەسەر دوژمندا بە بێ پەیمان ئەوا دروستە چونکە جەنگ بریتییە لە فێڵ .
- (ولا تمثلوا) : شێواندن بە بڕینی هەندێ لە ئەندامەکانی کە پێویستی پێی نییە، چونکە ئەو تۆڵە سەندنەوە لە جێگای خۆیدا نییە، ئیللا مەگەر ئەوان جەستەی کوژراوەکانی ئێمەیان شێواند .
- (وليداً) : منداڵی بچووك ناکوژین و ئافرەتان و بەتەمەنەکان و خواناسەکان و نەخۆشەکانیش ناکوژین، ئیللا مەگەر ئەوانیش دەجەنگان یان هانی خەڵکیان دەدا بۆ جەنگ و کوشتار، یان را و بۆچوونیان هەبێت لە جەنگەکەدا و ڕۆڵیان هەبوو .
- (عدوك) : وروژاندن بۆ کوشتاریان، وە کەسی دوژمن شەرمەزارت دەکات و لێت دوور دەکەوێتەوە و تەعەدات لێ دەکات .
- (الغنيمة) : ئەو ماڵ و سامانەیە کە بە کوشتار لە کافران وەردەگیرێت، یان ئەوەی وەکو ئەو بێت .
- (والفيء) : ئەوەی بۆ (بیت المال) صەرف دەکرێت، وەکو پێنجیەکی پێنجیەکی دەستکەوت و باج و سەرانە .
- (إلا أن يجاهدوا) : ئەگەر هاتوو موسڵمان بوون و جیهادیان کرد ئەوا ئەوەی بۆ موسڵمانان هەیە لە غەنیمە و دەستکەوت بۆ ئەوانیش هەیە .
- ( الجزية ) : ئەو پارەیەیە کە لە لایەن غەیرە موسڵمانەوە دەدرێت لە بری پاراستنی و مانەوەی لە وڵاتی موسڵمانانندا، وە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەوا دروستە لە جگە لە جولەکە و گاور و مەجوس سەرانە وەربگیرێت .

## ئەوەی ئەنجامی دەدەین لە گەڵ ( موعاهیدەکاندا )

دەبێت پەیمانەکە بەسەر ببەین ئەگەر ئەوان بەردەوام بوون لەسەر پەیمانەکەیان : ﴿ فَمَا ٱسۡتَقَٰمُواْ لَكُمۡ فَٱسۡتَقِيمُواْ لَهُمۡ ﴾.

ئەگەر پەیمانەکەیان شکاند ئەوا پەیمانەکە پووچەڵ دەبێتەوە و کوشتاریان دروستە : ﴿ وَإِن نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ ﴾

ئەگەر دوودڵ بووین لە پەیمانەکە ئەوا پەیمانەکەیان بۆ دەگێڕینەوە : ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ ﴾

| ئەوەی موسڵمانان دەیکەن لە جیهادی بێباوەڕاندا | ئەوەی بێباوەڕان دەیکەن لە کاتی کوشتاری موسڵماناندا . |
| --- | --- |
| حەرامبوونی کوشتنی منداڵ و ئافرەتان و خواناسان و نەخۆشەکان . | کوشتنی منداڵ و ئافرەتان و خواناسان و نەخۆشەکان . |
| کوشتاریان لەبەر بەرژەوەندی خۆیانە (لە ئاگر رزگار دەکرێن) | کوشتاریان لەبەر دونیایە |
| پەیمانەکان لە گەڵیاندا دەبەنە سەر . | زۆر جار پەیمانەکان نابەنە سەر . |
| ئەگەر بێباوەڕان پەیمانەکەیان شکاند ئەوا ئاگادار دەکرێنەوە لە کۆتایی هێنانی پەیمانەکە . | ئەگەر لە موسڵمانانەوە شتێك روو بدات ئەوا ئاگاداریان ناکەنەوە |
| پەیمانشکێن نین. | پەیمانشکێنن |
| جەستەی کوژراوەکانیان ناشێوێنن ئیللا مەگەر ئەوان بیشێوێنن . | جەستەی کوژراوەکان دەشێوێنن بە بێ ئەوەی جەستەی کوژراوەکانیان شێوێندرابێت |

| | |
|---|---|
| کوشتاریان لە گەڵ ناکەن تاوەکو لە نێوان ئیسلام بوون و سەرانە و کوشتاردا سەرپشکیان نەکەن . | ئەصڵەن بانگەوازیان نییە |
| لە حوکمەکەیاندا دادپەروەر دەبن و ستەم ناکەن . | حوکمەکانیان لەسەر ستەم بنیات نراوە |
| ژمارەی کوژراوەکان لە کاتی رەوانەکردنی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) تاوەکو کۆچی دوایی کرد هەزار کەسی تێنەپەڕاند لە هەموو غەزاکانیدا . | |
| هەرگیز منداڵ یان ئافرەت یان بە تەمەنی نەکوشتووە . | |

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** جیاوازی لە نێوان زیمەتی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) و زیمەتی موسڵمانان .

**دووەم :** ڕێنمویی کردن بۆ هەڵبژاردنی یەکێك لەو دوو کارە کە کەمترین ترسی هەیە.

**سێیەم :** مەبەست لە : **(اغزوا باسم الله في سبيل الله)** (واجیب بوونی غەزاکردن لە گەڵ پشت بەستن بە خوای گەورە و ئیخلاص و ڕۆیشتن لەسەر بەرنامەکەی).

**چوارەم :** مەبەست لە : **(قاتلوا من كفر بالله)** وە هۆکاری کوشتار لە گەڵیاندا کوفرەکەیانە .

**پێنجەم :** مەبەست لە : **( استعن بالله وقاتلهم)** ( مرۆڤ نابێت پشت بە توانای هێزی خۆی ببەستێت).

**شەشەم :** جیاوازی نێوان حوکمی خوا و حوکمی زانایان .

**حەوتەم :** جاری وا هەیە یەکێك لە هاوەڵان لە کاتی پێویستیدا حوکمێك دەکات، کەچی نازانێت لە گەڵ حوکمی خوادا کۆکە یان نا؟ (ئەمەش تایبەت نییە بە هاوەڵانەوە بەڵکو تەنانەت ئەوانەی لە پاش ئەوان دێن دەیگرێتەوە).

## ٦٤/بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی سوێند خواردن لەسەر خوای گەورە هاتوون (التألي على الله)

هەرکەسێك سوێندی لەسەر خوا خوارد ((سوێند دەخوات کە خوای گەورە ئەوە دەکات یان ئەوە ناکات ئەمەش پێی دەڵێن : التألي)) بێگومان ئەمە بێ ئەدەبییە بەرانبەر بە خوای گەورە و ڕێگەگرتنە لە فەزڵی خوای گەورە و گومان خراپ بردنە پێی، وە هەموو ئەوانە لە گەڵ کەمالی تەوحیددا یەك ناگرێتەوە، وە ڕەنگە جاری وا هەبێت لە گەڵ ئەصڵی تەوحیددا یەك نەگرێتەوە، جا (التألي) بەرانبەر کەسێکی مەزن کەموکورتییە.

### بەشەکانی سوێند خواردن لەسەر خوا

**دروستە :** بەوەی سوێند بخوات لەسەر ئەوەی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هەواڵیان داوە لە نەفی و سەلماندندا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دڵنیایی و یەقینی کەسەکە، (سوێند بە خوا گەورە، خوای گەورە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەکاتە شەفاعەتکار لە ڕۆژی قیامەتدا)

**دروستە :** سوێند بخوات لەسەر خواکەی بە هۆی هێز و زوری تکا و ڕەجاکەی و گومانی باش بردن بە خواکەی و یەقینەکەی، بە مەرجێك خۆی کرداری باشی هەبێت، هەروەکو لە چیرۆکەکەی (أنس بن النضر)دا هاتووە .

**حەرامە و نزیکە لەوەی کردارەکانی پووچەڵ بکاتەوە:** پاڵنەرەکەی سەرسام بوون بێت بە خۆی، وە ڕێگری کردن بێت لە فەزڵی خوا و گومان خراپ بردنە بە خوای گەورە .

## بەڵگەی یەکەم و دووەم :

١. لە ( جندب بن عبدالله ) هاتوە– ڕەزای خوای لێ بێت– فەرمویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی : (قال رجل : والله لا يغفر الله لفلان، فقال الله : من ذا الذي يتألى عليَّ أن لا أغفر لفلان ؟! إني قد غفرت له، و أحبطت عملك )رواه مسلم .

واتە : پیاوێك وتی : سوێند بە خوا، خوای گەورە لە فلاَن کەس خۆش نابێت، خوای گەورە فەرمووی : ئەوە کێیە سوێند لەسەر من دەخوات کەوا لە فلاَن خۆش نابم ؟ ئەوا من لە ئەو خۆش بووم و کردارەکانی تۆم پووچەلّ کردەوە).

٢. وفي حديث أبي هريرة : أنَّ القائل رجلٌ عابد، قال أبو هريرة : تكلَّمَ بكلمة أوبقت دنياه وآخرته واتە : وە لە فەرموودەکەی (ئەبو هورەیرە)دا هاتووە: ئەوەی ئەو قسەیەی گوت کەسێکی خواناس (عابد) بوو، (ئەبو هورەیرە) دەفەرموێت: تەنها وشەیەکی وت، دونیا و قیامەتی خۆی بە هەلاکەتدا برد).

- (لا يغفر الله لفلان) : بەڵگەیە لەسەر بێ ئومێدی لە ڕەحمەتی خوای گەورە و بە کەم زانینی عەبدەکانی خوایە و سەرسام بوونە بە خۆی .
- ( يتألى عليَّ) : ڕێگر دەبێت لە فەزڵ و نیعمەتی من، بەوەی من لەو عەبدانەم خۆش نابم کە هەڵەیان کردووە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** ئاگاداربوون لە (التألي) لەسەر خوای گەورە .

**دووەم :** ئاگر نزیکترە لە قەیتانی پێڵاوی هەریەکێکمانەوە (لە پەتی نەعلەکانمان).

**سێیەم :** بەهەشتیش هەروەکو ئەوەیە .

**چوارەم :** شاهیدێکی تێدایە لە فەرموودەکەدا : (إنَّ الرجلَ ليتكلمُ بالكلمة...) تا کۆتایی .

**پێنجەم :** رەنگە خوای گەورە لە کەسێك خۆش بێت بە هۆی کارێکەوە کە لە هەموو شتێك زیاتر لای ناخۆشترە .

## ٦٥ / بەشی : خوای گەورە ناکرێتە شەفاعەتکار بەسەر خەڵکییەوە ( لەبەر کەمالی گەورەیی و مەزنی )

خواکردنە شەفاعەتکار بەسەر خەڵکییەوە کەموکورتییە بۆ خوای گەورە، چونکە پلە و پایەی خوای گەورەی لە پلەو پایەی ئەوەی شەفاعەتی بۆ دەکرێت کەمتر داناوە .

## بەڵگەی یەکەم :

لە (جبير بن مطعم)ەوە ریوایەت کراوە کەوا فەرموویەتی : ((جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ(ﷺ)، نُهِكَتِ الأَنْفُسُ، وَجَاعَ الْعِيَالُ، وَهَلَكَتِ الأَمْوَالُ، فَاسْتَسْقِ لَنَا رَبَّكَ، فَإِنَّا نَسْتَشْفِعُ بِاللَّهِ عَلَيْكَ، وبِكَ عَلَى اللَّهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : سُبْحَانَ اللَّهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ ! فَمَا زَالَ يُسَبِّحُ حَتَّى عُرِفَ ذَلِكَ فِي وُجُوهِ أَصْحَابِهِ، ثُمَّ قَالَ: (( وَيْحَكَ، أَتَدْرِي مَا اللَّهُ؟ إِنَّ شَأْنَ اللهِ أَعْظَمُ مِنْ ذَاكَ، إِنَّهُ لا يُسْتَشْفَعُ بِهِ عَلَى أَحَدٍ، ....))تا کۆتایی فەرموودەکە) رواه أبو داود.

واتە : کابرایەکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، خەڵکی لە ناوچوون، وە منداڵەکان برسی بوون، ماڵ و سامانەکان لەناوچوون، بۆیە داوات لێ دەکەیت داوای بارانمان بۆ بکەیت لە خواکەت، ئێمە خوای گەورە دەکەینە شەفاعەتکار لای تۆ و تۆ لای خوای گەورە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (سبحان الله ! سبحان الله!) بەردەوام تسبیحاتی دەکرد تاوەکو ئەوەیان لە دەم و چاوی هاوەڵەکانیدا بەدی کرد، ئەمجار فەرمووی : تیابچیت، ئەزانی خوا چییە ؟ دڵنیابە کە شەئن و پایەی خوای گەورە زۆر لەوە مەزنترە و ناکرێتە شەفاعەتکار لای هیچ کەسێك .......)

- **(نُهِكت) :** لاواز بوو، (وهلكت الأموال) : لەبەر کەمی باران و کەمی پیت و بەرەکەت.
- **(فاستسق) :** داوا لە خوا بکە بارانمان بۆ ببارێنێت، ئەمەش دروستە بۆ کەسێك تکای ئەوەی لێ بکرێت وەلامی دوعاکانی بدرێتەوە بە بێ زەلیلی نواندن.
- **(نستشفع بالله عليك) :** واتە خوای گەورە دەکەینە نێوەندێك لە نێوان ئێمە و تۆدا بۆ ئەوەی لای خوا دوعامان بۆ بکەیت، ئەمەش ئەوە لە خۆ دەگرێت کەوا پلە و پایەی خوای لە خوار پلەی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) داناوە، ئەمەش کارێکی ناڕەوا و مونکەرە .

**(سبحان الله ! سبحان الله!)** لەبەر گەورەیی ئەم قسەیەو ئینکاری کردن لێی، ئەویش بە پاکراگرتنی خوای گەورە .

- **(ويحك) :** بەزەییم پێتدا دێتەوە .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** ئینکاردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو کەسەی وتی : (خوا دەکەینە شەفاعەتکار لای تو)

**دووەم :** بە شێوەیەك گۆڕدرا بە دەموچاوی هاوەڵانیدا دیار بوو لەبەر ئەو وشەیە.

**سێیەم :** پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئینکاری لێی نەکرد لەوەی وتی : (تۆ دەکەینە شەفاعەتکار لای خوا)

**چوارەم :** ئاگادار کردنەوە لە تەفسیری (سبحان الله).

**پێنجەم :** موسڵمانان داوای ئەوەیان لێ دەکرد کە داوای باران بکات لە خوای گەورە لە کاتێکدا کە زیندوو بوو .

(بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەوا لە کاتی داواکردندا ئەو صیفاتانە هەڵبژێرێت کە مایەی بەزەیین)

## ٦٦/ بەشی ئەو بەڵگای هاتوون دەربارەی پاراستنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ قەڵای تەوحید و داخستنی هەموو ڕێگایەکی شیرك ( تەنانەت لە گفتارەکانیشدا )

### بەڵگەی یەکەم و دووەم :

١. لە فەرمودەیەکدا کە (عبدالله بن الشخیر) ڕیوایەتی کردووە دەفەرموێت : (انطلقتُ في وفد بني عامر الى النبي (ﷺ)، فقلنا : أنت سيدنا، فقال : السيد الله تبارك وتعالى، قلنا : وأفضلنا فضلا وأعظمنا طولا، فقال : قولوا بقولكم، أو: بعض قولكم، ولا يستجرينَّكم الشيطانُ ) رواه أبو داود بسند جيد . واته : لە گەڵ وەفدێکی بەنی عامردا چووین بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وتمان : تۆ گەورە و سەیدی ئێمەیت، ئەویش فەرمووی : سەیدی ڕاستەقینە تەنها خوایە، ئێمەش وتمان : تۆ لە هەمومان باشتریت بە فەزڵ و چاکە و لە

هەمومان مەزنتریت لە بەخشین و دەسەڵاتدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: قسەکانی خۆتان بکەن، یان : هەندێ لە قسەکانتان، وریابن شەیتان پەلکێشتان نەکات و بتانکاتە وەکیلی خۆی) .

٢. هەروەها لە (ئەنەس)ەوە هاتووە و فەرموویەتی : ( أن ناساً قالوا : يا رسول الله (ﷺ)، يا خيرنا وابن خيرنا وسيدنا وابن سيدنا، فقال (ﷺ) : يا أيها الناس، قولوا بقولكم، ولا يستهوينكم الشيطان، أنا مُحَمَّد (ﷺ)، عبد الله ورسوله، ما أحب أن ترفعوني فوق منزلتي الذي أنزلني الله عز و جل) رواه النسائي بسند جيد. واتە: (خەڵکانێك وتیان: ئەوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی چاکترینی ئێمەو کوڕی چاکترینی ئێمە و گەورەی ئێمەو کوڕی گەورەی ئێمە)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەی خەڵکینە ئەو قسەیەی خۆتان بکەن و وریابن شەیتان پەلکێشتان نەکات و بتانکاتە وەکیلی خۆی، من (محمد) م(ﷺ)، بەندەی خوا و نێردراوی ئەوم، پێم خۆش نییە لە پلەوپایەی خۆم کە خوای گەورە دایناوم بەرزترم بکەنەوە)

- (السَّيِّد الله) : (السَّيِّد) ناوێکە لە ناوەکانی خوا، ئەویش یەکێکە لە ماناکانی (الصمد)، نەهی لێکردن کە شەیتان پەلکێشیان بکات و لە گەورەیی تایبەتەوە (السيادة الخاصة) بەرزی بکەنەوە بۆ گەورەیی گشتی (السيادة العامة) کە ئەویش خوای گەورەیە .
- (ولا يستجرينكم) : پەلکێشتان نەکات قسەیەکی خراپ بکەن، جا ئەوەی پێویستە بکرێت ڕێنمویی کردن و ئەوەی پێویستە نەکرێت نەهی لێ کردن لەبەر پاراستنی تەوحید لە هەر کەموکورتی و دژ بە یەکێك .
- (يا خيرنا) : باشترینمانی لە نەسەب و پایە و حاڵدا، (وابن خيرنا) : لە نەسەبدا نەك لە پایەو حاڵدا .
- (ولا يستهوينكم) : شەیتان پەلکێشتان نەکات و ئەوتان خۆش بوێت و ڕێگاکانی بگرنەبەر تاکو دەگەنە زیادەڕەوی .

## مەسەلەکان :

**یەکەم :** ئاگادار کردنەوەی خەڵکی لە زیادەڕەوی .

**دووەم :** ئەوەی پێویستە بگوترێت کاتێ بە کەسێك دەگوترێت : تۆ گەورەی ئێمەیت (دەڵێت : خوا گەورەیە، بۆیە نابێت کەسانێکی فاسق و دووڕوو و بێباوەڕ بکرێنە گەورە ئیتر نێر بن یان مێ ).

**سێیەم :** مەبەست لە : (شەیتان پەلکێشتان نەکات)، هەرچەندە ئەوان هیچ شتێکیان نەگوت لە حەق زیاتر .

**چوارەم :** مەبەست لە : (پێم خۆش نییە لە پلەوپایەی خۆم کە خوای گەورە دایناوم بەرزترم بکەنەوە) ئەویش پایەی بەندایەتی و پێغەمبەرایەتییە .

## دەیەم : کۆتایی ( یەك بەشە )

**کتێبەکەی بەم بەشە تەواو کردووە چونکە – والله أعلم - :**

١. تاوەکو وەك موشریکەکان نەبین کە خوای گەورە بە مەزن نازانن .

٢. تاوەکو بە کردەوەکانی خۆمان لەخۆبایی نەبین، چونکە بەندە هەرچۆنێك بێت کردەوەکانی کەموکورتی تێدایە، بۆیە دەبێ بەندە زەلیلی بنوێنێت بۆ خوای گەورە و ملکەچی ئەو بێت .

٣. وەکو شوێنکەوتنی ئیمامی بوخاری کە کتێبەکەی بە فەرموودەی (ثقيلتان في الميزان) کۆتایی پێ هێناوە، هەروەکو ئەوەی داوا لە خوا بکات تەرازووەکەی قورس بکات بەم کتێبە هەروەکو چۆن ئەم دروستکراوانە قورسن، وە داوای لێخۆشبوون دەکات لە هەڵەکانی .

**٦٧/ بەشی ئەوەی دەربارەی ئەم ئایەتە هاتووە : ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾**

- راناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ موشریکەکان کە خوای گەورەیان بە گەورە نەزانی وەکو حەقی خۆی چونکە دروستکراوەکانیان کرد بە شەریکی ئەو، لە کاتێکدا ئەو پاك و بێگەردە لە هەر کەموکورتییەك، وە پاك و بێگەردە لەهەر هاوتایەك، جا ئەگەر خوای گەورەیان بە گەورە بزانیبا بە حەقی خۆی، ئەوا جگە لە ئەویان نەدەپەرست و گوێڕایەڵی جگە لە ئەو نەدەبوون .

## بەڵگەی دووەم :

لە (ابن مسعود)ەوە ڕیوایەت کراوە و دەڵێت : (( جاء حبر من الأحبار إلى رسول الله(ﷺ) فقال : يا مُحَمَّد (ﷺ)، إنا نجدُ أن الله يجعل السموات على إصبع، والأرضين على إصبع، والشجر على إصبع، والماء على إصبع والثرى على إصبع، وسائر الخلق على إصبع، فيقول : أنا الملك، فضحك النبي (ﷺ) حتى بدت نواجذه، تصديقا لقول الحبر، ثم قرأ (ﷺ) : ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾

واتە : زانایەك لە زاناكانی جوولەكە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوتی : ئەی محمد(ﷺ)، ئێمە لە كتێبەكانی خۆماندا بینیومانە كە : خوای گەورە هەموو ئاسمانەكان لە سەر پەنجەیەكی دادەنا و زەوی لە سەر پەنجەیەك و دار و درەخت لە سەر پەنجەیەك و ئاو لە سەر پەنجەیەك و خاك لە سەر پەنجەیەك و هەموو دروستكراوەكانی تر لە سەر پەنجەیەك، جا دەڵێت : من پادشام، بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێكەنی تاوەكو ددانەكانی دەركەوت وەكو پشتگیری كردن و ڕاستكرنەوەی قسەی ئەو زانایە، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو ئایەتەی خوێندەوە كە دەفەرموێت : ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾

وە لە ڕیوایەتەكەی (موسلیم)دا هاتووە : (( والجبال والشجر على إصبع، ثم يهزُهُنَّ فيقول : أنا الملك، أنا الله )) واتە : وە چیاكان و دارو درەخت لە سەر پەنجەیەك، ئەمجار دەیەلەرێنێتەوە و دەڵێت : من پادشام، من خوام )) .

وە لە ڕیوایەتەكەی (بوخاری)دا هاتووە : ((يجعل السموات على إصبع والماء والثرى على إصبع وسائر الخلق على إصبع )) أخرجاه واتە : ئاسمانەكان دەخاتە سەر پەنجەیەك و ئاو و خاك لەسەر پەنجەیەك و هەموو دروستكراوەكان لەسەر پەنجەیەك ))

- (حِبر) : ئەو زانایەیە کە زانستەکەی زۆر و فراوانە، وە پێیشی دەڵێن : (بحر).
- (إنا نجد) : واتە لە تەوراتدا .

بەڵگەی سەلماندنی پەنجەی تێدایە بۆ خوای گەورە، پەنجەی حەقیقی و ڕاستەقینە کە لایەقی خوای گەورە بێت، هەروەکو چۆن دەستی ڕاستەقینە و حەقیقی هەیە لایەقی خۆی بێت.

## بەڵگەی سێیەم تا پێنجەم :

٣/ لە (موسلیم)دا هاتووە لە (ابن عمر)ەوە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ): ((يطوي اللَّهُ السموات يوم القيامة، ثم يأخذهنَّ بيده اليمنى، ثُمَّ يَقُولُ : أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ ؟)) ثم يطوي الأرضين السبع، ثم يأخذهنَّ بشماله، ثُمَّ يَقُولُ : أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ ؟) واتە : خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەکان لوول دەکات و دەیپێچێتەوە، ئەمجار بە دەستی ڕاستی دەیگرێت، ئەمجار دەڵێت : منم پادشا، دەسەڵاتدارە بە زەبرەکان لە کوێن ؟ خۆ بەزلزانەکان لە کوێن ؟ ئەمجار زەوی لوول دەکات و دەیپێچێتەوە و بە دەستەکەی تری دەیگرێت و دەفەرموێت : منم پادشا، دەسەڵاتدارە بە زەبرەکان لە کوێن ؟ خۆ بەزلزانەکان لە کوێن ؟ )) .

وە لە (ابن عباس)ەوە ڕیوایەت کراوە و دەفەرموێت : (ما السماوات السبع، والأرضون السبع في كف الرحمن إلا كخردلة في يد أحدكم )) واتە : هەر حەوت ئاسمانەکان و هەر حەوت زەوییەکە لە لەپی خوای گەورەدا تەنها وەکو دەنکە گەردیلەی تۆمێکی بچووکە لە دەستی یەکێکتاندا).

٥/ وقال ابن جرير : حدثني يونس أنبأنا ابن وهب قال : قال ابن زيد : حدثني أبي قال : قال رسول الله (ﷺ): « ما السماوات السبع في الكرسي، إلا كدراهم سبعة أُلقيتْ في تُرسٍ » وقال : قال أبو ذر : سمعت رسول الله (ﷺ) يقول : « ما

الكرسيُّ في العرش إلا كحلقة من حديد، أُلقيتْ بين ظهري فلاة من الأرض ))
واتە : هەر حەوت ئاسمانەکان لە چاو کورسیدا تەنها وەکو حەوت دەرهەمە فرێدرابێتە ناو قەڵغانێکەوە ) وە فەرمووی : (أبو ذر) فەرموویەتی : گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : کورسی لە چاو عەرشدا تەنها وەکو ئەڵقەیەکە لە ئاسن فرێدرابێتە بیابانێکەوە لەو دەشتەدا).
(أنا الملك) : من خاوەنی دەسەڵاتێکی رەها و سوڵتانێکی تەواوم هیچ کەسێك تێیدا بەربەرەکانێم لە گەڵدا ناکات .

- (اين الجبارون) : پرسیارەکە بۆ تەحەدایە، واتە : کوان ئەو پادشایانەی کە لە دونیادا دەسەڵات و فیز زل و لە خۆبایی و خۆیان بە گەورەتر دەزانی لە عەبدەکانم ؟ جا ئەوان لەو رۆژەدا هەروەکو گەردیلەیەك حەشر دەکرێت و خەڵکی پایان پێدا دەنێن .
- (بشماله) : ئەم زیادەیە (شاذ)ە، وە ئەگەر وا دانرا کە (محفوظ) بێت ئەوا بە مانای دەستەکەی تری دێت و هیچ جیاواز نییە لە گەڵ ئەو فەرموودەدا کە دەڵێت : (كلتا يديه يمين) واتە : هەردوو دەستەکەی راستن)، هەروەها وەکو چەپی دروستکراوەکان نییە کە لە راست کەمترە .
- (کخردلة) : تۆوێکی زۆر بچوکی رووکێکە، ئەمەش بەڵگەی مەزنی و گەورەیی خوایە، وە هیچ زانیارییەکیان نییە دەربارەی خوای گەورە .
- (الكرسي) : جێگای هەردوو پێی خوای گەورەیە، (تُرس) : قەڵغان : شتێکە لە پێست یان لە دار دروست دەکرێت لە کاتی جەنگدا هەڵدەگیرێت و لە شمشێر و رم و نمونەی ئەوانە خۆیانی پێ دەپارێزن .
- (العرش) : ئەو دروستکراوە مەزنەیە کە خوای گەورە لەسەری ئیستوای کردووە، وە هیچ کەسێك ئەندازە و گەورەیی نازانێت تەنها خوای گەورە نەبێت.
- فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر مەزنی خوای گەورە کەواتە شیاوە بۆ تەفسیری ئایەتی ناونیشانی بەشەکە .

## بەڵگەی شەشەم و حەوتەم :

٦. لە (ئیبن مەسعود)ەوە ریوایەت کراوە و فەرموویەتی : (بَيْنَ السَّمَاءِ الدُّنْيَا وَالَّتِي تَلِيهَا خَمْسِمِائَةِ عَامٍ، وَ بَيْنَ كُلِّ سَمَاءٍ خَمْسِمِائَةِ عَامٍ، وَ بَيْنَ السَّمَاءِ السَّابِعَةِ وَالْكُرْسِيِّ خَمْسِمائَةِ عَامٍ، وَ بَيْنَ الْكُرْسِيِّ وَالْمَاءِ خَمْسِمائَةِ عَامٍ، وَالْعَرْشُ عَلَى الْمَاءِ، وَاللَّهُ فوق الْعَرْشِ، لا يخفى عليه شيء من أعمالكم )) أخرجه ابن مهدي ورواه بنحوه المسعودي، قاله الحافظ الذهبي، قال : وله طرق) واتە : لە نێوان ئاسمانی دونیا و ئەوەی سەرەوەیدا پێنج سەد ساڵە، وە لە نێوان هەر ئاسمانێکدا پێنج سەد ساڵە، وە لە نێوان ئاسمانی حەوتەم و کورسیدا پێنج سەد ساڵە، وە لە نێوان کورسی و ئاودا پێنج سەد ساڵە، وە عەرشیش لە سەرەوەی ئاوە، وە خوای گەورەش لە سەرەوەی عەرشە، هیچ شتێك لە کردەوەکانی ئێوەی لا شاراوە نییە)) .

٧. لە (العباس بن عبدالمطلب)ەوە ریوایەت کراوە و فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((هَلْ تَدْرُونَ كَمْ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ ؟ قلنا : الله ورسوله (ﷺ)أعلم، قال : (( بَيْنَهُمَا مَسِيرَةُ خَمْسِمِائَةِ سَنَةٍ، وَبين كُلِّ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ مَسِيرَةُ خَمْسِمِائَةِ سَنَةٍ، وَكِثَفُ كُلِّ سَمَاءٍ مسيرة خَمْسُمِائَةِ سَنَةٍ، وَبين السَّمَاءِ السَّابِعَةِ والعرش بَحْرٌ بَيْنَ أَسْفَلِهُ وأَعْلاَهُ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، وَاللهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى فَوْقَ ذلِكَ، وَلَيْسَ يَخْفَى عَلَيْهِ شيءٌ مِنْ أَعْمَالِ بَنِي آدَمَ) أخرجه أبو داود وغيره )

واتە : ئایە دەزانن لە نێوان ئاسمان و زەویدا چەندە ؟ وتمان : خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) زاناترن، فەرمووی : لە نێوانیاندا ماوەی پێنج سەد ساڵە، وە نێوان هەر ئاسمانێك بۆ ئاسمانەکەی تر ماوەی پێنج سەد ساڵە، وە ئەستوری هەر ئاسمانێك ماوەی پێنج سەد ساڵە، وە لە نێوان ئاسمانی حەوتەم و عەرشدا دەریایەکە نێوان خوارەوەی تا سەرەوەی بە ئەندازی نێوان ئاسمان و زەوییە، وە خوای گەورەش لە سەرووی ئەوەوەیە، وە هیچ شتێکی لە کردەوەی بەنی ئادەم لێ ناشاردرێتەوە)).

- (والله فوق العرش) : دەقێکی روون و ئاشکرایە کەوا بەرزی بۆ خوای گەورە دەسەلمێنێ لە زات و صیفاتیدا .
- (لا يخفى عليه شيء من أعمالكم) : کرداری دڵ و ئەندامەکان، ئەوانەی دەبینرێن و ئەوانەی دەبیسرێن، ئەوەش لەبەر گشتگیری و فراوانی عیلم و زانستی خوایە، وە باسی ئەوەی کرد لە پاش ئەوەی باسی بەرزی خوای گەورەی کرد، بۆ ئەوەی روونی بکاتەوە کەوا بەرزی خوای گەورە رێگر نییە لە ئاگاداربوونی بە کردەوەکانمان، ئەمەش ئاماژەیەکی روونە بۆ بەرزی زاتی خوای گەورە .
- **( هل ) : ئەم پرسیارکردنە مەبەستی دوو شتە :**

١. بۆ تامەزرۆبوونی ئەوەی باسی دەکات .

٢. بۆ وریاکردنەوەی ئەوەی باسی دەکات .

- (الله ورسوله (ﷺ) أعلم) : ئەم رستەیە دەگوترێت لە کاتی : ١/ ژیانیدا ٢/ لەو مەسەلە شەرعییانە کە خوای گەورە فێری کردووە .

بەڵگەی بە مەزن زانینی خوای گەورەی تێدایە و وریابوون لە جیاوازی کردنی فەرمانەکانی، چونکە ئەو لە سەرەوەی ئێمەوەیە، زانست و فەرمانەکانی دەورەی ئێمەی داوە .

## مەسەلەكان :

**یەكەم :** تەفسیری ئەو ئایەتە كە دەفەرموێت : ﴿وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾

**دووەم :** ئەم زانست و زانیارییە و نمونەی ئەمانە لای جولەكەكانی سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێشتا مابوونەوە و ئینكاریان لێ نەدەكرد و تەئویلیان نەدەكرد ( وەكو ئەوەی دەیەوێ بلێت : جولەكەكان باشترن لەو كەسانەی لێی لادەدەن، چونكە ئەوان بە درۆیان نەخستەوە و تەئویلیان نەكرد).

**سێیەم :** كاتێ زاناكە باسی كرد بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش پشت راستی كردەوە و خوای گەورەش ئایەتی دابەزاند بۆ پشت راستكردنەوەی .

**چوارەم :** پێكەنینێكی زۆر لە لایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كاتێ باسی ئەم زانستە گەورەی بۆ كرا .

**پێنجەم :** باسی دوو دەست بە راشكاوی، وە ئاسمانەكان لە دەستی راستیدان، وە زەوی لە دەستەكەی تریدان (لە قورئان و سوننەت و ئیجماعی سەلەفدا دوو دەست بۆ خوای گەورە سەلمێنراوە).

**شەشەم :** ناونانی بە چەپ (ریوایەتێكی شاذة )

**حەوتەم :** باسی دەسەڵاتدارە بە زەبرەكان و خۆ بەزلزانەكان لەو كاتەدا.

**هەشتەم :** باسی فەرموودەی : (وەكو دەنكە گەردیلەی تۆوێكە لە لەپی یەكێكتاندا)

**نۆیەم :** مەزنی و گەورەیی كورسی لە چاو ئاسمانەكاندا (وەكو حەوت دەرهەمە فرێدرابێتە ناو قەڵغانێكەوە).

**دەیەم :** مەزنی و گەورەیی عەرش لە چاو كورسیدا ( وەكو ئەڵقەیەكە لە بیابانێكدا فرێدرابێت)

**یازدەیەم :** دڵنیابوون لەوەی عەرش کورسی نییە .

**دوازدەیەم :** نێوان هەر ئاسمانێك و ئاسمانەکەی تر چەندە؟ ( پێنج سەد ساڵە)

**سیازدەیەم :** نێوان ئاسمانی حەوتەم و کورسی چەندە ؟ ( پێنج سەد ساڵە)

**چواردەیەم :** لە نێوان کورسی و ئاودا چەندە ؟ ( پێنج سەد ساڵە)

**پازدەیەم :** عەرش لە سەرەوەی ئاوە .

**شازدەیەم :** لە نێوان ئاسمان و زەوی چەندە؟ ( پێنج سەد ساڵە)

**حەڤدەیەم :** ئەستوری هەر ئاسمانێك پێنج سەد ساڵە.

**هەژدەیەم :** ئەو دەریایەی لە سەرەوەی ئاسمانەکانە لە نێوان خوارەوە و سەرەوەی نێوان پێنج سەد ساڵە، خوای گەورە زاناترە .

**سوود بە دەست هاتووەکانی فەرموودەکانی بەشەکە :**

١. ئاگاداربوون لە جیاوازی کردن لە گەڵ فەرمانەکانی خوای گەورەدا .

٢. خوای گەورە هیچ شتێکی لە کردەوەکانی بەنی ئادەمی لا شاراوە نییە .

والله أعلم والحمد لله رب العالمين، وصلى الله وسلم على نبينا مُحَمَّد وأسأل الله أن يختم لنا ولكم بالتوحيد، أمين .

## تاقیکردنەوەی پاشماوەی بەشی نۆیەم و کۆتاییەکە ( ١٦ بەشە )

**پرسیاری یەکەم :** نیشانەی (×) لە جێگای شیاوادا دابنێ یان بۆشاییەکە پڕ بکەرەوە :

١. حوکمی وتنی (سڵاو لە خوا) : مەکروهە      حەرامە      دروستە

٢. (السلام) ناوێکە لە ناوەکانی خوا : (ئەرێنییە      سلبییە      هەمووی ) وە خوای گەورە : داوای لێ دەکرێت      داوای بۆ دەکرێت .

٣. داوای (سلام) ناکرێت بۆ هیچ شتێك ئیللا ئەگەر هاتوو دروست بێت وەصف بکرێت پێی :      **ڕاستە      هەڵەیە**

٤. حوکمی وتنی (خوایە لێم خۆشبە ئەگەر ویستت لە سەری هەیە) مەکروهە.      حەرامە      دروستە

٥. دروستە بەدەرهێنان (ئیستیسنا) بکرێت لە دوعادا : (ڕاستە      هەڵەیە) وە ئیستیسنا مەرجە :  **ڕاستە      هەڵەیە**

٦. مرۆڤ کە دوعای کرد، بۆی هەیە کە دوو دڵ بێت و دوعاکەی پەیوەست بکات بە شتێکەوە :      **ڕاستە      هەڵەیە**

٧. ئەگەر عەبدێك هەرچی هات بە خەیاڵیدا و داوای لە خوا کرد ئەوا هیچ ڕێگرێك نییە لای خوای گەورە بۆ وەڵامدانەوەی :      **ڕاستە      هەڵەیە**

٨. وتنی : ( خوایە من داوات لێدەکەم دەرگاوانی دەرگای بەهەشت بم )      دروستە      دروست نییە

٩. وتنی (خوایە من داوات لێ ناکەم قەزا بگێڕیتەوە بەڵام داوات لێ دەکەم بە سۆز و میهرەبان بە تێیدا )      دروستە      دروست نییە

١٠. داوای چی لە خوا دەکەیت ؟ بەهەشت      فیردەوسی ئەعلا لە بەهەشتدا

١١. دوعای (ئیستیخارە) پەیوەست کردنی دوعای :  تێدایە      تێدا نییە

١٢. حوکمی وتنی (عەبدی فلآن یان کەنیزەکی فلآن) چییە؟

دروستە          دروست نییە

١٣. حوکمی وتنی کەسی گەورە – سید– (ئەی عەبدەکەم ئەو شتە بهێنە) :

دروستە          دروست نییە

١٤. نەهی کردن لە وتنی : (فتاي و فتاتي) بۆ جێ بەجێکردنی تەوحیدە تەنانەت لە گفتارەکانیشدایە :          راستە     هەڵەیە

١٥. داواکردن حەرامە یان مەکروهە ئیللا بۆ پێویست یان زەرورەت نەبێت :

راستە     هەڵەیە

١٦. هەرکەسێك بە ناوی خوا داوای پارەی لێت کرد بۆ ئەوەی شتێکی حەرام بکڕێت وەکو عارەق(مەی) :  پێی دەدەیت          پێی نادەیت

١٧. حوکمی وەڵامی ئەو کەسەی بە ناوی خواوە داوا دەکات :

موستەحەببە          واجیبە

١٨. لە فەرموودەی : (هەرکەسێك داوای لێتان کرد پێی بدەن) مەبەست لە داواکردن : ڕێزلێگرتنە          بانگەوازە

١٩. وەڵامدانەوەی دەعوەتی : واجیبە بە ڕەهایی

موستەحەببە ئیللا دەعەوەتی هاوسەرگیری نەبێت ئەوە واجیبە

٢٠. هەرکەسێك داوای دالدەی کرد لە شتێکی واجیبدا بە ئەنجامدانی یان وازلێهێنانی ئەوا :          دالدە دەدرێت          دالدە نادرێت

٢١. فەرموودەی (هێندە دوعای بۆ بکەن تاوەکو وا دەبینن پاداشتان داوەتەوە) واتە :

یەك دوعا          کەمتەرخەمی لە دوعادا مەکەن

٢٢/ فەرموودەی (بە روخساری خواوە داوای هیچ شتێك ناكرێت ئیللا بەهەشت نەبێت ) واتە: داوا لە هیچ كەسێك مەكە لە دروستكراوەكان بە روخساری خوا داوا لە خوا مەكە بە روخساری خۆی ئیللا بەهەشت نەبێت هەمووی

٢٣/ صیفەتی روو (وجە) بۆ خوای گەورە سەلمێنراوە بە :

قورئان سوننەت ئیجماع هەمووی

٢٤/ وتنی : (خودایە من داوات لێدەكەم لەبەر خاتری رووی خۆت یارمەتیم بدەیت بۆ لەبەر كردنی قورئان) (**راستە هەڵەیە**) وە حوكمی وتنی : (خودایە من داوات لێ دەكەم لەبەر خاتری رووی خۆت دالّدەم بدەیت لە ئاگر) :

دروستە حەرامە

٢٥/ وتنی : (خوایە داوات لێ دەكەم لەبەر خاتری رووی خۆت ناوماڵەیەكی جوانم بە قسمەت بكەیت) دروستە حەرامە

٢٦/ حوكمی وتنی : (ئەگەر گوێڕایەڵی منت بكردایە و سەفەرت نەكردایە ئەوا تووشی ئەو رووداوە نەدەهاتیت) دروستە حەرامە

٢٧/ حوكمی وتنی : (ئەگەر سەفەرم نەكردایە قازانجەكەم لە دەست دەرنەدەچوو):

دروستە حەرامە

٢٨/ حوكمی وتنی : (ئەگەر ویستی خوا نەبوایە درۆم نەدەكرد) : دروستە حەرامە

٢٩/ حوكمی وتنی : (ئەگەر وەكو سامانەكەی فلان كەسم بوایە ئەوا صەدەقەم پێی دەكرد) : دروستە موستەحەببە حەرامە

٣٠/ حوكمی وتنی : (ئەگەر ئامادەی دەرسەكە بوایەم سوودم وەردەگرد) :

دروستە حەرامە

٣١/ (دروستە دروست نییە) كەسی ژیر هەوڵ و تێكۆشانەكەی لە شتێكی بێ سووددا بەسەر بەرێت.

٣٢/ ئەوەی توانای مرۆڤی لەسەر نەبێت (بۆی هەیە      بۆی نییە) قەدەر بکاتە حوججە و بەڵگە.

٣٣/ دروستە قەدەر بکرێتە حوججە لەسەر :

موصیبەتەکان نەك هەڵەکان            پێچەوانەکەی

٣٤/ جوێندان بە (با) : (حەرامە      مەکروهە)، وە حوکمی وتنی : بایەکی باراناوی بەڕێوەیە :                                  (دروستە      حەرامە)

٣٥/ وتنی : (خوای گەورە منی خۆش دەوێت) بۆ کەسێك نیعمەتێکی بەسەردا رژا بێت :                                  (راستە      هەڵەیە)

٣٦/ کەسێکی فاسقی دەوڵەمەندی بینی و وتی ئەمە شایەنی ئەم سامانە نییە :

دروستە      حەرامە

٣٧/ ئەگەر کەسێك کەمتەرخەم بێت لە واجیباتەکانیدا و حەرامکراوەکانی ئەنجام دابێت و گومانی باشی بە خوا بردبێت ئەمە :

گومان باش بردنە بە خوا            گومان خراپ بردنە بە خوا

٣٨/ هەندێ کەس گومانی ئەوە دەبات ئەگەر داوا لە خوا بکات بە شێوەیەکی شەرعی ئەوا خوای گەورە وەڵامی ناداتەوە، ئەمە :

گومان باش بردنە بە خوا            گومان خراپ بردنە بە خوا

٣٩/ وتنی : (خوای گەورە بۆی هەیە عەزابی کەسی گوێڕایەڵ بداتەوە و پاداشتی کەسی سەرپێچیکار بداتەوە) ئەمە :

گومان باش بردنە بە خوا            گومان خراپ بردنە بە خوا

٤٠/ وتنی : (من لە فلان کەس شایستەترم بەو پۆستە) ئەمە :

گومان باش بردنە بە خوا            گومان خراپ بردنە بە خوا

٤١/ به نەخۆش دەڵێت : (چەند گوناهه !) و (شایستەی ئەوە نەبویت) و (ئەگەر به دەستی من بوایه ئەوە رووی نەدەدا) ئەمە :

گومان باش بردنه به خوا گومان خراپ بردنه به خوا

٤٢/ حوکمی وتنی : ئەگەر به دەستی من بوایه ئەوا فلان کەسم دەکردە موفتی :

دروسته حەرامه

٤٣/ وتنی : (رێگای سەلامەتی) ئەمە :

گومان باش بردنه به خوا گومان خراپ بردنه به خوا

٤٤/ وتنی : (پێویسته توشی نەخۆشییەکان نەبین و رزقمان فراوان بێت ) ئەمە :

گومان باش بردنه به خوا گومان خراپ بردنه به خوا

٤٥/ پێویسته مرۆڤ گومانی ( باش خراپ) به خۆی ببات.

٤٦/ پێویسته گومانی خراپ به خۆت ببەیت تاوەکو له خۆت دەرنەچیت و له خۆ بایی نەبیت : راسته هەڵەیه

٤٧/ نەفس جێگەی هەموو خراپەیەکه له رەزیلی و ستەم : راسته هەڵەیه

٤٨/ پلەکانی قەزا و قەدەر : چواره پێنجه سێیه

٤٩/ حوکمی ئەو کەسەی ئینکاری له قەزا و قەدەر دەکات :

له ئیسلام پێی دەردەچێت له ئیسلام پێی دەرناچێت

٥٠/ وتنی : (له ناخمدا شتێك دەربارەی قەدەر هەیه) واته :

گومان و شڵژان (اضطراب) ئینکاری و نکۆڵی

٥١/ (له ناخمدا شتێك دەربارەی قەدەر هەیه) واته : ......................

ئایه بەمه کافر دەبێت ؟.........................................

٥٢/ قەڵەم : یەکەم دروستکراوەکانه به رەهایی

یەکەم دروستکراوەکانه به نیسبەت ئەوانەی ئێمه دەیبینین

٥٣/ نەریتی سەلەف بۆ لادانی گومانەکان پرسیار کردن بووە لە :

زاناکان خواناسەکان

٥٤/ پرسیار کردن لەیەك زانا زیاتر دروستە ئەگەر مەبەستی :

جێگرکردنی بابەتەکە بێت گەڕان بە دوای روخصەتەکاندا هەمووی

٥٥/ گومانەکان نامێنێت و دەڕوێتەوە ئەگەر کارەکە بگێڕدرێتەوە بۆ لای :

خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) زاناکان

٥٦/ پێویستە وریابین لە بیستنی گومانەکان چونکە پەیوەست دەبێتە دڵەکانەوە :

راستە هەڵەیە

٥٧/ زۆربەی خەڵکی جیاوازی دەکەن لە گەڵ فەرمانەکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بە گوێگرتنیان بۆ گومانەکان و بڵاوکردنەوەی : راستە هەڵەیە

٥٨/ دروست نییە تەورات و ئینجیل بخوێنرێتەوە : راستە هەڵەیە

٥٩/ هێنانەوەی (بەشی ئەو بەڵگانەی دەربارەی وێنەگرەکان هاتووە) هەڵەی چاپە، چونکە ئەم باسە پەیوەندی بە باسی تەوحیدەوە نییە بەڵکو پەیوەندی بە باسی فیقهەوە هەیە : راستە هەڵەیە

٦٠/ سزای وێنەکێش لە (٥ ٤ ٣) بەش پێکهاتووە .

٦١/ وێنەکێشان بریتییە لە دروستکردن و داهێنان، بە هۆی ئەوەوە کەسی وێنە کێش بەشدارە لە گەڵ خوادا : راستە هەڵەیە

٦٢/ وێنەکێشان یەکێکە لە تاوانە گەورەکان چونکە :

خۆچواندنە بە بێباوەڕان زیادەڕەوییە هاوشێوەی دروستکراوەکانی خوایە

٦٣/ وێنەکێشانی دارو درەخت ودەریا و شاخ و روبارەکان : دروستە حەرامە

٦٤/ لەناودان و شێواندنی وێنە چۆن دەبێت ؟ رەنگکردنی بە رەنگێکی تر شێوەکەی تێك بدات لادانی سەری پەیکەرەکە

شێواندنی دەموچاوی هەموو ئەوانە هەریەکەو بە پێی خۆی

٦٥/ گۆڕی دیار چی شتێکی لەسەرە ؟

بەیداخ (علم)　　　خانوو (بناء)　　　ڕەنگەکان

لە گۆرەکانی تر جیاوازە بە بەردەکانی یان خاکەکەی　　　هەمووی

٦٦/ یەکسانکردنەوەی گۆڕ چۆن دەبێت ؟ وەکو لە سوننەتدا هاتووە وای لێ بکرێت

یەکسانکردنی وەکو ئەوانەی دەوروبەری　　　هەمووی

٦٧/ لەخۆگرتنی وێنە لەبەر بە مەزن دانانی وێنەکێشراوەکە

دروستە　　دروست نییە

٦٨/ ئەو کەسەی سوێند زۆر دەخوات ئەوا کەسێکە : خوای گەورەی بە مەزن زانیوە　　خوای گەورەی بە مەزن نەزانیوە

٦٩/ هەموو سوێندێك سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی هەیە : ڕاستە　　هەڵەیە

٧٠/ قەڵەوییەك بە دەست مرۆڤ خۆی نەبێت : زەمکراوە　　زەمکراو نییە

٧١/ تاوان بە گەورە دادەنرێت ئەگەر پاڵنەرەکەی کەمتر بێت : ڕاستە　　هەڵەیە

٧٢/ سوێند ئەگەر پێویستی کرد یان بەرژەوەندییەکە لەوەدا بوو : دروستە　　دروست نییە

٧٣/ لێدانی منداڵی بچووك : دروستە بەرەهایی　　دروستە بە چەند مەرجێك

٧٤/ پەیمانەکەی خوا لە گەڵ عەبدەکانیدا : بیپەرستن و شەریکی بۆ بریار نەدەن　　عەزابی ئەو کەسە نەدات کە شەریکی بۆ بریار نەداوە

٧٥/ سوپا ئەوەیە کە لە (٤٠٠ کەس　　هەزار کەس) زیاترە و سریەش پێچەوانەیەتی .

٧٦/ لە پێناوی خوادا :

نیەت تایبەتە　　کردارەکە تایبەتە　　نیەت و کرادار دەگرێتەوە

٧٧/ لە گەڵ بێباوەڕاندا دەجەنگین لەبەر بەرژەوەندی خۆیان ئەویش ڕزگارکردنیانە لە ئاگر :　　ڕاستە　　هەڵەیە

٧٨/ (الغلول) بریتییە لەوەی شتێك لە دەستکەوتی جەنگ بشارێتەوە و تایبەتی بکات بۆ خۆی (راستە هەڵەیە) وە حوکمەکەشی ( دروستە حەرامە یەکێکە لە تاوانە گەورەکان)

٧٩/ دروست نییە منداڵی بێباوەران و ئافرەتان و خواناسان و راهیبەکان بکوژین :

راستە هەڵەیە

٨٠/ شێواندنی جەستەی کوژراوەکان و پەیمان شکاندن و بردنی دەستکەوت پێش دابەش کردنی و کوشتنی منداڵان : دروستە دروست نییە

٨١/ سەرانە لە کێ وەردەگیرێت ؟

جولەکەو گاورەکان و مەجوس هەموو بێباوەڕان

٨٢/ حوکمی وتنی : (خوای گەورە تەوبەکەت قبوڵ ناکات) :

دروستە تاوانێکی گەورەیە

٨٣/ حوکمی وتنی : (سوێند بە خوا خوای گەورە لەو کەسانە خۆش نابێت شیرکیان بریار داوە) دروستە تاوانێکی گەورەیە

٨٤/ وریابوون لە هەڵەی زمان لە حوکمدان بەرانبەر بە کەسەکان :

حەڵاڵە دروستە واجیبە

٨٥/ نەهیکردن لە وتنی : (خوای گەورە لە فڵان کەسی زیندوو خۆش نابێت)

تایبەتە بە موسڵمانی سەرپێچیکارەوە موسڵمان و بێباوەڕ دەگرێتەوە

٨٦/ ئەوەی ئینکاری لێکراوە وتنی :

خوای گەورە دەکەینە شەفاعەتکار لای تۆ

تۆ دەکەینە شەفاعەتکار لای خوا .

٨٧/ (نستشفع بالله عليك) واتە : ......................................

٨٨/ بەشی ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی پاراستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (بەشێکی سەربەخۆیە دووبارەیە) ئەمەش پاراستنی پێغەمبەری خوای(ﷺ) تێدایە بۆ تەوحید لە

(کردارەکاندا گفتارەکاندا)

٨٩/ (السَّيِّد) : یەکێکە لە ناوەکانی خوا لە ناوەکانی خوا نییە

٩٠/ (السَّيِّد) یەکێکە لە ماناکی (الصمد) : راستە هەڵەیە

٩١/ (سیادة)ی تایبەت دروستە بە جیاواز لە گەڵ گشتیدا : راستە هەڵەیە

٩٢/ باشترین و چاکترین وەصف بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) :

بەندەی خوا و نێردراوی ئەوە محمدی کوڕی عبدالله(ﷺ)

٩٣/ جولەکە باشترن لەوانەی ئینکاری صیفاتەکانی خوا دەکەن و تەئویلی دەکەن لەم باسەدا و زاناترن بە خوای گەورە: راستە هەڵەیە

٩٤/ عەرش : ........................ کورسی :..............................

٩٥/ لە کۆتایی کتێبی تەوحیددا لەوە دەکات نوسەر داوای کردبێت لە خوای گەورە تەرازووەکەی قورس بکات هەروەکو چۆن ئاسمانەکان و عەرش و کورسی قورس کردووە (راستە هەڵەیە) وە ئاگاداری ئەوەی کردووەتەوە کەوا کەسی بێباوەڕ بە حەقی خۆی رێزیان لە خوا نەگرتووە، بۆیە تۆیش وەکو ئەو مەبە، بەڵکو بە مەزنی راگرە بە تەوحیدی خوای گەورە (راستە هەڵەیە)

٩٦/ زۆرێك لە سەلەف بە چەند ناوێك ناوی عەقیدەی راست و دروستیان ناوە لەوانە: سوننەت شەریعەت تەوحید فیقهە گەورەترەکە هەموو ئەوانەی باسکرا.

# پێرستی بابەتەکان